# لایەنەکانی پرۆسەی چارەسەرگەری

ئەریك فرۆم
لە ئینگلیزییەوە: عبدالله سیوەیلی

ئەم بابەتە چوارەم وانەی ئەریك فرۆمە کە لە پەیمانگای ولیەم ئالنسن وایت و لە ساڵی ١٩٥٩ پێشکەشی کردووە. هەتا ئەم دواییانە بە زمانی ئینگلیزی بڵاونەکراوەتەوە. لە هەندێ شوێندا نووسەر ستایلی نووسینی یان وانە ووتنەوەکەی دەچێتە هەڵەی زمانەوانی یان تەم و مژاوییەوە. لە هەندێ شوێندا ڕەنگە خوێنەر تەواو هەست بەو ناتەواوییانە بکات. —و—

**ئایا پلانی کردەیەکی شیکارەکی چییە؟ ئایا کەسێك هیچ پلانێکی هەیە لە پشت مەبەستی دەروونشیکارییەوە: واتە تێگەیشتن لە بەشە ناپەیوەندیدارەکەی نەخۆش و یارمەتیدانی بۆ تێگەیشتن لێی؟ من لەو باوەڕەدام کە کەسێك دەتوانێت تەنانەت بەم مانا گشتییەش لەمە زیاتر ئەنجام بدات: پەیڕەوکردنی بنەمایەکی ستراتیجی. کارێکی زۆر پێویستە کە کەسێك هەستێت بە بینینی نەخۆشەکە، کە پەیوەست بێت بە نەخۆشەکەوەو وەڵامی بداتەوە. کەسێك دەتوانێت درك بەوە بکات کە پێی هەڵدەستێت و چی لێدەکەوێتەوە. کەسێك ناتوانێت درك بەوە بکات کە پێی هەڵدەستێت و چی لێدەکەوێتەوە کەسێك ناتوانێت پلانێکی دوورودرێژ دابڕێژێت بەرلەوەی باز نەداتە ناو بارودۆخەکەوە — وە "بازدان" تەنها بریتی نییە لە گوێ گرتن و کەیف هاتن، بەڵکو بریتییە لەوەی کە پێشتر باسم کرد، واتە بینینی نەخۆشەکە، ئاشنا بوونی بە نەخۆشەکە، تێوەگلان لەگەڵ نەخۆشەکە.**

### پێکهێنانی ئایدیایەك کە بەدیهێنانی چ جۆرە کەسێك مەبەستە

جگە لەم ئایدیا زۆر گشتییە، ئەوا دەبێت بڵێین کە یەکەم شت کە کەسێك دەبێت بیکات بریتییە لە پێکهێنانی ئایدیایەك کە ئایا ئەم کەسە دەبێت چۆن بێت و ئایا عوصابەکەی چی لێکردووە و بەرەو کوێی بردووە. لێرەدا مەبەستم لەوە نیە کە ئەمە بەشێوەیەکی تایبەت بە مانا ئاینییەکەی بێت یان بە مانا مەبەستگەراییەکەی، بەڵکو مەبەستم لێی لەو

مانایەدایە کە لە راستیدا ئێمە وەك پەڕەی سپی لەدایك نەبووین، تەنانەت بەو جۆرەش نیە کە هەندێ لە ئێمە کە لەدایك دەبن (بێوەی)ن و هەندێکی تر دوژمنکارانەن. من لەو باوەڕەدام ئێمە بە کەسایەتیەکی زۆر سنووردار و ئاشکراوە لەدایك دەبین، کە بە هۆی ئەزموونەکانی ژیانمانەوە دەئالۆسکێن، دەشێوێن و دەگۆڕێن. دارسێوێك گەر باش گەشە بکات، سێوی باش وەبەردەهێنێت و هەرگیز هەرمێ ناگرێت. وە دار پرتەقاڵێکیش پرتەقاڵی باش دەگرێت نەك قەیسی.

دەرونشیکار دەبێت ئایدیایەکی لەسەر ئەوە هەبێت کە ئایا لە بنەڕەتدا ئەو کەسە چۆنە و دەشێت چی لێ دەربچێت. ئایا ئەو کەسە چی لێ دەردەچێت ئەگەر لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە گەورە ببێت کە دەبوو تیایدا بێت؟ ئایا ئەو کەسە چی لێدەردەچوو گەر گەشەکردنەکەی نەشێوێندرابایەو فەرامۆش نەکرابایە؟ من دان بەوەدا دەنێم کە ئەمە کارێکی ئاسان نیە و واش ڕاناگەیەنم کە کەسێك دەتوانێت بە ئاسانی ئەمە ئەنجام بدات. هەرچۆنێك بێت دەبێت هەوڵ بۆ ئەمە بدرێت. نابێت هەرگیز بە تەنها وەك خودی خۆی سەیری عوساب بکرێت، وە دەبێت ئەو کەسە چەند گریمانەیەك بکات کە خەڵکانێکی زۆر دەیکەن: وەك ئەوەی خەڵکی کەم یان زۆر بە هەمان شێوە لەدایك بووبن و وەك ئەوەی کە عوساب بریتی بێت لە شێواندنی بنەمای بابەتگەرایی مرۆڤ کە بۆ هەمووان هەمان شتە. ئەمە وا نیە. عوساب بریتییە لە شێواندنی کەسە دیاری کراوەکە. بەم جۆرە تەندروستی بەلای ئەوەوە بریتییە لە گەڕاندنەوەی کەسێتییە دیاری کراوەکەی.

لێرەدا رەنگە تۆ بڵێی کە گوایە تۆ باس لە دەگمەنی و تایبەتمەندێتی کەسێك دەکەیت لە کاتێکدا کە من پێشتر قسەم لەسەر ئەو راستیە دەکرد کە ئێمە هەموو وەك یەکین. باشە، من هەوڵمدا کە ئەوە روون بکەمەوە کە هەردووکیان راستن. ئەمە یاریکردن نیە بە ووشەکان. لە راستیدا ئێمە هەموو وەك یەکین وە هێشتا هەموو پێکەوە بە تەواوەتی دەگمەنین. ئەگەر ئێمە هەموو یەك شت نەبووینایە، نەمدەتوانی لە نەخۆش تێبگەم. بەڵام ئەگەر من پێم وابێت کە بەهۆی ئەوەی کە من لە نەخۆشەکە، گەشەکردنەکەی، بەرەو باشبوونەکەی تێدەگەم، وا لەو دەکات کە ببێتە کەسێك کە هاوشێوەی من بێت، ئەوا لە راستیدا، من زۆر کەم تێگەیشتووم.

کەسێك دەبێت وێنەیەکی نەخۆشەکەی لابێت، دووەم دەبێت ئەو وێنەیە لە تیۆرێکەوە سەرچاوەی گرتبێت – پشت بەستوو بێت بە مۆدێل یان پلانێکی تیۆری – گەرنا ئەوا من وون دەبم چونکە من هیچ چوارچێوەیەکم نیە بۆ سەرچاوەو گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوەیە. یەکێك لە سودە مەزنەکانی تیۆری فرۆیدی ئەوەیە کە مۆدێلێك هەیە، تیۆرێك هەیە. من بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تۆ چ پەرچەکردارێکت هەیە بەرامبەر چوارچێوەی تیۆری سەرچاوەکەی من، داکۆکی لەمە دەکەم: تیۆرێك بۆ خۆت هەڵبژێرە، وە هەوڵ مەدە لەو باوەڕەدا بیت کە دەتوانیت بەڕاستی لە هیچ کەسێك تێبگەیت بە قووڵی هەتا ئەمە لەبەرمەبنای مۆدێلێکی مرۆڤ – جا رەنگە مۆدێلەکە هی فرۆید بێت یان هی تر – نەبێت.

## بینینی ئەوەی کە ئەو هەلانە چین گۆڕانی قووڵ دەرەخسێنن

هەنگاوی داهاتوو ئەوەیە کە هەوڵ دەدەم بزانم ئەو هەلانە چین کە گۆڕانی قووڵ دەرەخسێنن؟ ئەمە پشت بە کۆمەڵە فاکتەرێك دەبەستێت وەك بزێوی، ئەو پلەیەی کە نەخۆشە دەناڵێنێت، بارودۆخی ژیان

كە ڕەسەنایەتی ئەو كەم یان زیاد دەكات، بەهرەی ئەو بۆ راستگۆیەتی، پلەو رادەی بەرگری كردنی ئەو. هەندێك خەڵك بە بەهرەیەكی زۆر زووەوە بۆ راستگۆیەتی دێنە دنیاوە، خەڵكانێكی تریش زۆر كەم ئەو راستگۆیەتیەیان تێدایە. من نامەوێت بڵێم كە گروپی دووەم لەو خەڵكانە ناڕاستگۆن بەڵام زیاتر زەحمەتە بۆیان كە راستگۆ بن. واتە دەبێت بارودۆخەكان زیاتر لەبار بن بۆیان بۆ ئەوەی راستگۆبن. بۆت دەردەكەوێ كە خەڵكانێك هەن كە دەتوانن لەناو دز و پیاوكوژانیشدا بژین و لەبەردەم مەترسی لەدەستدانی راستگۆیەتی خۆشیاندا نین. دەتوانیت خەڵكی واش بەدی بكەیت كە لادانێكی بچووك بەرەو ڕێچكەی تاوان دەیبات. دەبێت هەموو ئەم شتانە لەبەرچاو بگیرێت و حسابی بۆ بكرێت. دواتر تۆ دەبێت حوكمێك بدەیت: ئایا لە راستیدا هەلەكانی شیكاركردن چین وەك شیكاركردن لە دژی هەوڵەكانی تر مەبەستم لە چارەسەری یارمەتیدەر، راوێژكاری باش، یان وەستاندنی ئەو.

تۆ دەبێت زۆر بە ئاگا بیت بۆ ئەوەی بڕیاری خۆت بدەیت نەك یەكەم كاتژمێر، یان یەكەم هەفتە، بەڵام نابێت بۆ چەند ساڵێكیش چاوەڕوانی بكرێت هەتا لە دواجاردا لێی بە ئاگا بێت بە هۆی راستییەكی سادەوە كە ئەویش ئەوەیە كە لە ماوەی چوار ساڵدا هیچ رووی نەداوە. ئەگەر تۆ بتوانیت پشكنین ئەنجام بدەیت، ئەوا دەتوانیت چەند تێبینیەك بەدەست بهێنیت كە بەهۆیەوە شتێك دەپێكیت، لە دووهەم یان سێهەم كاتژمێردا، شتێك كە بە بڕوای تۆ بنەڕەتی و سەرەكییە، تۆ دەتوانیت ئەمە بكەیتە ڕێگەیەكی رووداو ئاسا و دەتوانیت پەرچەكرداری نەخۆشەكە ببینیت: لەویادا تروسكایەكی دەستنیشانكردن (ی نەخۆشیەكەی) هەیە، زۆر باشە، ئەگەر ئەمە لە كاتژمێری سێهەمدا ڕوویدا. رەنگە ئەو تروسكاییە زەردەخەنەیەكی كەم بێت، یان سەرلەقاندنێك بێت، یان رەنگە پەرچەكردارێكی توندو تیژ رووبدات و تۆ دەتوانیت حوكم بدەیت: ئایا ئەوە خاوەنی چۆنێتییەكی ترس – ئامێزە، یان تەنها پەرچەكردارێكە لەو جۆرەی كە دەتوانیت زاڵ بیت بەسەریدا، بە تایبەتی لە ماوەی سێ مانگی داهاتودا؟ یان نەخۆشەكە بە ساردو سڕییەكەوە دەڵێت: "ئۆه، بەڵێ، تۆ چەندە دانایت"، بەڵام دەبینیت كە ئەو بە هیچ جۆرێك پەرچەكردارێكی نیە. ئەگەر تۆ پێنج جار بەمە هەڵسیت، دە جار لە چەند مانگی یەكەمدا، تۆ هەستێكی تەواو قەشەنگت لا دروست دەبێت كە ئەم نەخۆشە لە راستیدا بەرامبەر بەچی دەتوانێت پەرچە كردار بنوێنێت و چ هەلێكیش لەبەردەمدان بۆ چارەسەری شیكارەكی.

چارەسەرێكی تر بریتییە لە بەرزنرخاندنی بەرگرییەكان: پلەی ئەوەی كە سەركوت كردنە سەرەكییەكان و بەرگرییە سەرەكییەكان چین. ئیتر كەسێك دەتوانێت بڕیار بدات كە ئایا ئەمە بەڕاستی كەسێكە بتوانرێت شیكار بكرێت یان نا. لە حاڵەتی دووەمدا میتۆدی كەیف هاتنی رەمزی بەدەردەكەوێت. نەخۆشەكە بەراستی نەخۆشە، ئەو بەڕاستی پێویستی بە شادوومانی هەیە لە رێگەی یارمەتیەكی دایكانەوە. كەسی دەرونشیكار هەڵدەستێت بە بەخشینی شادومانی بە نەخۆشەكە بە رێگەیەك یان زیاتر. لەژێر ئەم بارودۆخەدا، نەخۆشەكە دەتوانێت لە وجوددا بەردەوام بێت. ئەگەر تۆ كردنی ئەمە هەڵبژێریت، ئەوا دەبێتە چارەسەر لەسەر بناغەی تێگەیشتنی شیكارەكی، بەڵام تۆ باشیش دەزانیت كە چارەسەرەكە تۆزێك دوای دوا بەئاگابوونەوەی نەخۆشەكە دەوەستێت،

چونکە نەخۆشەکە ناتوانێت لەودیو ئاستێکی دیاری کراوەوە بڕوات.

دەرونشیکاری لە گونجاوترین کاتدا دەبێت دەست پێبکات و من ئەمەشم زۆر جار هەروا بە دەگمەنی بە نەخۆشێك نەگووتووە – بە پێزانینێکی ڕاستگۆیانە و واقیعیانەوە. نەك بە دەستەواژەی وەکو ئەمە:

"بێگومان، من ناتوانم گارانتی ئەوە بدەم کە تۆ بە شیکارکردنەکان بەرەو باش بوون دەڕۆیت". ئەمە زۆر ڕاستگۆیانە خۆی دەردەخات، بەڵام زۆر ڕاستگۆ نییە چونکە ئەم مانایە دەگەیەنێت: "بێگومان، بەڵام پێشبینیەکی مەعقول هەیە کە ئێمە پێی هەڵدەستین بەڵام پێشبینی مەعقولی لەو جۆرە بوونی نیە.

سەرکەوتنی چارەسەرئامێزی شیکارکردن بێگومان سەرکەوتنێکە کە تیایدا کەسێك دەتوانێت بڵێت، ئەمە جگە لە چارەسەرکردنی نەخۆشێك کە زیاد لە حەد نەخۆشە، ئەگەرەکە ئەوەیە کە شیکار کردن لانی کەم یارمەتی دەدات.

من ئەمە وەك شتێکی وێرانکەر باس ناکەم. من بڕوایەکی گەورەم بە دەرونشیکاری هەیە، هەتا ماوەی زیاتر کاری تیا بکەم، زیاتر تیای قاڵ دەبم و بەو جۆرە. بەڵام بۆ خاتری خوا، لەم لایەنەوە، شیکردنەوە هیچ جیاواز نیە لە هەندێ میتۆدی پزیشکی. ئەگەر ئەمە بە تەواوەتی بۆ نەخۆشێك گرنگ بێت – لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەمە گرفتی ژیانی بوو – ئەوا ئەو بە پەرۆشیەوە میتۆدێك بەکار دەهێنێت کە ١٠٪ یان ٥٪ هەلی چاك بوونەوەی هەبێت. بەڵام پزیشکەکە دەبێت ڕاستگۆ بێت لەگەڵیدا چونکە گەر وا نەکات ئەوا ناتوانێت مەیدانخوازی ئەو هێزانەی ناو نەخۆشەکە بکات کە بۆ تەندروستی خەبات دەکەن، چونکە ئەو ڕێگە لە نەخۆشەکە دەگرێت لە بینینی جدیەتی بارودۆخەکە.

### هەڵە سەرەکیەکانی ناو چارەسەری دەروونی

ئێستا ئەمەوێت دەربارەی شتێك بدوێم کە لە ئەزموونی خۆم لەگەڵ سەرپەرشتی کردن و لەگەڵ سیمینارەکان پێی گەیشتووم، وەك هەڵەی سەرەکی لە نێو خوێندکارەکاندا بەدیم کردوون. بەر لە هەر شتێك، من بۆم دەرکەوت کە زۆرێك لە شیکەرەوە لاوەکان، ڕەنگە هی بەتەمەنیشیان تێدا بێت، بەڕاستی لە نەخۆشەکە ترساون، هەموو بیانوویەکیان لەبەردەستدا بووە کە لە نەخۆشەکە بترسن. لێرەوە پیاوێك سەرهەڵدەدات کە گرفتێکی هەیە و چل ساڵە بە دواوەیەتی، ئەمە بەشێوەیەکی ترسناك قورسە، ئێمە کەم دەزانین، لە ئەزموونی خۆمانەوە، ئێمە دەزانین ئەوە شتە ڕێك و ڕەوانەکە نیە کە ئێمە فێری بووین وە ئەو پیاوە دێتە ژوورەوەو لەو باوەڕەشدایە کە ئێمە دەتوانین گرفتەکەی چارەسەر بکەین. وە سەرباری ئەوەش: هەندێ جار و زۆر بە جوانیش پارەمان دەداتێ.

ئەوە بوێرییەکی لەو جۆرەیە کە ئێمە دەتوانین بەڵێن بدەین کە دەتوانین یارمەتی ئەو بدەین و کە ئێمە بەشێوەیەکی سروشتی و بێ بەرگریانە ئەترسین. من ناڵێم نابێ ئێمە چارەسەری ئەو نەگرینە ئەستۆ، بەڵام دەبێت ئێمە بەئاگابین لەوەی کە ئەم پرۆژەیە چ مەترسیەکی هەیە و بشزانین کە چەندە کەمیش بە ڕاستی خۆمان بۆ ئامادە کردووە. ئێمە سەرکێشییەك بۆ خۆمان و بۆ ئەویش دروست دەکەین، ئێمە هیچ بیانوویەکمان نیە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەو بە جۆرێك وەك ئەوەی کە ئەمە تەنها مەسەلەیەك بووە کە لە پێناویدا هاتووە و گەر سەرێك لە ئۆفیسەکەمان بدات، ئەوا هەموو شتێك

باش دەردەچێت. دواتر ئێمە کەمتر لەو دەترسین، چونکە ئێمە هەوڵ نادەین کە ئەو ئینتیباعەی بدەینێ کە ئێمە هێندە دڵنیاین.

لەم رووەوە ئێمە بە گشتی لاسایی پزیشک ناکەینەوە، گەر تۆ بە قۆڵێکی شکاوەوە بێیتە لای پزیشکێك و پزیشکەکەش بڵێ: "بۆ خاتری خوا، من نازانم ئایا دەتوانم ئەمە چارەسەر بکەم" ئەمە تارادەیەك ترسهێنەرە بۆ تۆ، بەڵام دواتر تۆ دەچیتە لای پزیشکێکی تر. ئێمە لە راستیدا لەو ئاستەدا نین کە پزیشکێك تیایدایە، بەڵکو زۆر جیاوازترین، چونکە ئێمە هەر جارەو لەگەڵ نەخۆشیی قورستر و نەخۆشی گوماناوی تر لەبارەی چارەسەرەوە مامەڵە دەکەین. بەڵام گەر ئێمە بەئاگابین لەمەو خۆمان نەخەینەوە ناو بارودۆخی قەشەنگی شیکەرەوەکەوە کە لەم لایەی مێزەکەیەوە دادەنیشێت، ئەوا ئێمە کەمتر لە نەخۆشەکە دەترسین.

شیکەرەوەکان و قەشە پرۆتستانتەکان هاوبەشن لە بوارێکدا: قەشەکان گومانێکی دانپیانەنراویان هەیە بەرامبەر بە خواو شیکەرەوەکانیش بەرامبەر بە نائاگایی. بەشێوەیەکی رەسمی قەشەکان باوەڕیان بە خودا هەیە، گەر نا ئەوا ناتوانن کار بکەن، شیکەرەوەش بەشێوەیەکی رەسمی باوەڕی بە نائاگایی و ئەوە هەیە کە کاری میتۆدەکە بریتییە لە ئاشکراکردنی نائاگایی. بەڵام من ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە زۆرێك لە شیکەرەوەکان لە راستیدا بڕوایان پێی نیە. بەڵام ناچارن خۆیان وا پیشان بدەن چونکە گەر وا نەبێ نەخۆشیان نابێت هەروەك چۆن قەشەیەك وا خۆی نیشان دەدا کە بڕوای بە بوونی خوا هەیە، گەر نا ئەوا لە کەنیسە فڕێ دەدرێتە دەرەوە. لە راستیدا بڕێکی زۆر لە بێ بڕوایی، گومان، دوو ڕوویی هەیە بەدەر لەم هەموو شتانەو بەهۆی هەموو جۆرەکانی عەقڵاندنەوە.

ئەمە رەگەزی دووەم دروست دەکات کە من پێم وایە کە قەشە و شیکەرەوەکان تیایاندایە، هەست کردنێکی سەیرو تەواو بە تاوان، (أ) بەرامبەر بە هەڵخەڵەتاندنی خۆی، چونکە ئەو کەسە بە تەواوەتی بڕوای بەو قسانە نیە کە دەیانکات" (ب) بەهۆی هەڵخەڵەتاندنی نەخۆشەکە چونکە شیکەرەوە بە نهێنی بیر دەکاتەوە: "بۆ خاتری خوا، من لەو نەخۆش ترم و هەرگیز بەرەو باش بوونیش نەرۆیشتوم و دووەم، هەرگیز ئەزموونی ئەم نائاگاییەم نەکردووە، کەچی دەبێت لەسەر ئەم رێبازە بڕۆم ئەویش بەهۆی ئاشکراکردنی نائاگاییەوە".

من زۆر جار سیمینارەکانم بەم پرسیارە دەست پێکردووە: ئایا ئێوە هەرگیز کەسێکتان بینیوە کە بەهۆی دەرونشیکارییەوە چارەسەر کرابێت یان تارادەیەکی زۆر یارمەتی درابێت؟ کارێکی مایە پوچانە دەبێت گەر تۆ کۆمەڵێك نەشتەرگەر یان کەسی ئارەزوومەند بهێنیت و ئەم پرسیارەیان لێبکەیت، بەڵام پێم وا نیە لەم کارەی ئێمەدا ئەمە کارێکی پووچگەرا بێت، چونکە راستییە خەماوییەکە ئەوەیە کە زۆرێك لە خوێندکارەکانمان هەرگیز کەسێکیان نەبینیووە کە بە تەواوەتی بەهۆی ئاشکراکردنی نائاگایی و خودی ئاگایی خۆیشیەوە گۆڕابێت. خۆ هەڵخەڵەتاندن و هەستکردن بە تاوان و دوو قسەیی زۆر هەیە بەڵام ئەمە هەڵناستێت بە شیکردنەوە. من پێم وایە زۆر گرنگە کە ئەم دیاردەیە شیکار بکرێت.

لە شیکردنەوەی دەرونشیکارێکدا، دەبێت سەرنجێکی زۆر لە سەرکوت کردنی گومانەکانی، هەست کردنەکانی بە تاوانباری، وهتد، کە بەرامبەر

بە هەموو شتەكان هەیەتی، بدرێت. من لەو باوەڕەدام كـە ئەمـە یارمەتیـدەرێكی بـاش دەبێـت. رەنگـە لـە راستیدا خەڵكانێكی دی هەبن كە شتێكی تر بكەن، چـــونكە بـــەردەوامبوون لەســـەر ئەمـــە بـــارێكی مەترسـیدارە، جـا ئـەو كەسـە قەشـەیەك بێـت كـە بانگەشە بۆ پەرستنی خودا دەكات و خۆشی باوەڕی پێـی نـەبێت، یـان ئـەو كەسـە شـیكەرەوەیەك بێـت و باوەڕی بە كارەكـەی نـەبێت كە دەربـارەی نائاگاییـە. ئەوە زۆر ناتەندروستە بۆ مێشك و جەستەی كەسێك و ئارادەیەكی ترسناكیش بێزاركەرە. كەواتە من لـەو بـاوەڕەدام كـە زۆر گرنگـە دادەی بـڕوا بـوونی هـەر كەسێك دەربارەی ئەوەی كە بە خەڵكی رادەگەیـەنێت و ئاراستەی نەخۆشەكانی دەكات، لە ناخی خۆشیدا بەرز بێت.

بۆ دەرچـوون لـە ململانێكـە، بـۆ دەرچـوون لـەم قەیرانە، قەشە لیبراڵەكان باس لە خودا دەكەن، بەڵام خـــودا تـــەنها ئاماژەیەكـــە بـــۆ فرازمەنـــدێتی (ترانسێندنس)، زۆر شـیكەرەوەش بـە سـادەیی "لـە دەرونشیكاری دەڕوانن"، بەڵام ئەوان هەڵدەستن بە كـاری راوێـژكاری بـۆ نەخۆشـەكان، ئـەوان خـەڵكی فێـری دانـایی لـە ژیـندا دەكـەن و ئامۆژگـاری بـاش پێشكەش دەكەن، هانـدەری باشی خـەڵكن و جـوانن. ئـەوان هـەموو جـۆرە ئیشـێك دەكـەن، بـەڵام هـەموو ئەمانـە لـە ووشـەگەلێكی شـیكارەكیانەدا ریزبەنـد كراون چونكە نەخۆشەكە نابێت تێبینی ئەوە بكات كـە ئـەوەی ئـەوان دەیكـەن بریتییـە لـەوەی كـە راوێژكارێك پێی هەڵدەستێت.

هەموو ئەوەی كە مـن لێرەدا دەیڵێم ئەوەیـە كە من بڕێكی زۆر لە نەبوونی سەراحەت لەم مەسەلانەدا بەدی دەكەم لە نێو خەڵكدا، هـەروەها بڕێكـی زۆر لـە گومـان و هـەموو جۆرەكـانی دوو ڕوویـی و فـێڵ و خۆدزینەوەش بوونی هەیە. زۆر گرنگە بۆ سـەرتاپای كاری شـیكردنەوەیی كـە هەسـتێت بـە بینینـی ئەمـەو بـەهۆی خسـتنەڕووی شـتەكان و روونكردنـەوەیان و لـەو گێـژاوە بێتـە دەرەوە، ناشـبێت بەشـێوەیەكی پیاوماقووڵانـە مامەڵـەیان لەگەڵـدا بكرێـت چـونكە بێگومـان ئێمـە هـەموو كـۆكین لەسـەر ئـەوەی كـە باوەڕمان بە نائاگایی هەیە.

### دامەزراندنی بارودۆخی شیكارەكی

یەكێك لە شتەكانی تر بریتییە لە دامەزراندنی بـارودۆخێكی شـیكارەكی. بـارودۆخی شـیكارەكی، وەك چـۆن سـولیڤانیش زۆر جـار جـەختی لەسـەر كردۆتـەوە، بـەو راسـتییە دەسـت پێـدەكات كـە نەخۆشـەكان دەیانـەوێت ئـەو (شـیكەرەوەكە)شـی بكەنەوە و لە راستیدا ئەو دەبێت ئەوە بۆ من روون بكاتەوە كە ئەو پێویستی پێیەتی. هاتنی ئەو بۆ ئۆفیسەكەی من لەبەر هۆیەك یان زیاتریش بەس نیە. بـۆ دامەزرانـدنی بـارودۆخی شـیكارەكی، پێویسـت دەكـات كـە بارودۆخێك لـە ئـارادا بێـت كـە هێنـدەی ژووری نەشتەرگەری خاوێن بێت، بەڵام بە مانایـەكی جیـاوازتر، واتـە بارودۆخێكـە كـە لـە سـەرەتاییترین چركەساتەكانەوە دەست پێدەكات، بارودۆخێكە بێ شەرم و بێ خەیاڵە. فرۆیـد خـودی خـۆی ئەمـەی زۆر بـاش روون كردۆتـەوە. ئـەو نەخۆشـەی كـە لـەم بارودۆخەدایـــە هـــیچ وشـــە و خەندەیـــەكی لێـــوە دەرناچێت، چ ئەو خەندە و وشانە سادەبن، ئاسایی بن، یان خەیاڵاوی. نەخۆشەكە دەبێت هەست بكات كـەی دێتـە ئێـرە، بزانـێ كـە ئەمـە جیهـانێكی تـرە جیـاواز لـەو جیهانـەی كە ئەو تیـای ڕاهـاتووە. ئەمـە جیهـانی خـۆ لـە خۆگـۆڕین نیـە، بـەڵكو جیهـانی ریـالیزمی تـەواوە بـە هـەموو مانایەكـەوە. ئەمـە جیهانێكـە كـە دوو كەسـەكە پێكـەوەو لـە رێگەیـەكی سەنتراڵەوە وابەستەكراون.

ئایا كەسێك بە چ شێوەیەك دەتوانێت لە ئەركەكەیدا نائاگایی بكات بە ئاگایی، كە بە ئاگا بێت لەو شتانەی كە لە ناویدا هەن، كە بە ئاگا بێت لەو شتەی كە ناوێرێت بە ئاگا بێت لێی. بەر لە هەر شتێك دەبێت ئەو كەسە لە هەر جۆرە (ڕۆشنبیراندن – *intellectualization*)ێك خۆی بە دوور بگرێت. ڕۆشنبیراندن یەكێكە لەو هەڵانەی كە ئێمە دەیانكەین.

فرۆیدیەكان بە قسە نەكردن خۆیان لەم هەڵەیە بە دوور دەگرن. ئەمە ڕێگەیەكی باشە بە دووركەوتنەوە لە ڕۆشنبیراندن. ئەوان تەنها بێدەنگن، جاری وا هەیە ئەم بێدەنگیە چەند كاتژمێرێك یان چەند هەفتەیەك دەخایەنێت. بەڵام تەنانەت ئەمەش یارمەتیدەرێكی گەورە نیە. نا–فرۆیدیەكانیش تەنانەت بە هەمان شت هەڵدەستن بەڵام جیاوازییەكە ئەوەیە كە ئەوان قسە دەكەن، كە دواتر هیچ باشبوونێك بەدی ناكرێت. تۆ دەربارەی داپیرە دەدوێیت، چی لەوێ ڕوویداوە باسی دەكەیت، لە بارەی ئەوەی كە بۆ هەست بەم شت یان ئەو شت دەكەیت قسە دەكەیت و بەو جۆرە هەموو قسە مانابەخشەكان تەنها لەوەدا یارمەتی نەخۆشەكە دەدات كە ئەوە ئەنجام بدات كە لە ماوەی ژیانی خۆیدا ئەنجامیداوە، ڕۆشنبیراندنی تۆزێ زیاتری ئەوەی كە پێی دەگوترێت گرفتەكانی ئەو نەك ئەزموون كردنیان. بەشێوەیەكی ئاشكرا، ئەركی شیكردنەوە بریتییە لەوەی كە نەخۆشەكە ئەزموونی شتێك دەكات نەك ئەوەی كە زیاتر بیردەكاتەوە. هەڵبەتە ئەمە نەك بۆ نەخۆشێكی تووش بوو بە (ڕاڕایی – *abssession*)، بەڵكو بۆ هەموو كەسێك و بە خودی شیكەرەوەكەشەوە. ئەركی شیكەرەوەكە لە یەكەم ساتی پرۆسەكەوە بریتییە لە دووركەوتنەوە لە هەر جۆرە كۆمەكی و شادبوونێك، یان ئارەزووكردنێكی ڕۆشنبیراندن، بەڵكو بریتییە لە جێپێگرتنەوەی وشە، ئایدیا، چەمك و كردنیان بە ئەزموون.

### شیكەرەوە دەبێت ئەوە بڵێت كە دەیبینێت

دووەم، بە بڕوای من بە گشتی زۆر گرنگە: كاتێك كە شیكەرەوە شتێك دەبینێت دەبێت بیڵێت، بەڵام بەوپەڕی ڕوونیەوە بیڵێت. حەقیقەت خاوەنی چۆنێتییەكی سەیرە: لەبەرئەوەی كە حەقیقەت واقیع دەنوێنێت، كەسەكە لە شوینێكدا دەپێكێت كە نیمچە – ڕاستی ناتوانێت تیایدا بیپێكێت. ئەگەر تۆ لە پەیوەست بوونێكی ڕاستەقینەدا بیت لەگەڵ كەسێكی تردا، بە مانایەكی تر، بەراستی لەناویدا بیت و لەگەڵیدا بیت و ئەمەش بە گوتن بڵێیت كە ئەمە لە ناو ئەودا ڕاستییەكە، ئەوا زۆر گرانە بۆ ئەو كەسە كە بەردەوام بێت لە بەرگریكردنەكەی (خۆ – بە دەستەوەنەدانەكەی). ئەگەر ئەو زۆر نەخۆشە، ئەوا وایە، مەبەستمە بڵێم كە هیچ گومانێك نیە دەربارەی ئەوە بەڵام ئەو كەسەی كە ئەو نەخۆشە نیە، ئەگەر لە پەیوەندی تەواودا بیت لەگەڵیدا و پێی بڵێیت: "سەیری ئێرە بكە، ئەوەی من دەیبینم ئەمەیە.."، ئەوا بۆی دەردەكەوێت كە زۆر قورسە بەلایەوە كە بجووڵێت و عەقڵاندنێكی سەرتاپاگیر و ئایدیات بداتێ كە هیچ شتێكی لێ ناكەوێتەوە.

ئەگەر تۆ نیوەی ئەو واقیعە بە نەخۆشەكە بڵێیت بەو بیانووەی كە ناتوانێت وەریبگرێت (وەك دەڵێن كە گوایە ئەو ئامادە نیە، كەچی لە ڕاستیدا ئەوەی كە ئامادە نیە بریتییە لە شیكەرەوەكە)، ئەوا لە ڕاستیدا نەخۆشەكە نەپێكراوە. بۆ نموونە ژمارەی تەلەفۆنەكە زەنگ لێنادات، هۆی ئەمە تەنها ئەوەیە كە تەلەفۆنەكە پێنج ژمارەی دروستی هەیە بەڵام شەشەم دانە زەنگ لێنادات. تۆ لێدانەكە ناپێكیت.

بە پێچەوانەوە، نەخۆشەکە نائاگایانە هەست دەکات، لێرەدا تۆ هەڵخەڵەتێنراویت، چونکە بە هۆی ڕێگەیەکەوە نەخۆشەکە باشتر ئەمە دەزانێت. لێرەدا ئەو وا بیر دەکاتەوە کە ئەگەر تۆ هێندە پەرۆشیت و هێندە وورییایت لە ئامادەکردنی ئەمەدا، ئەوا دەبێت ئەمە ترسناك بێت، تۆ دەبێت وا بیر بکەیتەوە کە ئەمە ترسناکە. نەخۆشەکە دووبارە دەکەوێتەوە کەش و هەوایەکی وەهاوە کە هەمان شێوەی ناحەقیقەت و نیمچە — حەقیقەتە و دووڕووییە کە پێی ڕاهاتوە (زۆربەی خەڵکی لە منداڵییەوە بەم دووڕووییە ڕاهاتوون)، تۆ سەرتاپای بارودۆخەکە وێران دەکەیت.

ڕێگەم پێ بدەن کە یەك نموونەتان بدەمێ کە من زۆر جار لە سەرپەرشتی کردنی شیکردنەوەکاندا بەدی دەکەم. شیکەرەوەکە بە کەسێك دەڵێت: باشە، من وا دێتە بەرچاوم کە تۆ وا هەست دەکەیت وەك ئەوەی کە مناڵێکی پێنج ساڵانەبیت، هەرچۆنێك بێت، ڕاستییەکە ئەوەیە کە تۆ بەشێوەیەکی کاریگەرانەو بەشێوەیەکی سۆزداری منداڵێکی پێنج ساڵانیت، لە کاتێکدا کە تۆ بەشێوەیەکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیانە پیاوێکی تەمەن چل ساڵیت. "ئێستا ئەگەر من بە نەخۆشەکە بڵێم: تۆ وەك منداڵێکی، یان وەك ئەوەی منداڵێکی پێنج ساڵان بیت هەست دەکەیت، ئەوا من بە تەواوەتی نایپێکم. چونکە ئەو وایە. بێگومان، دەبێت من ئەمەش زیاد بکەم: بەڕاستی تۆ، هەروەها، شتێکی تریشیت". بەڵام ئەم "وەك ئەوەی" و "وەك"ە دەرگاکە بە کراوەیی جێدەهێڵن. وە نەخۆشەکە دەڵێت "باشە، من وا هەست ناکەم کە مناڵێکی پێنج ساڵانە بم" و ڕەنگە واش بێت، بەڵام ئەو وایە. ئەوەی کە مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە هیچ شتێکی باش بوونی نیە گەر بێتوو ئەو ئاراستەکردنە زۆر تەواو و ئەو واقیعیەتە نەبێت کە لە نەخۆشەکەدا بەدی دەکەم. ئێستا من بۆم دەردەکەوێت کە کۆمەڵە بارودۆخ و خەڵکێك هەن کە تیایدا دەبێت تۆ بە وریایانە وشەکانت بپێویت، ئەمە لە حاڵەتەکانی دوودڵی توندوتیژ و حاڵەتی (پری — سایکۆتیك *pre-psychotic*) و هتد..دا. بەڵام زۆرینەی نەخۆشەکانی ئێمە بە دەست ئەو حاڵەتانەوە ناناڵێنن.

من زۆر جار ئەم گفتوگۆیەم لە نیو خوێندکاراندا گوێ لێبووە: "باشە، ئایا ئەمە زوو نیە"، یان: "ئایا نەخۆشەکە دەتوانێت ئەو ڕێگەیە بگرێت؟". من هەمیشە ئەمە بە شتێکی تەنزئامێز وەردەگرم. من ئەتوانم بەخۆم بڵێم کە من زۆر دڵشادم ئەگەر بڕوام بە تێگەیشتن لە شتێك هەبێت و ئەگەر بیانوویەکی تایبەتم نەبێت بۆ بیرکردنەوە لەوەی کە ئەمە زیان بە نەخۆشەکە دەگەیەنێت یان ئەوەی کە من دەیڵێم هێندە نامۆیە بە نەخۆشەکە کە بەهیچ جۆرێك نایزانێت، من زۆر دڵشادم کە کتومت ئەوەی پێ بڵێم کە دەیبینم. من پێموایە قسەکردن لەبارەی گرفتەکەوە وەك ئەوەی کە بە گشتی بووبێت، وەك ئەوەی کە گرفتە گرنگ و ئاڵۆزەکەمان لەوەدا دروست ببێت کە ئێمە ناوەوەی خۆمان باس دەکەین، زۆر بێزراوە، چونکە ناوەوەی خۆمان بێ هیچ گومانێك زۆر قوڵەو و ئێمە زۆر شادمان دەبین گەر شتێك تێبگەین.

ئەگەر تۆ بەڕاستی شتێك لە نائاگایی تێدەگەیت، ئەوا دەبێت بڕیارێك بدەیت. ئەوە وەهایە سەرباری هەستی باو (*common sense*)، سەرباری هەستی باوی جۆری کلتور و ئەمەش بەوپەڕی سەراحەتەوە ڕادەگەیەنم. من گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە ئەوە وەهایە، ئەمە ئەوەیە کە من دەیبینم، سەرباری ئەو ڕاستیەش کە هەموو بەڵگەی هەستی باو لە دژی ئەمە دەدوێت. با نموونەیەکی

سادە بهێنینەوە کە زۆرجار تووشی دەبینەوە. با وا دابنێین کە نەخۆشەکە دایکێکی زۆر جوانی هەیە و هەموو کەس دان بەو راستییەدا دەنێن کە دایکی جوانە، و هتد. بەپێی ستاندارده تەقلیدیەکان ئەو ئافرەتێکی زۆر جوانە، بەلاّم ئەو لە راستیدا پیاوکوژێکە. من ناڵێم تۆ هێندە پەلەیت کە یەکسەر دڵگران ببیت بەو راستییەی کە کەسێك بکوژە، بەلاّم لە خاڵێکدا و لە حاڵەتێکی تایبەتدا تۆ بەو جۆرەیت. دواتر، تۆ دەڵێیت: "باشە، وا هەست دەکەم کە زۆر جار دایکی تۆ دوژمنکارانەیە". ئەوەی کە تۆ لە ڕاستیدا پێی هەڵدەستیت ئەوەیە کە تۆ ناتەوێت بەڕاستی بەرپرسیارێتی حوکمدان بخەیتە ئەستۆی خۆت، بەرپرسیارێتی بڕیاردان لەوەی کە دەیبینیت.

لەم ڕووەوە، زۆر کەس لە ئێمە ئەو مەیلەی هەیە کە هێندەی مومکینە ژیانێکی ئارام بژی. پزیشکێکی نەشتەرگەر دەبێت بڕیارێك بدات لەسەر لووەکە و هەندێ جاریش بڕیاری وەها کە بەرپرسە لە ژیان و مردن. ئەو ناتوانێت بڵێت: "باشە، دوو کاتژمێر چاوەڕوانی بکە، من جارێ بیری لێ دەکەمەوە". ئەو دەبێت هەر ئێستا و ئالێرەشدا بڕیارەکە بدات. پێ دەچێت شیکەرەوەکان لە پێگەیەکدا بن کە تیایدا هەست دەکەن کە نابێت بە هیچ جۆرێك خۆیان ماندوو بکەن. ڕەنگە تۆ ئەمەت لا سەیر بێت، ئەگەر من بڵێم "شیکەرەوە" من وەك شیکەرەوەیەك قسە دەکەم و هەموو شتێکیش دەربارەی ئەوەی کە دەیڵێم شارەزام. ئەوە بۆ سی ساڵ دەبێت من خەریکی ئەم کارەم و بەچەندین شکستدا تێپەڕیوم، تەنها یەك شت، یەك ڕەخنە نیە کە من گرتبێتم و یان بیگرم ئەگەر بێت و لە ئەزموونی شەخصی خۆمەوە سەرچاوەی نەگرتبێت. من بڕوام وایە کە کارێکی ترسناکە کە بتەوێت تەواو لە ئیسراحەتدا بیت و خۆشت نەخەیتە مەترسی حوکمدانێکەوە کە دژی هەستی باوە، دژی تەقلیدیەتە و پێتوایە کە نەخۆشەکە تووڕە دەکات.

## تێپەڕبوون بە بەرگریدا

یەکێکی تر لە لایەنە هەرە گرنگەکانی تری پرۆسەی شیکارەکی بریتییە لە تێپەڕبوون بە بەرگریدا. ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە پێویستە کەسێك بەشێوەیەکی سیستماتیکی بیکات – بڕینی یەك لە دوای یەکی ڕێگاکانی پاشەکشێ هەتا نەخۆشەکە دەخزێنرێتە سوچێکەوە. لەوێدا ئەو ناتوانێت لە عەقلاّندنەکان هەڵبێت، لەوێدا ئەو زۆری لێدەکرێت کە یان ئەزموونی شتێك بکات – یان لە چارەسەرکردن بوەستێت و جارێکی تر نەیەتەوە. ئەوەی کە لەم جۆرە میتۆدە ڕاچڵەکێنەرە یان میتۆدە دڵڕەقە دەچێت، لە ڕاستیدا ئەوەیە کە هەرگیز هێندە دڵڕەق نیە، چونکە ئەگەر لەگەڵ نەخۆشەکەدا بم دەتوانم بیخزێنمە سوچێکەوە. ئەگەر من لەگەڵ ئەودا بم ئەو بەڕاستی هەست بە ڕەقێتی و واقیعیەتی پەیوەندیداریێتی من بە ئەوەوە و گفتوگۆکەشمان دەکات.

کەسێك دەتوانێت شیکردنەوە بە دوو جۆر پێناسە بکات: (أ) بە ئاگادارکردنەوەی نەخۆشەکە لەوەی کە شیکەرەوەکە تیایدا بەدی دەکات و لەوێشەوە ئامادەکردنی نەخۆشەکە بۆ ئەوەی بوێرێت خۆی ببینێت، (ب) لە هەمان کاتدا بەهۆی بڕینی سیستماتیکیانەی ڕێگاکانی خۆبەدەستەوەنەدان، ڕێگەکانی پاشەکشێ، هەتا ئەو خاڵەی کە تیایدا نەخۆشەکە لەگەڵ خودی خۆیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و دەبێت هەست بە شتێك بکات یان بڕواتە دەرەوە و واز لە چارەسەر بهێنێت.

چی ڕوودەدات گەر نەخۆشەکە لەگەڵ شتێکدا کەوتە تەماسەوە کە پەیوەندیدار نەبێت؟ ئەوە هەستکردنێکە بە ڕوحیەتی چالاك بوونی ڕوو لە زیادبوون، دڵخۆش بوون، شادی، بێ باك بوونی تەواو لەوەی کە شتەکە زۆر شەرمەزارکەرە یان نا. لە ڕاستیدا ئەو لەگەڵ پارچەیەك حەقیقەتی ناوخۆی

کەوتۆتە تەماسەوە، ئەگەر ئێمە هەر بیانوویەکمان هەبێت کە بڕوامان وا بێت کە چەمکی بنەڕەتی لە میتۆدەکەی فرۆیددا ڕاستە (ئەو چەمکەش بریتییە لەوەی کە ئاشکراکردنی ماددەی ناپەیوەندیدار دەبێتە هۆی تەندروستی، یان ئارەزووەکانی ناخمان ئازاد دەکات بۆ تەندروستی عەقڵی) ئەوا لە ڕاستیدا ئەم ئەزموونە بەلای منەوە موقنیعترین ئەزموونە کە دووبارە و دووبارە لە نەخۆشەکان و لە خۆشماندا بەدی دەکەین.

جارێکی تر شتێکی تر بە ڕاستی پێکرا، زیادبوونێك لە ووزەدا هەیە. ئیتر دەبینین کە ئەمە وەك ئەو حاڵەتە وایە کە لە تەمومژدا هەیە، تەمەکە دێت و دەڕوات، سێ ڕۆژ دواتر دووبارە باڵ دەکێشێتەوە و تۆ دەبێت دووبارە کاری لەسەر بکەیتەوە و دەبێت جارێکی تر هێرشی بکەیتە سەر خۆبەدەستەوە نەدانەکە. ئەمە پرۆسەیەکە کە دەتوانیت ناوی لێبنێیت (کارکردن لە ڕێگەی)، کە بڕێك کاتی تەواوی پێویستە. بەڵام لە ڕاستیدا، نیشانەی دۆزینەوەیەکی شیکارەکی هەرگیز نیشانەیەکی ڕووناکبیریانە نیە: "ئۆه، زۆر ڕاستە دکتۆر، من ئێستا دەبینم کە تۆ ڕاستیت". نەخۆشەکە دەڵێت کە تۆ ڕاستیت و گەر تۆزێك زیرەکتر بێت ئەوا هەندێ گۆڕانی ڕووناکبیری زیاتر بۆ تیۆرەکە زیاد دەکات. لە ڕاستیدا ئەو هیچی بەدەست نەهێناوە. بەڵام ئەگەر ئەو لەگەڵ هەستێکی دڵخۆشیدا بڕوات، لەگەڵ هەستکردنێك بە چالاکیدا بڕوات، ئەگەر بە هەمان هەستیشەوە ئێمە جێبهێڵێت، ئەوا ئێمە لە ڕاستیدا شتێك دەربارەی سروشتی شیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی ئەنجامدراو دەزانین.

تەنها یەك بنەما هەیە بۆ ئەوەی کە ئایا کاتژمێرێك پڕ شادییە یان نا، ئەو بنەمایەش بریتییە لەوەی کە ئایا ئەو کاتژمێرە خۆشی بەخشە؟ گەر کاتژمێرێك بێزارکەر بێت بۆ خۆم یان بۆ نەخۆشەکە بێزارکەر بێت، ئەوە بێگومان چەوتە. من باشم لەبیرە ئەو کاتژمێرانەی لە ماوەی گواستنەوەم لە میتۆدەکانی فرۆیدەوە بۆ میتۆدەکانی دی، کە هێندە بێزار بووم نەمدەتوانی هەتا کۆتایی کاتژمێرەکە چاوەڕوان بم. من زۆر بە باشی گوێم دەگرت و بە ئەوپەڕی توانام تێدەکۆشام، کەچی هێشتا چاوەڕێ بووم کە ئاخۆ کەی ئەم کاتژمێرە تەواو دەبێت. ئەوە لە ڕاستیدا ئەو هۆکارە بوو کە وای دەکرد من هەست بکەم کە شتێك لە ڕێگەی دەستبەکار بوونمدا لە بنەڕەتەوە هەڵەیە. من دەزانم کە مامۆستاکانیشم بە ترسەوە دووبارە بێزار بووبوون، چونکە زۆربەیان هەستیان بە خەواڵوویی دەکرد لە کاتی شیکردنەوەدا، وە من بیرمە کە چەندە ڕاچڵەکیم کاتێك گوێ بیستی یەکێك لە مامۆستاکانم بووم کە لە ئاهەنگێکدا گوتی کە توتنێکی تازەی دۆزیوەتەوە کە ناهێڵێت لە کاتی شیکردنەوەدا خەو دایبگرێت. یەکێکی تریان ووتی خەو لێکەوتن خراپ نیە لە کاتی شیکردنەوەدا چونکە لەو خەوەدا خەون بە نەخۆشەکەوە دەبینین و ئەمەش باشترین ڕێگەیە بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی ئەو کەسە نەخۆشە. (من جارێك یان دووجار خەوم لێکەوتوە، بەڵام ڕەنگە من حەزم بە پرخە پرخ بێت، لەبەرئەوە نەموێرا جارێکی تر بنووم لە کاتی شیکردنەوەی دەروونیدا. بەڵام بیرمە زۆر زۆر بێزار بووم).

بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تەواو، بە ئیستیسنایەکی گەورەوە، هەتا ماندووتر بوومایە، بێزارتر دەبووم. ئەمە بەلای منەوە یەکەم بنەمای حوکمدانە لەسەر کاتژمێرێکی شیکردنەوە، جا من بێزار بووبم یان نەخۆشەکە. ئەگەر نەخۆشەکە بێزار بووبێت، ئەوا شتێکی خراپە بەڵام لە ڕاستیدا تەنانەت ناتوانیت جیای بکەیتەوە کە نەخۆشەکە بێزار بووە یان من، وە بە پێچەوانەشەوە.

**سەرچاوە**

WWW.erichfromm.de

# شێوازی بوونگەرایانە لە فەلسەفاندندا

جۆن ماکواری
وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی

١-بوونگەرایی (وجودیەت) چییە؟
٢-هەندێ بابەتی دووپاتکراوە لە بوونگەراییدا.
٣-جۆراوجۆری لە نێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا.
٤-بوونگەرایی و فینۆمینۆلۆژیا (دیاردەگەرایی).
٥-جیاوازیی نێوان بوونگەرایی و هەندێ جۆری فەلسەفەی پەیوەندیدار بە بوونگەراییەوە.

### ١-*بوونگەرایی چییە؟*

کاتێ دەمانەوێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: "بوونگەرایی چییە؟" ڕووبەڕووی جۆرێك لە ئاڵۆزی دەبینەوە، ئەم کێشەیەش لە سەرێکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو شتەی ئامانجی بووە وەکو فەلسەفەیەکی جیددی سەیر بکرێ، زۆرجار دابەزیوەتە ئاستی "مۆد"ەوە و وای لێهاتووە نازناوی "بوونگەرا – وجودی" دراوەتە پاڵ کەسان و کارو کردەوەی وەها کە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە فەلسەفەی بوونگەراییەوە نییە، ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو پەیوەندییەش هەبێت.

هەروەکو ژان پۆل سارتەریش وتوویەتی: "ئێستا ئەم وشەیە بەشێوەیەکی وا ناڕێك بەسەر هەموو شتێکدا دادەبڕن کە وای لێهاتووە هیچ مانایەکی نەماوە"[1]. بەڵام لەسەرێکی تریشەوە؛ کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جۆرێك لە ئاڵۆزی لەناو خودی بوونگەرایی خۆشیدا هەیە. لایەنگرانی ئەم فەلسەفەیە نکووڵی لەوە دەکەن کە بتوانرێ ڕاستی *Reality* بخرێتە ناو وێنا و چەمکی وردەوە، یان لە ڕێبازێکی داخراودا قەتیس بکرێ. هەر لێرەشەوە سۆرین کیرکەگۆر کە باوکی بوونگەرایی نوێیە، ناوی مەغزاداری لە دوو کتێبی خۆی نا، کە ئەوانەش: "بڕگە فەلسەفیەکان" و "پاشکۆیەکی کۆتاییهێنی نازانستی"ن و لەگەڵ ڕێبازی گشتگیری فەلسەفەی هیگلیدا کەوتە ململانێوە. لەبەرئەوەی لە ڕوانگەی بوونگەراکانەوە بەردەوام شتەکان ڕێکوپێك

و سنووردار نین، ئەزموون و زانستی ئێمە هەمیشە بڕگەی تەواونەکراون و بەتەنها مەگەر ئەقڵێکی خودایی بتوانێت وەکو گشت "کل"ێك جیهان بناسێت، تەنانەت گەر ئەقڵێکی واش هەبێت؛ هێشتا هەر مەعریفەکەی لە کەلێن و کەلەبەر خاڵی نابێت.

بەڵام ئێمە نابێ لەوەدا زێدەگۆیی (مبالغە) بکەین کە بوونگەراکان بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەیان لە ڕێبازە میتافیزیکیەکان گرتووە، چونکە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان هیچیان لایەنگری ڕێبازێکی ئایینی نەبوون، یان تەنانەت هەندێکیان جۆرێك لە میتافیزیکای تایبەت بە خۆیان نەبووە.

هەروەکو "هیرمان دیم" دەڵێت: (ئەگەر کیرکەگۆر سەد ساڵ دواتر بژیبایە، واتە لەم سەردەمەی ئێمەدا کە بە شێوەیەکی کراوەتر لەوسا سەیری "ڕێباز" دەکرێ.. دەیتوانی ڕێبازێك لە دیالەکتیکی بوونگەرایانەدا دابمەزرێنێت کە لەگەڵ ڕێبازی هیگلیدا کێبەرکێی پێبکات)(٢). پۆڵ سپۆنهایم لێکۆڵینەوەیەکی نووسیوە کە تیایدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە: (پەیوەندییەکی سیستمئاسای ناوەکی لە نێوان ئەو بابەتە سەرەکیانەدا هەیە کە کیرکەگۆر بایەخی پێداون). گەرچی ئەم پەیوەندییە لە جۆرێکی تایبەتەو "ئەو جەختکردنەوانە هێمای بۆ دەکەن کە تانوپۆی زیندووی ئەم بایەخپێدانانە پێکدەهێنن.."(٣) مارتین هایدگەریش بڕوای وابوو کە ئەو شیکردنەوە بوونگەرایانانەی لە کتێبەکەیدا "بوون و زەمەن" ئەنجامی داون، مۆرکێکی زانستییان بەخۆوە گرتووە(٤). تۆماس لانگان حوکمێکی ڕاستی داوە کاتێ دەڵێت کە هایدگەر هەڵگری تێڕوانینی کەسی و نائەبستراکتی فەیلەسووفە بوونگەراکانە(بەبێ ئەوەی قوربانی بەو پەیوەندیسازی و مەنهەجیەتە بدات کە لەگەڵ شیکردنەوە فەلسەفییە سیستمدارە سوننەتییەکاندا هاوشانە)(٥). جگە لەوەش، زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان، گەرچی سیستمە میتافیزیکییە باوەکانیان ڕەتکردۆتەوە؛ بەڵام هەندێ حوکمیانداوە کە مۆرکی ئۆنتۆلۆژی و میتافیزیکییان بەخۆوە گرتووە.

هەرچۆنێك بێت ئەوە ڕاستە کە تیۆرەیەکی گشتی نییە هەموو بوونگەراکان پێوەی بەند بن و بۆ نموونە بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو بیروباوەڕە سەرەکییانەی کە ئایدیالیستەکان یان تۆماسیەکان (ئەوانەی سەر بە تۆماس ئاکویناس (١٢٢٥-١٢٧٤) بوون) لە قوتابخانەیەکی تایبەتیدا پێکەوە کۆدەکاتەوە، هەر بۆیەشە ئێمە لە ناونیشانی ئەم بەشەدا بوونگەراییمان بە "فەلسەفە" وەسف نەکردووە، بەڵکو گوتوومانە "شێوازێك لە فەلسەفاندن". هەر بۆیە بوونگەرایی شێوازێکە یان شێوەیەکە لە فەلسەفاندن کە ئەو کەسە بەرەو کۆمەڵێك بیروڕای تەواو جیاواز دەبات سەبارەت بە جیهان و ژیانی ئادەمیزاد. ئەو سێ بوونگەرا گەورەیەی ئێستاش باسمان کردن، واتە – کیرکەگۆر و سارتەر و هایدگەر– باشترین نموونەی ئەم جیاوازییەن.

بەڵام سەرباری ئەو جیاوازییە لە جیهانبینییاندا، ئەو لێکچوونەش لە نێوانیاندا دەبینینەوە لە شێوازی "فەلسەفاندن"یاندا کە دەشوبهێتە سەر لێکچوونی کەسانی ناو خێزانێك هەر ئەم شێوازە هاوبەشەش لە فەلسەفاندنیاندا وامان لێ دەکات پێیان بڵێین "بوونگەراکان".

کەواتە تایبەتمەندییە گشتیەکانی ئەم شێوازەی فەلسەفاندن چین؟ یەکەمین و دیارترین تایبەتمەندی ئەوەیە کە ئەم شێوازەی فەلسەفاندن لە مرۆڤەوە دەستپێدەکات، نەك لە سروشتەوە. فەلسەفەی "خود"ە نەك فەلسەفەی "بابەت". بەڵام

لەوانەشە بگوترێ کە ڕێبازی ئایدیالیزمیش هەر لە خودەوە دەستپێدەکات. لەبەرئەمە پێویستە هەڵوێستی بوونگەرایی زیاتر دیاری بکەین بەوەی کە خود لای فەیلەسووفی بوونگەرا بریتییە لە بوونەوەر بە تەواوی بوونییەوە، واتە ئەم بوونەوەرە بە تەنها خودێکی بیرکەرەوە نییە و بەس، بەڵکو کردەوەسازە و سەنتەری هەست و ویژدانیشە. کەواتە ئەو شتەی بوونگەرایی دەیەوێ تەعبیری لێ بکات ئەم ڕەهەندە کامڵەی بوونە کە ڕاستەوخۆ و بەرچاوانە لە کرداری بوون خۆیدا دەناسرێ. هەربۆیە هەندێ جار ئەم شێوازەی فەلسەفاندن وا دێتە بەرچاو کە دژ بە ئەقڵ بێت *Anti-intellectualist*. فەیلەسووفی بوونگەرا بە جۆش و خرۆشێکی تەواوەوە بیردەکاتەوە؛ وەك کەسێك کە لەناوجەرگەی ڕووداوەکانی بووندایە. میگیل دۆئۆنامۆنۆ دەڵێت (فەلسەفە بەرهەمی ئینسانیەتی هەر فەیلەسووفێکە. هەر فەیلەسووفێك مرۆڤێکە لە گۆشت و خوێن و ڕووی دەمیشی لە خەڵکانێکە کە هەر لە گۆشت و خوێنن. چ کاری فەلسەفاندنی و چ هەر کارێکی تریشی، هەر لە ئەقڵیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە ئیرادەو هەست و سۆز و گۆشت و خوێن و تەواوی ڕۆحی و تەواوی جەستەشیەوە، ئەو مرۆڤێکە دەفەلسەفێنێت..)[٦] گەرچی هەندێ لە بوونگەراکانی دی لە "ئۆنامۆنۆ" زیاتر بایەخیان بە ئەقڵ داوە، بەڵام هێشتا ئەوە ڕاستە کە هەموویان دەیانەوێ فەلسەفەکەیان لەسەر بنەمایەکی بوونگەرایانەی فراوان دابمەزرێنن و لە هەر جۆرە ئەقڵگەرایی *Rationalism* ێك یان ئەقڵپەرستی *intellectualism* یێکی بەرتەسك دوور بکەونەوە. وا پێویست دەکات دواتر بە وردەکارییەکی زیاترەوە قسە لەسەر چەمکی "بوون" *Existence* بکەین، بەڵام تەنانەت ئێستاش گەر بمانەوێ لە شەقڵی جیاکەرەوەی شێوازی فەلسەفاندنی بوونگەرایانە بگەین؛ دەبێ شتێك لەبارەی ئەم چەمکەوە بڵێین. ئەوە بوو پێشتر گوتمان کە ئەم فەلسەفەیە لە مرۆڤەوە دەستپێدەکات، مرۆڤ بەو پێیەی بوونەوەرێکە؛ نەك بەو پێیەی خودێکی بیرکەرەوەیە.

جەختکردنیش لەسەر بوون بەو مانایە دێ کە ئێمە ناتوانین "سروشتێك" یان "ماهیەت"ێك بۆ مرۆڤ دیاری بکەین و پاشان لە بارەیەوە ئەنجامگیری بکەین. دەشێ لە بنەڕەتدا هەر ئەم تێڕوانینە بوونگەرایانەش بێت کە خەسڵەتێکی ناجێگیرانەی پێ دەبەخشێت. بەو شێوەیەی کە سارتەر تەعبیری لەم مەسەلەیە کردووە؛ دەڵێت:بوونی مرۆڤ پێش ماهیەتی دەکەوێت، پاشان دەڵێت: "مەبەستمان لەوەیە کە لە پێشداو بەر لە هەر شتێك مرۆڤ هەیە و، ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوەو، دەچێتە ناو جیهانەوە، پاشان خۆی دەناسێنێت. هەروەکو فەیلەسووفە بوونگەراکان دەڵێن؛ مرۆڤ کە پێناسە ناکرێ؛ هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو لە سەرەتادا هیچ نییە. ئەو ناتوانێت شتێك بێت، مەگەر دوایی ببێت، ئەوساش بەو شێوەیە دەبێت کە خۆی خودی خۆی دروست دەکات"[٧].

ڕەنگە ئەم سەرنجانە بەس بن بۆئەوەی وێنەیەکمان سەبارەت بە شێوازی فەلسەفاندنی بوونگەرایانە لا هەبێت. لە بەشەکانی داهاتووشدا و پاش باسکردنی وردەکارییەکانی ئەم فەلسەفەیە لە شێوە جۆراوجۆر و پەرەسەندووەکانیدا، تێگەیشتنێکی کامڵترمان سەبارەت بەم شێوازەی فەلسەفاندن لا دەبێت.

### ٢-هەندێ بابەتی دووپاتکراوە لە بوونگەراییدا

وێڕای ئەوەی کە ئێمە وتمان بوونگەرایی شێوازێکە لە فەلسەفاندن زیاتر لەوەی بریتی بێت لە

کۆمەڵە دەستوورێك یان تیۆرەیەك، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەم ئاڕاستە تایبەتییە لە فەلسەفەدا جەختی زیاتر لەسەر هەندێ بابەت دەکات وەك لە هەندێکی دی، تەنانەت دەبینین ئەم بابەتانە لای زۆربەی بیرمەندە بوونگەراکان دووپات دەبنەوە. هەڵبەتە ئەم بابەتانە جیاوازن لەو بابەتانەی کە فەیلەسووفانی پێشین بەگوێرەی نەریتی فەلسەفی بایەخیان پێ دەدا. هەر بۆ نموونە، لە کاتێکا کێشەی لۆژیك "مەنتیق" و ئەپستمۆلۆژیا "تیۆرەی زانین" دوو کێشەی گەورەن لە قوتابخانە فیکرییە کۆنەکانی بەر لە بوونگەراییدا؛ دەبینین فەیلەسووفی بوونگەرا بە جۆرێك لە بەکەمزانییەوە ئەم کێشانە پشتگوێ دەخات. بگرە دەتوانین بڵێین کە هەندێ لە بوونگەراکان بە سووکایەتی پێکردنەوە چاو لەم کێشانە دەپۆشن و بە بابەتگەلێکی "ئەکادیمی"ی پەتیی دەزانن. بەڵام تەنانەت ئەو بوونگەرایانەش کە ناتوانین ئەم گلەییەیان لێ بکەین، زیاتر بایەخیان داوە بەو کێشانەی کە وا دێتە بەرچاو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤەوە پەیوەست بن، نەك ئەو کێشە تیۆری یان ئەبستراکتانە. دواتریش دەبینین کە هەندێ مەسەلە هەن کە لەلایەن بوونگەراکانەوە گرنگییان پێدراوە، بەڵام تا ئێستاش زەحمەتە ئەو بابەتانە بۆ فەلسەفە؛ بابەتی گونجاو بن.

ئەو بابەتانەی لای هەموو فەیلەسووفە بوونگەراکان جێی بایەخن بابەتگەلێکی وەکو ئەمانەن: ئازادی، هەڵبژاردن و بڕیاردان، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی. ئەم بابەتانەش گەوهەری بوونی تاکەکەس پێکدەهێنن، لەبەرئەوەی ئەوەی مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرەکانی تری سەر زەوی جیادەکاتەوە کردەوەی ئازادی و توانای پێکەوەنانی ئایندەیەتی و لە ڕێی بڕیاری ئازادانەو هەستکردن بە بەرپرسیارێتییەوەیە کە مرۆڤ خودی ڕاستەقینەی خۆی دەخوڵقێنێت. هەروەکو "جۆن ماکمواری"یش دەڵێت "خود بەو سیفەتەی بکەرە" دەستەبەری بابەتە سەرەکیەکانە لە فەلسەفەی بوونگەراییدا؛ لە کاتێکا کەلەپووری فەلسەفەی خۆرئاوا؛ بەتایبەتیش لە "دیکارت"ەوە؛ بایەخی بە خودی ناوەوە داوە، کە مەبەستیش لێی لێرەدا "خودی بیرکەرەوە"یە[٨].

ڕەنگە پێویست بکات ئەوە بڵێین کە لەو هۆیانەی وایکردووە توێژینەوەی بوونگەرایانەی بوونی تاکەکەس سنووردار بکات؛ ئەوەیە کە بەزۆری ئەم توێژینەوەیە سەبارەت بە تاکەکەسە. ڕاستە هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان یان نیمچە بوونگەراکان (وەکو مارتن بوبەر و گابریل مارسیل) بەو دواییە لە پێشڕەوانی لێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان کەسەکانن. هەروەها دەشێ زۆربەی فەیلەسووفە دیارەکانی بوونگەرایی "گەرچی بە قسەش بێت" لانی کەم بایەخ بەو ڕاستییە بدەن کە مرۆڤ وەکو کەسێك تەنها لە ناو کۆمەڵێك کەسدا بوونی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بایەخی سەرەکی بە تاکەکەسەکە دەدەن کە گەڕان بە دوای خودی ڕەسەنی خۆیدا، کرۆکی مانای بوونی تاکەکەسییەتی.

هەندێ بابەتی تریش هەن کەلای بوونگەراکان دووپات دەبنەوە، لەوانە: هەست بە کۆتابوون، گوناه، نامۆبوون، نائومێدی و مەرگ. ئەم بابەتانە لە فەلسەفەی سوننەتیدا بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدراوە، بەڵام لای فەیلەسووفە بوونگەراکان بە وردی قسەیان لەسەر دەکرێ.

لێرەدا ناتوانین بە سادەیی سەبارەت بە گەشبینی و بەدبینی بدوێین. هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان دان بە بەدبینیی خۆیاندا دەنێن، لە کاتێکا هەندێکی تریان باسی گەشبینی یان لانی

کەم باسی ئومێد دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا؛ پێدەچێ هەموویان دەرکیان بە توخمە تراژیکەکانی بوونی مرۆیی کردبێت.

ئازادیی مرۆڤ و هەوڵ و تەقەللای لە پێناوی گەیشتن بە بوونێکی تاکەکەسییانەی ڕەسەندا؛ ڕووبەڕووی بەرەنگاری و هەندێ جاریش تێکشکان دەبێتەوە. بەهەرحاڵ؛ هێندەی مەسەلەکە پەیوەندیی بە تاکەکەسەوە هەیە؛ بوون بە مەرگ کۆتایی دێت. دەشێ بڵێین کە لایەنی تراژیك لە بوونگەراییدا هەر لە خاڵی سەرەتاوە دەستپێدەکات، کاتێ بوونی مرۆیی بەرامبەر بە بوونی شتە بێ گیانەکان دادەنرێ. جاری وایە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو شێوەیەی بوون دەگاتە ڕادەیەك کە بوونگەرایی خەریکە شێوەی جۆرێك لە دوالیزم *Dualism* *[1] بەخۆوە دەگرێت. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە ڕووبەڕووبوونەوەکە زۆر توند نییە، هەر ناسینەوەی ململانێ و ئەزموونەکانی گوناه و نامۆبوون لەئارادایە، لەبەرئەوەی مرۆڤ لای فەیلەسووفی بوونگەرا هەرگیز بەتەنها بەشێك نییە لە گێتی *Cosmos*، بەڵکو بەردەوام لە پەیوەندییەکی گرژدایە لەگەڵ دونیایەکی پڕ لە ئیمکاندا بۆ ململانێیەکی تراژیك.

هەروەها لەوانەیە یەکێك لە حوکمەکانی وەچەکانی ئایندە ئەوەبێت کە درەوشاوەترین کاری فەلسەفەی بوونگەرایی و بەردەوامترینیان لە توێژینەوەیاندا بێت بۆ بابەتێکی دی کە تا ئێستاش لە نووسینەکانی بوونگەراکاندا دووپات دەبێتەوە؛ ئەویش: ژیانی عاتیفیی مرۆڤە، ئەمەش یەکێکە لەو بابەتانەی کە بەشێوەیەکی گشتی فەیلەسووفانی ڕابردوو پشتگوێیان خستووە، یان داویانەتە دەست دەروونناسی، بۆیە هەرکات جۆرە بەرتەسکەکانی ئەقڵانیەت *Rationalism* بەسەر فەلسەفەدا زاڵ بووە؛ هەست و سۆزە نائارامەکان و حاڵەتە دەروونیەکان و جۆش و خرۆشەکانی زەینی مرۆیی بە بابەتی ناشایستە بۆ ئەرکی فەیلەسووف لەقەڵەم دراوە، بگرە وەکو کۆسپیش لەبەردەم گەیشتن بە مەعریفەی بابەتیی نموونەیی سەیرکراوە. بەڵام بوونگەراکان باوەڕیان وایە کە هەر ئەم بابەتانەن وامان لێ دەکەن بە تەواوی بوونمانەوە بچینە ناو جیهانەوەو کۆمەڵێك شتی وا لەبارەیەوە فێربین کە زەحمەتە بە تەنها لە ڕێی بینینی بابەتیانەوە فێریان بین. فەیلەسووفە بوونگەراکان؛ هەر لە کیرکەگۆرەوە تا هایدگەر و سارتەر، کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی درەوشاوەیان خستۆتە بەردەستمان سەبارەت بە کۆمەڵێك حاڵەتی ویژدانیی وەکو: نیگەرانی و بێزاری و هێڵنج، ویستوویانە ئەوە پیشانبدەن کە ئەم حاڵەتانە لە مەغزای فەلسەفی خاڵی نین.

ئێمە لێرەدا ئاماژەمان بۆ هەندێ لەو بابەتانە کرد کە زۆرجار لەسەر لاپەڕەی نووسەرە بوونگەراکان دووپات دەبنەوە. دەشێ کەشفکردن و پەرەدان بەم بابەتانەش کە بە زۆری لە توخمە ویژدانی و مەیلە خرۆشێنەرەکانی ژیانی شەخسیەوە وەرگیراون؛ گەورەترین و گرنگترین هەنگاوی سەرکەوتووی بوونگەراکان بێت. بەڵام بێگومان لە پەنا ئەم بابەتانەدا؛ لەگەلێ بابەتی تریشیان کۆڵیوەتەوە، کێشەکانی زمان و مێژوو و کۆمەڵگا و تەنانەت مەسەلەی هەبوون *Being* یش بووەتە باسی ئەم یان ئەو فەیلەسووفی بوونگەرا و ئاسۆی فراوانی تیا کردۆتەوە. بەڵام باس وتوێژینەوەکانی بە هەرچییەکی گەیاندبێت، دەبینین کە ئەم فەیلەسووفە بوونگەرایە دواجار هەر لە پەیوەندییەکی توند و تۆڵدا دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەو مەسەلە شەخسییە سەرەکییانەی کە پێشتر لێیان دواین.

### ٣- جۆراوجۆری لە نێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا

گەرچی ئێمە سەرنجی خوێنەرمان بۆ ئەوە ڕاکێشا کە ناومان نا "لێکچوونی خێزانی" لە نێو بوونگەراکاندا؛ هەروەکو لە شێوازی فەلسەفاندن و لەو بابەتانەدا دەبینرێ کە لێیاندەکۆڵنەوە. بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە بە هەمان ڕادە جیاوازیش لە نێوانیاندا هەیە. لە ڕاستیشدا شتێکی ئاسان نییە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسووفان بدۆزینەوە کە ئامادەبن دان بەوەدا بنێن کە بوونگەران، هەروەها ئەوانەی کە ئێمەش بە بوونگەرایان سەیر دەکەین، گەرچی بەو ناولێنانە قایل نین، ناتوانین بڵێین کە بە مانای باوی وشە "قوتابخانە"یەك پێکدەهێنن. ئەوە بوو پێشتر سەرنجی ئەوەماندا کە سارتر چۆن گلەیی لەوە دەکات کە وای لێ هاتووە "بوونگەرایی" لە هەموو مانایەك داماڵراوە. گەرچی هایدگەر و یاسپەرز و مارسیل بە دڵنیاییەوە ناویان لە هەر لێکۆڵینەوەیەکدا دێت کە سەبارەت بە بوونگەرایی بێت، بەڵام هەموو ئەمانە نازناوی بوونگەرایی ڕەتدەکەنەوە. "ڕۆجەر. ل. شین" سەرنجی ئەوەی داوە کە "هەر بوونگەرایەك ڕێز لە خۆی بگرێت؛ نایەوێ پێی بڵێن بوونگەرا، لەبەرئەوەی کە وتی "من بوونگەرام" واتە "من یەکێکم لەو دەستەیە لە خەڵك کە بە بوونگەرا ناسراون" لەکاتێکا بوونگەرای ڕاستەقینە دەیەوێ بڵێت: "من بریتیم لە خودی خۆم – و پێم خۆش نییە خۆتان ماندوو بکەن و پۆلێنم بکەن.."[٩]

بەڵام ئەو نووسەرانەی کە دەربارەی بوونگەرایی دەنووسن، زۆربەی کات ئاماژە بۆ دابەشکردنی ئەم فەیلەسووفانە دەکەن بۆ بوونگەرایانی مەسیحی و بوونگەرایانی بێ باوەڕ؛ وەکو بەڵگەیەك بۆ جیاوازی لەم شێوازەی فەلسەفاندندا. بەڵام گەر ئەوەش ڕاست بێت کە لەناو بوونگەراکاندا هەم جۆری مەسیحیی باوەڕدار و هەم بێ باوەڕ هەیە؛ ئەوا ئەم دابەشکردنە زۆر یاریدەمان نادات لەو فەیلەسووفانە بگەین؛ لەبەرئەوەی ئەم دابەشکردنە ئاسانکردنەوەیەکی زیاد لە پێویستە، چونکە هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا (یان فەیلەسووفی مەیلدار بەلای بوونگەراییدا) هەن کە ناخرێنە چوارچێوەی ئەم پۆلێنکردنەوە، بۆ نموونە یەکێکی وەکو مارتین بوبەر *M.Buber* جوولەکەیە، هایدگەریش لافی ئەوە لێدەدات کە نە باوەڕی بە خوا هەیە و نە باوەڕیشی پێ نییە. بگرە لەوەش زیاتر؛ دابەشکردنی بوونگەراکان بۆ مەسیحی و بێ باوەڕ ئەو ڕاستییە گرنگە فەرامۆش دەکات کە پەیوەندیی نێوان فەیلەسووفی بوونگەرا و مەسیحیەتەکەی، یان بێ باوەڕییەکەی؛ عادەتەن پەیوەندییەکە مۆرکی ناودژێتی "مفارقە – *pardox*" بەخۆوە دەگرێت، واتە پەیوەندییەکە تێکەڵ لە خۆشەویستی – و ڕق، کە توخمی باوەڕ و بێباوەڕیشی تیا کۆبووەتەوە.

با بۆ تاوێك لە هەڵوێستی هەریەك لە کیرکەگۆر و نیچە رابمێنین: عادەتەن کیرکەگۆر بە فەیلەسووفێکی بوونگەرای مەسیحیی گەورە لە قەڵەم دەدرێ و هیچ گومانێکیش لە پەیوەندیی پڕ جۆش و خرۆشی ئەو بە ئیمانی مەسیحییەوە ناکرێ. بەڵام لە هەمانکاتدا و بە هەمان ڕادە دوژمنایەتیەکی بەجۆش و خرۆشیش لای ئەو دەبینینەوە لەگەڵ شێوە باوەکانی مەسیحیەتدا لە سەدەی نۆزدەیەمدا، کە بەڕای ئەو دابەزیونەتە ئاستێکی نزمەوە. ئەم دوژمنایەتیەش دەگاتە لووتکە وەختێ هێرشێکی سەرتاسەری دەکاتە سەر ئەو کڵێسایەی کە ئەو دەیناسی، ئەوەتانێ دەڵێت: "ڕەگوڕیشەی هەموو مەسیحیەتێك وا لە ناودژێتیدا *Paradoxical*، ئیدی مرۆڤ لەبەرئەوەی باوەڕدارە قبوڵیدەکات، یان لەبەرئەم

ناودڕێتییەی ڕەتیدەکاتەوە. ئەسپی ڕەسەن و پڕتاو؛ وەختێ عەرەبانچییەکی ناشی بەکرێ دەیگرێ و سواری دەبێت؛ چیدی غیرەتی لانامێنێت و شانازی بە عەرەبانەکەیەوە ناکات"[١٠] خۆ ئەگەر کیرکەگۆری بوونگەرای مەسیحی، هەڵوێستێکی ناودڕێتیئاسای ناڕوونمان بۆ بخاتە ڕوو، ئەوا دەتوانین لای نیچەش پەیوەندییەکی تێکەڵ لە "خۆشەویستی – ڕق" ببینینەوە. باوەڕنەهێنانی بە مەسیحیەت و نکوڵیکردنی لێی بەهەمان ئەندازەی تەقەللاکەی کیرکەگۆر لە پێناوی ئیماندا؛ ڕاستگۆیانە و بەجۆش و خرۆش بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا مەسیحیەت کاریگەرییەکی ئەفسووناویی لەسەر ئەو هەبوو. وەکو کارل یاسپەرزیش ئاماژەی پێداوە: وێڕای هێرشە دڕندانەکانی نیچە بۆ سەر مەسیحیەت؛ بەڵام جۆرێك لە دوودیوی *Ambiralence* لە تێڕوانینیدا دەبینینەوە: "دوژمنایەتیکردنی ئەو بۆ مەسیحیەت وەکو ڕاستییەك و وابەستەیی پێیەوە وەکو بەڵگەنەویستێك لێك جیاناکرێنەوە، ئەو خۆیشی بە چاوێکی پۆزەتیڤانەوە دەیڕوانییە ئەم وابەستەییە و نەك هەروەکو شتێك کە پێویستە ڕزگاری بێت لێی"[١١].

ڕەنگە بتوانین بڵێین کە لای زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان کۆمەڵێك توخمی کەلەپووری ئایینی یان کەلتوورییان لە هزری بوونگەرایاندا تێکەڵ بووە، یان بگرە ئەو توخمانە بۆ فەلسەفاندن هانیداون. ئەوەتا سەرباری ئەو ڕەخنە توندوتیژ و زۆرانەی کە کیرکەگۆر ئاراستەی "لۆتەر"ی کردوون؛ بەڵام ناتوانین بوونگەراییەکەی لە ڕێبازی پرۆتستانتی جیابکەینەوە. هەروەها فەلسەفەکەی مارتین بوبەریش تێکەڵ بە کەلەپووری هاسیدی *Hassidic* [*٢]ی یەهودی بووە، هەروەها ڕەگوڕیشەی بوونگەراییەکەی دۆستۆیڤسکی و بێردیاییڤ بە قووڵی ڕۆچووەتە ناو ڕۆحی ئەرتۆدۆکسی ڕووسیەوە. پەیوەستبوونی "ئۆنامۆنۆ"ش بە "دۆن کیشۆت" و "دۆن کیشۆتی"یەوە بەشێوەیەکی گشتی؛ هێندەی پەیوەستبوونێکی بوونگەرایانەیە؛ ئەوەندەش پەیوەستبوونێکی ئیسپانیانەیە. هەربۆیە ئەو جۆراوجۆرێتییە دەوڵەمەندەی لای ئەم کەسانە دەیبینینەوە ڕەنگدانەوەی جۆراوجۆرێتیی ئەو زەمینانەیە کە لەناویاندا وەڵامی پەیامە فەلسەفیەکانی خۆیانیان داوەتەوە.

بەردەوام لە کەلەپووری کاسۆلیکی ڕۆمانیدا توخمێك هەبووە سەر بە سانت ئۆگەستین و توخمێکی تریش سەر بە تۆماس ئەکویناس، دەشێ ئەمەش لە پەیدابوونی بوونگەرای کاسۆلیکی وەکو گابریل مارسیل دا یارمەتیمان بدات. وشەی "بوونگەرایی" لە هەندێ کۆڕ و کۆبوونەوەی کاسۆلیکدا باونەبووە؛ بەتایبەتیش پاش بڵاوبوونەوەی گوتە دوژمنکارانەکانی بڵاوکراوەکەی پاپا پیوسی دوانزدەیەم لە ١٩٥٠دا لەژێر ناوی "سەبارەت بە ڕەگەزی مرۆیی"[*٣]دا.

لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرە کاسۆلیکە ڕۆمانییەکان کاتێ باس لە ڕێبازی کەسێتی گەرایی *personalicm* [*٤] دەکەن، جۆرێك لە فەلسەفەیان لەبەرچاوە کە ئەوەندە لە بوونگەراییەوە دوور نییە.

بەڵام کارل یاسپەرز و مارتین هایدگەر تاڕادەیەك لە بوونگەراکانی دی جیاوازن، ئەمانە مەسیحی نین بە مانا باوەکەی ئەم وشەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا بێباوەڕیش نین. یاسپەرز پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ جۆرێك لە ڕێبازی کراوەی پرۆتستانتی لیبراڵ هەیە. بەڵام پێدەچێت وەسفکردنەکەی خۆی باشترین دەربڕین بێت بۆ ئەو دۆخەی کە پێی دەڵێت "ئیمانی فەلسەفی". بەڵام لە

هەڵویستی "هایدگەر"دا بۆ بوون کۆمەڵێك توخمی تەسەووف و ئیستاتیکی دەبینینەوە[١٢]. هەرچۆن هایدگەر ماوەیەك پەیوەندی بە نازییەکانەوە کرد، گەرچی تا ئەندازەیەك دەکرێ هۆی ئەوە بگەڕێنرێتەوە بۆ کاڵبوونی هوشیاریی سیاسیی ئەو، بەڵام نکووڵی لەوەش ناکرێ کە هەندێ توخم هەن لە هزری ئەودا کە دەشێ بە ئاراستەی گونجاو لەگەڵ ناسیونالیزمی ئەڵمانیدا پەرەیان پێبدرێ[١٣].

کاتێکیش دەگەینە لای فەیلەسووفانێك کە بە ئاشکرا دان بە بێ باوەڕیی خۆیاندا دەنێن؛ وەکو سارتەر و کامۆ؛ پێدەچێ گەیشتبینە بوونگەرایی لە پەتیترین شێوەیدا. چونکە لەوە دەچێت ئەم دووانە بە ڕەتکردنەوەیان بۆ هەر مەسەلەیەکی ئایینی، سەربەخۆیی تەواو و بەرپرسیارێتیی تەواوی تاکەکەسیان بەدیهێنابێت. بەڵام تەنانەت لێرەشدا ناودژێتی دەبینینەوە: بۆ نموونە پەیوەندیی سارتەر لەگەڵ مارکسیزمدا چۆن لێکبدەینەوە؟ ئەم پەیوەندییە هەم پۆزەتیڤە و هەم ڕەخنەگرانەشە، گەرچی بەڕواڵەت زۆر بەجۆش و خرۆش نییە، بەڵام لە پەیوەندییەکەی کیرکەگۆر بە مەسیحیەتەوە کەمتر ناودژێتیئاسا نییە.

دواتریش دەتوانین پرسیارێکی گرنگ بکەین: ئایا بوونگەرا دەتوانێ پێمان بڵێت کە ئاخۆ وەدیهێنانی خودی ڕەسەنی مرۆڤ لە ڕێی هەڵبژاردنییەوە بۆ مەسیحیەت یان مارکسیزم و یان بێباوەڕی و یان تەنانەت نازیەت، مەسەلەیەکی پەسەندکردنی تاکەکەسییە؟ دەشێ بەلای تۆوە هەڵبژاردنێك ڕاست بێت لە هەڵویستی تایبەتی خۆتدا، لە کاتێکا دەشێ هەڵبژاردنێکی دی بۆ من ڕاست بێت لە هەڵویستی تایبەتی خۆمدا. بە دڵنیاییەوە هەندێ لە بوونگەراکان لە وەڵامدانەوەیاندا بۆ ئەو پرسیارەمان؛ لەم وەڵامەی دوایی نزیك دەبنەوە. ئەوان هەموو دان بە ڕێژەیی (یا نیسبیەت)ی هەڵویستەکاندا دەنێن. لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر گومان لەوە دەکەم کە ئەمە بە تەنها مەسەلەی پەسەندکردنێکی شەخسی و ڕەسەنێتییەکی تاکەکەسی بێت، گومانیشم هەیە لەوەی کە کەسێکی خاوەن هەڵویستی لەمجۆرە هەق بدات بە خۆی و ناوی فەیلەسووف لە خۆی بنێت، فەلسەفە پێویستی بە تێفکرینە، سارتەریش بۆ نموونە هۆیەکانی بێباوەڕیی خۆیمان پێ دەڵێت، هەرچۆن یاسپەرزیش لە ڕێی شیکردنەوەیەکی سەرسوڕهێنەوە "ئیمانی فەلسەفی"ی خۆیمان بۆ دەخاتە ڕوو، تەنانەت گەر بشوترێ کە ئەم ئیمانە ناسەلمێنرێ.

کاتێکیش تۆ ڕێگە بە پاساوەکانی دڵ دەدەیت قسەی خۆیان بکەن؛ ئەمە مانای ئەوە نییە کە تۆ بە تەواوەتی دەسبەرداری حوکمەکانی ئەقڵ دەبیت، یان هەموو دیدگاکان لە ڕووی بەهاوە وەك یەك سەیر دەکەین. ئەو ڕاستییەش کە جیاوازیی زۆر لە نێوان دیدگای ئەو فەیلەسووفانەدا دەبینینەوە کە پێیان دەوترێ بوونگەراکان، ئەوە پیشاندەدات کە بوونگەرایی لە چارەسەرکردنی کێشە میتافیزیکی و ئۆنتۆلۆژیەکاندا؛ ڕێگایەکی کورت ناگرێتە بەر. ئەمەش حەقیقەتێکە کە بوونگەراکان بە هەستی بەرپرسیارێتی و بە هوشیارییەوە دەرکی پێ دەکەن، هەربۆیە هەوڵ و تەقەللا فەلسەفیەکانیان لە سنووری پێداویستییەکانی تاکەکەس و ئەو شتانەدا ناوەستێت کە تاکەکەس پەسەندی دەکات.

### ٤-*بوونگەرایی و دیاردەناسی*

***(فینۆمینۆلۆژیا** Phenomenology)*

زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان باوەڕیان بە فینۆمینۆلۆژیا (دیاردەناسی) هەیە، گەرچی زۆر لە

دیاردەناسەکان هەن کە بوونگەرا نین. هۆی ئەم پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان ئەم دوو جۆرەی فەلسەفەش ئەوەیە کە پێدەچێ دیاردەناسی ئەو میتۆدی لێکۆڵینەوەیە بخاتە بەردەست بیرمەندی بوونگەرا کە لە توێژینەوەکانیدا دەربارەی بوونی مرۆیی پێویستی پێیەتی.

وشەی دیاردەناسی/ فینۆمینۆلۆژیا لە فەلسەفەدا مێژوویەکی درێژی هەیە، هەندێ جار کانت – *Kant* بەکاریهێناوە بە مانای لێکۆڵینەوەی دیاردەکان *Phenomena* یان ڕووکەش *Appearance* بەرامبەر "شتەکان لە خودی خۆیاندا" کە بە گریمانەی ئەو لە پشتی دیاردەکانەوە خۆیان حەشارداوە*٥. هەر چۆن "هیگل"یش لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "دیاردەناسیی ڕۆح – *Phenomenology of Mind*" ئەم وشەیەی بەکارهێناوە بە مەبەستی خستنەڕوویەکی وردی دەرکەوتنە "تەجەللا"کانی ڕۆح یان ئەقڵ، کاتێ بەشێوەیەکی دیالەکتیکی خۆی لە هوشیارییەکی هەستیی ساویلکانەوە لە سادەترین ئاستیدا؛ بەرەو دەرك کردن و تێگەیشتن و کۆمەڵێك شێوەی هوشیاری تا دەگاتە بەرزترین چالاکیە رۆحی و ئەقڵیەکان؛ دەبات.

لە دواتریشدا وشەی "دیاردەناسی" دابڕا بەسەر ئەو فەلسەفەیەدا کە "ئەدمۆند هۆسێرل"*٦ لە نووسینە جۆراوجۆرەکانیدا پەرەی پێدا کە دەشێ گرنگترینیان کتێبی "بیروڕاکان، دەروازەیەکی گشتی بۆ دیاردەناسیی پەتی". "هۆسێرل" ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بەڕاستی *Reality* یەوە، یان بە دروستبوونی بابەتەکانی هوشیاری، وەلای نان یان خستنییە "بەینی دووکەوانە"وە، هەوڵیدا میتۆدێك بۆ وەسفێکی وردو درشتی جۆرە جیاوازەکانی بابەت لە ماهیەتی پەتیی خۆیاندا؛ دابمەزرێنێت. لێرەدا نامانەوێ بەوردی باسی ڕێبازی دیاردەناسی بکەین لای هۆسێرل. بەڵام تەنها پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە کرۆکی ئەم ڕێبازە "وەسف"ە، لەبەرئەوەی وەسفێکی وردی ماهیەتی دیاردەمان بۆ دەکات بەو شێوەیەی کە بە هوشیاری دەدرێ. بۆ دڵنیابوونیش لە وردیی وەسفەکە پێویستە بەر لە هەموو شتێك هۆش لە تەواوی پێشگریمانەو پێشداوەرییەکان پاك بێتەوە. هەروەها پێویستە هۆش لە ناو سنووری وەسفدا بمێنێتەوەو بەرامبەر مەیلی چوون لە وەسفەوە بۆ ئەنجامگیری بەرەنگاری بکات.

کاتێکیش ئەم سەرنجانە ڕەچاو دەکەین بۆمان دەردەکەوێ کە دیاردەناسیی پەتی کارێکی گەلێك سەختە و پێویستی بە دیسپلینێکی ئەقڵیی ورد هەیە: مرۆڤ چۆن دەتوانێ دڵنیا بێت لەوەی کە توانیویەتی تەواوی پێشگریمانەکانی خۆی سەبارەت بە بابەتێك لە هۆشی خۆی دوور بکاتەوە؟ یان چۆن دڵنیابێت لەو خاڵەی کە تیایدا وەسف دەگاتە کۆتایی و ئەنجامگیری یان لێکدانەوە دەستپێدەکات؟ لە ڕاستیدا "هۆسێرل" پەرەی بە میتۆدۆلۆژیایەکی سەخت و ئاڵۆز دا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو دژواری و کۆسپانەی کە دێنەڕێی گەیشتن بە مەعریفەیەکی پەتی و ورد.

کارەکانی "هۆسێرل" کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا کردووە. هەر بۆ نموونە هایدگەر یەکێك بووە لە قوتابیەکانی لە زانکۆی فرایبۆرگ و کارە گەورەکەی خۆیشی، واتە "بوون و زەمەن"ی پێشکەش بە مامۆستا کۆنەکەی کردووە. بەڵام نە "هایدگەر" و نە فەیلەسووفە بوونگەراکانی تریش فینۆمینۆلۆژیایان بەو شێوەیە وەرنەگرت کە خۆی دەیوتەوە. بەڵکو بوونگەراکان پەرەیان بە جۆرێك لە فینۆمینۆلۆژیا داوە کە خزمەتی مەبەستەکانیانی کردووە. لە

بیربکەرەوە ئەگەر ئێمە لە نەرویج بمانەوێ ئەدەبی ئیسلامی بمەسیحێنین؟

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار پێشەکی نووسینێك لە جێگەی خۆیدایە، بە واتایەك کە ڕۆمانێك لە تەوەرەی کولتورێکی ترەوە بخرێتە نێو کولتورێکی دی بەهۆی خزمایەتی وشەوە، ئەوەش دەبێت لە هەندێ حاڵەتدا بۆ ڕوونکردنەوە و تێبینیەکان پەراوێز بەکاربهێنرێت.

ئەگەر لە دەقە عەرەبیەکەدا چەند بەشێکیان لە فەیلەسوفە عەرەبەکان خستبێتە سەر، لەو باوەڕەدام ئەوە موشکیلە نییە، بەڵێ لەوانەیە (پاشکۆیەك) (ئیزافەیەك) لەو باوەڕەدام بیرمە کە دەزگای چاپەمەنی (دار المنی) لە ستۆکهۆڵم داوای ڕوخسەت و ڕێگەپێدانی لێکردم بۆ چەند ئیزافەکارییەکی لەو جۆرە هەتا خوێندەوارانی دنیای عەرەبی باشتر پێك بگەنەوە. ئەو ئیزنەیان وەرگرت.

*+ وەرگێڕە کوردەکە د.حوسێنی خەلیقی، مامۆستای مێژووی فەلسەفە بووە لە تاران بەرلەوەی ببێتە دانیشتووی سوید، ڕۆمانەکەی لە زمانی عارەبیەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی پاش ئەوەی دەقە لێزیادکراوەکانی کە لە دەقەکانی سوید و ئینگلیزی و نەرویجیدا نین، لێدەرهێناوە. لە پێشەکیەکەیدا خوێنەران وا ئامۆژگاری دەکات، کە نابێ بکەونە داوی ئەفساناوی ڕۆمانەکەوە. بە جۆرێکی وا کە لە ناوەڕۆکە فەلسەفیەکەی دابڕێن. ئایا ئەمە سەخت نییە بۆ خوێنەوارانی لاو و فەیلەسوفە بێ ئەزموونەکان کە بتوانن پەیڕەوی لەم ئامۆژگارییە بکەن؟*

—کەواتە د. خەلیقی هەوڵیداوە و تێکۆشاوە کە مەودای بابەتی دنیای سۆفی تەواو هەروەکو ئەوە بێت کە لە چاپە نەروویجیە ئەسڵەکەیدا هەیە. بەلای منەوە ئەمە شایانی ستایشە. وە ئەگەر بابەتێکی تر بهێنرێتە ناوەوە، دەشێ ئەوە ڕوونکرێتەوە لەلایان بڵاوکەرەوەوە بەهۆی پێشەکی نووسینەوە یان پەڕاوێزەوە. کاتێك ڕۆمانێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر وەردەگێڕدرێ، نابێ دەقەکەی بە ئانقەست بگۆڕدرێت. لەو حاڵەتەدا دەبێت لە خاوەنەکەی پرسیار بکرێت، واتە لە نووسەرەکەی ئیزن وەربگیردرێت بۆئەوەی گۆڕانکاری سووکە و ساکاری تێدا بکرێت لەبەر (هۆی کولتوری).

ئامۆژگارییەکەی د. خەلیقی لەبارەی نەکەوتنە نێو داوی ئەفساناوی ڕۆمانەکەوە دەبێ خەتای ئەم جۆرە جیاوازییە کولتوریانە بێت. بۆ خوێنەرێکی ئەوروپای ڕۆژئاوایی من لەو باوەڕەدا نیم سەخت بێت ئەفسانەێتی ڕۆمان (تانەو تەشەری ئەفسانە) جیاکاتەوە لە ناوەڕۆکە فەلسەفیەکە.

*+دەتوانین بڵێین ئەسڵەن باوکی زانست فەلسەفەیە، چۆن دەڕواننە پەیوەندی نێوان زانستی نوێ و فەلسەفە؟ ئایا فەلسەفە هەتا ئێستا بایەخێکی ئەوتۆی هەیە بۆ زانست؟ ئایا ڕاستە کە هەر لەسەرەوەختی (پلاتۆنەوە) ئەفلاتوونەوە هەتا ئەمڕۆ لەبارەی فەلسەفە و جوانکارییەوە —ئیستاتیکا— هەر هەمان ئەو پرسیارانەن کە ئاڕاستە دەکرێن؟*

—من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە فەلسەفە باوکی زانستەو لە ڕەوتی بەرەو ژووری مێژودا بینیمان کە چۆن لە یەکبینە زوربەی پرسیاری فەیلەسوفەکان خۆدەکێشنە نێو زانستی سروشت و بوون بە بابەت بۆ ئەزموونێکی شیکاریانە.

زنجیرەیەك پرسیاری بنچینەیی دەربارەی زانستی بوون (*ontologist*) ئیتر لەنێو فەیلەسوفاندا بە پلەیەکی تایبەتی باس و خواسیان لەسەر ناکرێ، بەڵام لە بەرزترینی گرینگەکانن لە نێو بابەتە

زانستیەکانی وەکو ئاسمان گەری (*astronomi*)، فیزیای ئەتۆمی (*nuclear physic*) کیمیای ئۆرگانی (*biochemistry*) و هتد.. زۆرینەی پرسیارە کۆنە فەلسەفیەکان دەربارەی ئەوەی کە ئاخۆ دەبێ رووەك و ئاژەڵ و مرۆ چی بن، ئەمڕۆ بەهۆی داروینیزمی نوێ و دۆزینەوەی چۆنیەتی پێکهاتە گەردیلەییەکان (*DNA- molekylet*) هتد (وەڵام دراونەتەوە). پرسیار دەربارەی چۆنێتی دروست بوونی گێتی و ڕێساکانی (*kosmolologi*) و پرسیار لە سروشتی گەردوون (*universets natur*) بونەتە بابەت بۆ شیکردنەوەی زانستی، زیاتر لە تیشکدانەوەی (*reflelesjon*) تێرامانی دوور لە ئەزموون.

تێرامان و یەکسەری دیمانەکەی دیمۆکریتس (*demokrits*) دەربارەی ئەوەی کە (دەبێ سروشت پێکهاتبێ لە چەند ژمارەیەك گەردیلەی (دابەش نەبووی) ڕادەدار یان وردیلەترین گەردی سەرەتایی) لەلایەن کیمیا و فیزیاوە پشتیوانی لێدەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا لەوە دەکۆڵدرێتەوە کە ئاخۆ دەبێ لە کۆتاییدا سروشتی وردیلەترین (جەوهەری) بنەچەی گەردیلە چی بێ.

ئێمە لە چەرخی بیستەمدا دیمان کە چۆن فەلسەفە زیاتر هۆشی خۆی داوە بە زمان و ئیستێتیکا، ئاکار و ڕامیاری. لەوانەیە گەورەترین سەرکەوتنی فەلسەفە لە سەردەمی نوێدا دەرکردنی "جاڕنامەی گشتی مافی مرۆڤ"ی نەتەوە یەکگرتوەکان بێت. پرسیارێکی وەختی ئەما گرنگ لە بەگێتی کردنی جیهاندا سەرهەڵدەدات ئەویش ئەوەیە کە ئایا بەشێوەیەکی سەرەکی تەنها قسەکردن لەسەر "ئازادییەکان" و "مافە"کان هیچ مانایەکی دەبێت؟

ئەی نابێ ئێمە لەسەر ڕێسا بنچینەییەکانی گێتی بۆ بەرپرسیارییەتی و ئەرکایەتی گفتوگۆ بکەین؟ لەوانەیە کاتی دەرکردنی "بانگەوازێکی هەمەکی بۆ ئیجبارکردنی مرۆڤ" هاتبێ. ئا لەم پەیوەندییەوە لەو باوەڕەدام کە فەلسەفە دەتوانێ رۆڵێکی گرنگ گەمە بکات.

من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم کە فەیلەسوفەکان هەر هەمان پرسیارەکانیان ئاڕاستەکردۆتەوە کە لە سەردەمی ئەفلاتوندا کراون. ئەو فەیلەسوفە فەرەنسیە دیکارت *Descartes* و فەیلەسوفە بریتانیەکان *Locke and Hume* لۆك و هیوم، وە ئەو دوو فەیلەسوفە ئەڵەمانیە کانت و هێگل (هیگل) *Kant, Hegel* هەتا رادەیەك پرۆژەیەکی فەلسەفیانەی تریان هەبووە لە چاو ئەفلاتووندا. وە فەیلەسوفی ئەڵەمانی *Karl Marx* کارڵ مارکس هەروەکو دەزانرێ ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ئەرکەکانی فەلسەفە بە تەنها لێکدانەوەی دنیا نییە، بەڵکو گۆڕینیشێتی.

*+بۆچی سۆفیا؟ ئایا هەر لەبەر ڕووناکی خستنەسەر ئەو داب و نەریتە باوك سالارییەی رۆژئاوایە کە تۆ ئەلبیرتۆ کنۆکسێت هەڵبژاردووە و خستوتە نێو ژیانی ئەو کیژۆڵەیەوە (سۆفیا) تا بە وانە فەلسەفیەکانی جاڕس و بێزاری بکات؟ ئایا سۆفیا نوێنەرایەتیی خولیا و تاسەی دەنگی ئافرەتانە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا؟*

–من هەمیشە پرسیارم لێدەکرێ دەربارەی ئەوەی کە بۆچی کەسی سەرەکی کتێبەکە کچە، وە ڕوودەدات کە من وا وەڵام دەدەمەوە: بۆچی نا؟ تەنها دوو ڕەگەز بوونیان هەیە. بەڵام ئەمجارەیان کەسی سەرەکی دەبوایە هەر کچێك بێت. ناوی سوفیا لەو ووشە یۆنانیەوە وەرگیراوە کە بۆ "دانایی، ژیری"، بەکاردەهێنرێ، وە ئەمەش چەمکێکی (زاراوەیەکی) ئافرەتانەیە.

وە زووتر لە مێژووی کلێسەی دیاناندا یەزدان لە شێوەی ئافرەتێکدا نمایش دەکرا – دەنوێنرا.

هاگیا سوفیا (*Hagia Sofia*) ئەو دانابیە پیرۆزە (یان ئەو ژیرییە موبارەکە) بوو بە ناوی ئەو کلێسە گوومەزییە گەورەیەی (پیزەنتیەکان) لە کۆنستەنتی نەۆپێڵ (ئەستەمبوڵ) دروستیانکرد. ئینجا ئێمە دەتوانین تێفکرین کە بۆچی "ژیری" چەمکێکی ئافرەتانەی هەبووە. دایمە کەمێك بەگاڵتەوە دەڵێم لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە ئافرەتان هەمیشە بەلایانەوە گرینگە هەوڵدەن بۆ تێگەیشتن لە هەندێ شت (ئەمە خودی جەوهەری ئەو پرسیارەیە کە فەلسەفە دەربارەی چی خەریکە"، لە کاتێکدا پیاوان هەمیشە گرینگترە بەلایانەوە کە (خەڵك) لێیان تێبگەن! بۆ ئەو "فەیلەسوفە ساختانەی" ئەسینا، ئەوانەی کە بە سۆفیستەکان ناودەبرێن، گرنگ بوو کە لێیان تێبگەن، کەچی سۆکرات (ئەو فەیلەسوفە ڕەسەنە) دانی بەوەدا نا کە ئەو لە زۆر شت نازانێت و لە هەمان کاتدا خۆزگەیەکی ئاگرینی بوو بۆ زیاتر تێگەیشتن – ئینجا دەتوانین بپرسین بۆچی ئافرەتە فەیلەسوفەکان زیاتر نەبوون لە نێو ڕەوتی مێژودا؟

من لەو باوەڕەدام کە زیاتر وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئافرەتان دووچاری چەوساندنەوە بوون لە دولایانەوە هەم وەك ڕەگەز و هەم وەك بوونەوەرانی بیرکەرەوە. ئافرەتان فرسەتیان پێنەدراوە فەلسەفە بخوێنن لەبەرئەوەی بە هیچ کلۆجێ مۆڵەتیان پێنەدەدرا بۆ ئەوەی بخوێنن.

ئەمڕۆ لە سەرانسەری زانکۆکانی دنیادا گەلێك فەیلەسوفی ئافرەتانە هەن.

*+لەو باوەڕەدایت کتێبەکانی وەکو جیهانی سۆفیا بتوانن کاربکەنە سەر پەروەردەکاران بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باشتر بەرنامەڕێژیی مێژووی فەلسەفە بکەن بۆ قوتابییەکانیان؟ مەبەستێکی وات هەبوو لە نووسینی ئەو ڕۆمانە؟*

–با کەمێك زیادەڕۆیی بکەم بەوەی دان بەوەدا بنێم وەکو من دەزانم و یاداشتم کردووە هەر پێشوەخت لە هەندێك وڵاتدا دنیای سۆفی گرنگیەکی تایبەتی دەستگیر بوو لە مێژووی فەلسەفەدا. هەر لە ڕاستیشدا لە زۆر وڵاتی دنیادا وەکو کتێبی فێرگوزاری لە قوتابخانەکاندا بەکاردەبرێ.

من دەبێت ئاشکرا و ڕوون بیخەمە بەرچاو کە دنیای سۆفیا نەبووە بە بۆشاییەکی خاڵی. ئەمەش هیچ بەڕێکەوت نییە کە ئەم کتێبە لەلایەن نەرویجیەکەوە دەنوسرێت.

ئێمە لە نەرویج خاوەنی داب و نەریتێکی دەوڵەمەندو تایبەتین لە بارەی بەنێوەندکردنی مێژووی فەلسەفەوە ئەوەش هەر لەبەرئەوەی کە هەموو قوتابیە نەرویجیەکان دەبێت لە تاقیکردنەوەیەکی ئامادەیی فەلسەفەدا ( *examen philosophicum*) سەرکەوتوو بن (بۆ ئەوەی لە دانشتگا وەربگیرێن). بەبێ ئەم دەستوورە باوە من نەمدەتوانی دنیای سوفیا بنووسم.

*+تۆ لە ڕێکخراوی (ئەنجومەنی نەرویجی بۆ مافەکانی کورد)دا ئەندامیت چۆن ئاشنایەتیت لەگەڵ مەسەلەی کوردا پەیدا کرد؟ بە بیروباوەڕی تۆ وەکو فەیلەسوفێك و نووسەرێك دەبێ کوردەکان چی بکەن تا بگەنە مافەکانی خۆیان؟ قەت چوویت بۆ کوردستان؟ ئەتوانی بیر لە سەفەرێك بکەیتەوە بۆ ناوچە سەربەخۆکانی کوردستان لە عێراق کە گەلێك کەس ئاواتەخوازن چاویان پێت بکەوێت، ئێستا پاش ئەوەی کتێبەکەت بە کوردی دەست دەکەوێت لە کوردستان؟*

–هەرگیز من پسپۆڕ نیم لە مەسەلەی کورددا. بەڵام من هێندە دەزانم بە باوەڕی خۆم تا تێبگەم کە کوردەکان خەڵکێکن بێ بەزەییانە چەوسێنراونەتەوەو تا ئێستاش لە ڕووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و کولتوریەوە هەر دەچەوسێنرێنەوە.

من لەو باوەڕەدام کە بۆ گەیشتن بە وڵاتێکی کوردی سەربەخۆ، کوردستانێك کارێکی درێژخایەن پێویستە. من زیاتر باوەڕم بە دیبلۆماسیەتێکی هێواش لەگەڵ یارمەتی و پشتیوانی لێکردنی خەڵك و وڵاتانی دنیا زۆرترە تا جەنگی گەریلا و ئەنجامدانی چالاکی لە ڕێی زەبر و زەنگەوە.

لەمەوپێش ڕووی داوە کە خەڵکێك بە ئازادی خۆیان گەیشتون بەبێ پێویست کردنی توندو تیژی بەکارهێنان. بۆ نموونە لە هیندستان و ئەوەی پێی دەگوترێ: شۆڕشی مەخمەڵ لە چیکیا و هەروەها من نەك هەر دوورەپەرێز لە توندوتیژی ڕادەوەستم، بگرە باوەڕێکی کەمم هەیە بە توندوتیژی بەکارهێنان وەکو ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە ئازادی و ئاشتی.

دڵم بۆ فەلەستینێکی ئازاد و سەربەخۆ لێدەدات، بەڵام لەو باوەڕەدا نیم کە توندوتیژی بەکارهێنان لەلایان فەلەستینیە پەڕگرەکانەوە خزمەتی خەڵکی فەلەستینی کردبێت.

بێگومان سەردانی کردنی ئەو ناوچە کوردییە سەربەخۆیەی عێراق گەلێ سەرنج ڕاکێشەرە. بەڵام یەکەم شت بابزانین بەڕێوەبەرایەتی – بوش چ پلانێکیان هەیە لە ناوچەکەدا. من هەست دەکەم دڵنیانیم ئەو پیلانەی بۆش هەیەتی بۆ عێراق لە خزمەتی خەڵکی کوردا بێت.

ئازاری ٢٠٠٣.

# هەڵبژاردەیەك لە (٥) گفتوگۆ لەگەڵ (فریدریش دۆرێنمات Friedrich Durrenmatt)دا

## ناساندنێکی چڕو پوخت و هەڵبژاردنی بەشێك لە چاوپێکەوتنەکانی

لە فارسییەوە: فرزند شێرکۆ

فرێدریش دۆرێنمات لە کەڵە ئەدیبەکانی زمانی ئەڵمانیە. (لەوێدا کە لە چەند وڵاتێکی جیاوازی ئەوروپادا بە زوبانی ئەڵمانی دەنووسرێت، نابێت (ئەدەبیاتی وڵاتی ئەڵمان) یا (ئەدەبیاتی ئەدیبانی ئەڵمانی) لەگەڵ (ئەدەبیاتی زوبانی ئەڵمانیدا بەشێوەیەکی گشتی) تێکەڵاو بکرێت).

ئەو لە ساڵی ١٩٢١ لە سویسرا لەدایك بوو و لە ١٩٩٠ دا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد. دۆرێنمات، بۆ خوێندکارانی زوبانی ئەڵمانی، ئەڵمانی ناسی، و ئەدەبیاتی ئەڵمانی یەکێك لە (پێویستیەکانە).

هەروەها دۆرێنمات لەلای خوێنەرە ئاساییەکانی ئەڵمانیا خۆشەویستە. بەرهەمەکانی بەگشتی، هێشتا لە ریزی پڕفرۆشترین بەرهەمەکانی زوبانی ئەڵمانیدایە. ناسراوترین و لەپێشترین بەرهەمەکانی، بە پلەی یەکەم، شانۆنامە و دواتر ڕۆمانە جینائیەکانیەتی، کە بەشێوەیەکی گشتی کراون بە فیلمی سینەمایی یاخود تەلەفزیۆنی.

لەپێشبوونی دۆرێنمات لەلای خوێنەرە ئاساییەکان و لە فەزای وڵاتە ئەڵمان — زوبانەکاندا، جگە لە چێژ و کێشکردن لە نووسینەکانیدا و تێکەڵکردنی خوێنەر لەگەڵ خۆیدا، پێکهاتەیەکی دەروونناسیانەی هەیە کە خوێنەر توشی دڵەڕاوکێ دەکات. وێڕای ئەمانەش هۆکاری قوڵی دیکەش هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بەم شێوەیە ریز بکرێن: زمانێکی سادە، روون، شیرین، بیستراو و پوخت لە نووسیندا بەکاردێنێت و لە ڕووی هونەری نوسینیشەوە، بەو مانایەی کە سەرەتا و کۆتایی نووسینەکەی ئاشکرا، ڕۆشن و شیاوی تێگەیشتنە و بە هیچ جۆرێك، لە هیچ کام لە داستانەکانیدا، هەوڵ نەدراوە کە بە زۆر یا بە هەر نرخێك، سەر و ژێری بەرهەمەکە بە فێڵ و تەڵەکەی هونەریی و نووسین،

بەیەك بگەیەنێتەوە و بە هەر شێوەیەك بێت داستانەکە تەواو بکات. لە کاتێکدا کە ئەم دیاردەیە هەندێك جار لە نووسەرە بەناوبانگەکانی دونیای ئەدەب و هونەریش بەدی دەکرێت. لە بەرهەمەکانی دۆرێنماتدا، کەسایەتیەکان، رووداوەکان، هەڵسوکەوت، ژینگە، گفتوگۆکان و بەگشتی کەش و هەوای داستانەکە، رووناك، مەنتیقی و بۆ خوێنەر بواری لێکدانەوە و تێگەیشتنی دروست و مەنتیقی دەرەخسێنێت. ئەم تایبەتمەندیانە، ئەندازە و جوانی (فەنتازیا) لە بەرهەمەکانی دۆرێنماتدا کەمناکاتەوە بەڵکو بەشێوەیەکی تێکەڵ و رێکوپێك پوختی و کامڵیەك دەبەخشێت بەو بەرهەمانە.

ئاشکرایە کە ئەو پێناسە و تایبەتمەندکردنانەی کە تائێستا کران لێهاتوویی و توانای هونەری ڕۆماننووسی، نووسەرێك بەرجەستە دەکەن. هەروەها ئاشکراشە کە ئەم کۆمەڵە سیفەتە باشانەی نووسەرێك، بەرهەم لای خوێنەر باش، پوخت و بەپێز دەکات. لە پێشیەکی دیکەی بەرهەمەکانی دۆرێنمات کە زیاتر لە نێوەندە ئەکادیمیەکاندا باسی لێوە دەکرێت، بنەما و پێکهاتەی فەلسەفی و دەروونناسیانەیە کە لە بەرهەمەکانی دۆرێنماتدا بەرچاون. ئەم تایبەتمەندیە پۆزەتیڤەی نووسەر زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کەسێتی خودی نووسەر تاوەکو بۆ پیشەی نووسەریی یان پێویستە ئەخلاقیەکانی نووسەرێك.

دۆرێنمات نووسەرێکی فەیلەسووف بوو کە زانیاری و شارەزاییەکی قوڵی لە بواری دەروونناسیدا هەبوو. بە گشتی مەبەست ئەوەیە کە لەبری شانۆنامە و ڕۆمان، گەر دۆرێنمات داڕشتنیشی بنووسیایە هەر لەسەر بنەمای فەلسەفی — دەروونناسی بەرهەمەکەی دادەڕشت.

لە کۆتاییدا کۆمەڵە تایبەتمەندێتیەکی دیکە، کە دۆرێنماتی لە ڕیزی پێشەوەی نووسەران دانا ڕۆشنبیری، ئاشتی خوازی و بیری مرۆڤدۆستی و بەرپەرچدانەوەی نەژاد پەرستی بوو کە لەم کەڵەنووسەرەدا بە تەواوی رەنگی دابۆوە کە لە ماوەی ژیانیدا لە سویسرا چەند جارێك لەسەر ئەم بیرانەی دوچاری کێشە بووەوە.

لەم بۆچوونە تایبەتەوە دەتوانرێت تاڕادەیەك دۆرێنمات لەگەڵ گۆنترگراس یا هاینریش بوڵ لە ئەڵمانیا بەراورد بکرێت.

هەرچەندە ئەمە لەسەر ڕای خوێنەر دەمێنێتەوە بەڵام لە ڕووی چۆنیەتیەوە هەرگیز دۆرێنمات لە ڕیزی گراسدا ناگونجێت و خۆی لەم بارەیەوە لە گاڵتەیەکی ئەدەبیدا دەڵێت: بە بۆچوونی من، گراس بێ ئەقڵترە لەوەی بتوانێت کتێبێ بنووسێت.

(*Groteske*) دەستەواژەیەکی ئەفسوناوی بوو لای دۆرێنمات کە زۆربەی شانۆنامەکانی بەمە دەستپێدەکرد. پێویستە بگوترێت کە زۆربەی شانۆنامەکانی کۆمێدی یا پێکەنیناوی بوون و وشەی (*Groteske*) مانای فەوزا، نالەبار، هەزەلی دەگرێتەوە. لە دونیای هونەر یاخود زانستی ئەدەبیاتیشدا ئەم دەستەواژەیە مانای (پووچی جیهان) دەبەخشێت. یا بەشێوەیەکی تر: جۆرێك لە پێڕابواردنێکی فەیلەسوفانەیە لەمەڕ نالەباریەکانی کۆمەڵگا.

دۆرێنمات لە زانکۆکانی (برن) و (زۆریخ) وانەی ئەدەبیات و فەلسەفەی خوێندبوو. ڕەنگە قۆشمەچێتێکەی دۆرێنمات بۆ باپیری بگەڕێتەوە کە شیعری رەخنەگرانەی تەنزئامێزی دەنووسی. باوکی قەشە بووە لە کەنیسەی پرۆتستان. دۆرێنمات جگە لە بواری نووسین لە بواری پەیکەرتاشی و نیگارکێشیشدا دەستی باڵای هەبووە.

لە ساڵی ١٩٨٦دا خەڵاتی گئورگ بۆشنەری بردۆتەوە، کە خەڵاتێکی بەناوبانگی ئەڵمانیە.

دۆرێنمات لە ٢٥ ساڵیدا دوچاری نەخۆشی شەکرە بوو و لە ساڵی ١٩٩٠دا و لە ١٣ی دیسامبەر، بە نەخۆشی دڵ (جەڵتە) لە ماڵەکەی خۆیدا گیانی سپارد.

## گفتوگۆ لەگەڵ دۆرێنماتدا

ئەم دەقەی لەبەردەستدایە، هەڵبژاردە و تێکەڵێکە لە (٥) چاوپێکەوتنی جیاجیا، کە بەگشتی هەمووی لە دواڕۆژەکانی ژیانی دۆرێنماتدا ئەنجام دراون. هەڵبژاردن و کورتکردنەوەیان لەلایەن وەرگێڕەوە بووە. ئەم هەڵبژاردن و ڕێکخستنە کە لەسەر بنەمای فراوانی پرسیار و جوانی وەڵامەکان و بە ئاگاداری (نووسەر) ئەنجامدراون کارێکی ئاسان نەبووە.

+لە شانۆنامەکانتدا، کۆمەڵ – کۆمەڵ مرۆڤ دەکوژرێن. تۆ لەبارەی خۆتەوە گوتووتە (ڕەشترین کۆمیدیا نووسێك کە هەیە). ئەم ئارەزووەی تۆ کە (کۆمێدیا) لەگەڵ (ترس)دا تێکەڵ دەکات لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟

–من هەمیشە لە شوێنێکدا دەکەومە پێکەنین کە خەڵکانی دی پێکەنینیان نایەت و بە پێچەوانەشەوە. دووری نێوان ئەو شێوازەی کە مرۆڤەکان تیایدا دەژین لەگەڵ ئەوەی کە دەبوو تیا بژین، بەردەوام پێکەنیناوی تر دەبێت. ئێمە لە سەدەی (مەینەتیە پێکەنیناویەکان) و کاریکاتێردا دەژین.

+ئایا سەرقاڵبون بە چەمکی مەرگەوە لە بەرهەمەکانتدا، پەیوەندی بە نەخۆشی شەکرەکەتەوە نییە؟

–ئەمە ئاساییە. کاتێك تۆ لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا تووشی نەخۆشی شەکرە ببیت. یەکەمین کارێك کە دەیکەیت ئەوەیە کە کتێبێکی پزیشکی بکڕیت. بەڵام ئیدی پێدەزانیت کە ئەم نەخۆشیە چارەسەر ناکرێت. واتە دەبێت تەمەنێکی لەگەڵدا بەریتە سەر. دواتر ئەو شتانەی کە لەسەر نەخۆشیەکە خوێندووتەتەوە، دەست پێدەکات. لە کاتی میزکردندا کاغەزی پشکنینی شەکرەکە سەوز دەبێت. ئەمە واتا (مەرگی سەوز). هەمیشە دێتە بیرتەوە کە تۆ نەخۆشیەکت هەیە کە دەبێت بە ناچاری لەگەڵیدا هەڵکەیت، نەخۆشیەك کە دەبێتە هۆی مردنت.

+ئەم نەخۆشیە چ کاردانەوەیەکی لەسەر ژیانی ڕۆژانەت جێهێشتووە؟

–ماندوێتی نەخۆشەکانی شەکرە، هەستێکە کە من زۆر هەوڵمداوە شیبکەمەوە بەڵام وشەیەکی شیاوم بۆی دەست ناکەوێت. ڕەنگە پێویست بێت زوبانی نوێی بۆ دابهێنرێت. ئەمانە کاتێك کارێکی جەستەیی دەکەن، هەست بە ماندوبونێکی تر دەکەن. من هەست بە ماندووبوونێکی دەروونی و بەردەوام دەکەم کە تەنها نووسین فریام دەکەوێت و یارمەتیم دەدات. کاتێك دەنووسم لە پڕێکدا ئەم ماندووێتیە ون دەبێت و، دواتر ترس دامدەگرێت کاتێك کە ئەم ماندووێتیە دەگەڕێتەوە.

+ ئەگەر نەخۆش نەبوویتایە ئایا هەر دەتنووسی؟

–ئەگەر نەخۆشی شەکرەم نەبووایە لەمێژبوو سەلامەتی کوشتبوومی.

+سەردەمانێك هەموو شەوێ دوو شوشە شەرابت دەنۆشی و مشتەریەکی بەردەوامی ڕێستۆرانتەکانی ئەم ناوچەیە بوویت.

–من مرۆڤێکی زۆر بەجوڵەم و دیارە شەکرەش جۆرێک وەستانە، مرۆڤ ناچار دەکات کە نەزمی هەبێت. نووسینیش زۆر لە ڕێکخستنی مرۆڤدا کارایە. ئەم نەزم و ڕێکخستنە هەمیشە لە بیر و مێشکی مرۆڤدا ئامادەیە.

+لە مردن دەترسیت؟

–ئیدی نا. باوەڕم وایە بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە کە بزانێت لە کۆتاییدا ناچاری مردنە. ئەگەر بەشێوەیەکی ژیان ناسیانە بڕوانینە ئەم بابەتە دەبینین کە خودی ئەم بابەتە بۆ مرۆڤ، هوشیاریەکی گەورەیە. ئاژەڵەکان ئەم هۆشیاریەیان نیە. لێکۆڵینەوە لە بابەتی مەرگ، ڕەگ و ڕیشەی کلتوورە. پێدەچێت مرۆڤ لە ترسی مەرگ پەنای بۆ زۆر شت بردبێت بەڵام دەبێت ئێمە بەشێوەی دیاردەیەکی سروشتی لە مردن بڕوانین، چونکە بەبێ مردن کامڵبوونێک بەدی نایەت.

+تۆ وتووتە: (ڕۆمانەکان هێند ماندووکەرن کە خوێندنەوەیان دەمکوژێت. ئەگەر ڕۆمانەکانی خۆم، خۆم نەمنووسیاسە هەرگیز نەمدەخوێندنەوە. هەر ترسی دووبارە خوێندنەوەو هەڵەبری کردنەکانیانم بەسە).. بۆ؟

–من زۆر بە وردی دەخوێنمەوە، لەبەر ئەمەیە ڕۆمانەکان بەلامەوە زۆر درێژن. ئەبێت دان بەوەدا بنێم کە هێشتا هیچم لە (پیتر هانتکە) نەخوێندۆتەوە و (تۆماس برێندهارد)یش تەنها لەرێی تەلەفزیۆنەوە دەناسم. بەگشتی هەر کتێبێک دەخوێنمەوە تیایدا دەچەقم، چونکە لە نیوەی ڕێدا دەگەڕێمەوە دونیاکەی خۆم.

+لە چ کاتێکدا دەخوێنیتەوە؟

–شەوانە تا کاتژمێر (٢) دەنووسم، دواتر تا سێ و چوار دەخوێنمەوە. زیاتر سەبارەت بە زانستی سروشتی یاخود فەلسەفەن، ئەوانەی دەیانخوێنمەوە هەتا ئەمڕۆ هیچ کتێبێک نەبووە کە من لە دەرەوەی جێگەی خەوەکەمدا خوێندبێتمەوە. ڕەنگە لەناو شەمەنەفەردا هەندێک جار بۆ ماوەیەکی کەم خوێندبێتمەوە.

+ئەمشەو چی دەخوێنیتەوە؟

–کتێبێک سەبارەت بە مەتەڵە شیکارنەکراوەکانی بیرکاری.

+ئایا جارجارەش تەماشایەکی کتێبەکانی خۆت ناکەیت؟

–هۆکارێکی وا نابینم کە پێویست بێت بەرهەمەکانی خۆم بخوێنمەوە جارجار شانۆنامەیەکی خۆم دەخوێنمەوە چونکە ئاسانتر و سادەتر لە ڕۆمانە.

+ئەوەی کە نووسەرێک کتێبەکانی زانستی سروشتی بخوێنێتەوە، شتێکی ئاوارتە (استثنائیة)یە.

–من هەمیشە سەیرم لەم بابەتە دێت چونکە لەمڕۆدا تەنها لە ڕێگەی شانۆنووسینەوە بێ گوێدانە زانستی سروشتی ناتوانیت لە دونیا بگەیت. ئەوەی لەمڕۆدا دونیا دەگۆڕێت سیاسەت یاخود هونەر نیە بەڵکو زانستی سروشتیە. ئەمەی دووەمیان، واتە زانستی سروشتی، لەمڕۆدا چارەنووسسازە. سیاسەت بە شەلەشەل بە دوایدا دەڕوات. سیاسەت بە سەختی هەوڵ دەدات کە بتوانێت زانستی سروشتی ئاراستە بکات. من ئەو نووسەرانەی کە بە ئاگاییەوە بایەخ بە زانستە سروشتیەکان نادەن، درک ناکەم. کەسێک کە تەنها بایەخ بە خۆی بدات و پشت بە ئەزموونە تایبەتیەکانی ببەستێت گەلێک زانست و زانیاری لەکیس دەچێت.

+دەفتەرێکت نیە بۆ نووسینەوەی بەسەرهاتی ڕۆژانە؟

–نەخێر. نووسین بۆ من وەها کارێکە کە ئیدی بە پێویستی نازانم ڕۆژیش (یا کاری ڕۆژانەش) باس و پێناس بکەم. من زۆر بەکەمیش نامە دەنووسم.

+سەبارەت بە خۆت گوتوتە: (من نابودم، کۆمێدیا نووسێکی لە ڕەونەق کەوتووم) بۆچی وازت لە نووسینی شانۆنامە هێناوە؟

–لە شانۆدا ئیدی دەورێکم نییە.

+بەڵام ئەمە جۆرە نازکردنێکە. لە دوو ساڵی ڕابردوودا، لە ٣٤ وڵاتی جیهاندا، ١١٧ جار شانۆگەریەکانت چوونەتە سەر شانۆ و پێشکەش کراون. بەم شێوەیە تۆ سەرکەوتووترین شانۆنووسی ئەڵمانی زوبانیت. ڕۆژێك نییە شانۆیەکی دۆرێنمات نەچێتە سەر سەکۆی شانۆ.

–شانۆنامەکانی من زۆرتر لە وڵاتەکانی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا نومایش دەکرێن. لەوێ پێیان وایە کە شانۆکانی من شانۆگەلێکی سیاسین بۆیە یەکسەر نومایش دەکرێن بەڵام بینەرەکانی ئەڵمانیا زیاتر بینەرگەلێکی ئەدەبین.

+تۆ ئەوەت ڕاگەیاندووە کە (ئاشتی جیهانی) دەتوانێت لە (جەنگ) پڕمەترسیتر بێت؟

–کێشەیەك کە ئێمە لەبەردەمماندایە و پێویستە چارەسەری کەین، ئاشتییە، چونکە جەنگ کاتێك خۆی دەنوێنێت کە مەسەلەی ئاشتی یا سوڵح، شیکار و هەرس نەکرابێت. ئێمە سەرقاڵی وێران کردنی جیهانی سێیەمین – خراپتر و توندتر لەوەی جەنگاوەرە مەسیحیەکان لە ماوەی شەڕی خاچپەرستاندا دەیانکرد – ژمارە دانیشتوانی جیهان خەریکە دەتەقێتەوە، گۆڕانکاری مەترسیدار و ئازاردەری کەش و هەوا چاوەڕوانمانە.

کەواتە ئەمانە نیشانمان دەدەن کە ئاشتی کاتی ئێستامان تایبەتمەندی مەرگهێنەریان لەخۆگرتووە کە لەلایەکەوە دەتوانێت شەڕی لێبکەوێتەوە و لەلایەکەوە لە شەڕیش خراپتر بێت.

+ئایا بە کۆتایی هاتنی (جەنگی سارد) سیمای کۆمەڵگەیەکی مەدەنی زیاتر بەرجەستە نابێت؟ یا مژدەی وەها کۆمەڵگەیەکی پێ نییە؟

–ئەوەی کە ئیتر دەست پێدەکات (شەڕی ئابوریە). شەڕ لەسەر (بازاڕی فرۆش) ڕەنگە بتوانرێت بگوترێت کە مارکسیزم زۆر بەر لە کاتی خۆی بەدیارکەوتووە.

+واتە تۆ بانگخوازی (ئابووری سۆسیالیستی)یت؟

–دووبارە بەرقەرار بوونی، لە ئایندەدا، ڕەنگە کارێکی حەتمی بێت. لە بارودۆخێکی وادا یاساگەلێکی نوێ و بێ بەزەییانە دادەتاشرێن. ژمارەی دانیشتوانی جیهان بەرەو ١٠ ملیار دەچێت. ئەمڕۆ زیاتر لە هەر زەمان و کاتێکی تر لە جیهاندا برسێتی ڕەنگ دەداتەوە و بوونی هەیە. بەڵام ئێمە ئاگامان لێی نیە چونکە زۆربەی نیگاکان ڕووەو کۆماری روسیایە.

+تۆ گوتوتە کە هەر بەرهەمێکی هونەری دەبێت ڕەنگ و بۆنی کارەساتی (ڕۆژی دوایی) لێ بێت. بۆچی؟

–مرۆڤ خۆی بۆ خۆی جیهانێکی کارەساتباری خوڵقاندووە. کارمەندێکی گێژی تاقیگەیەك دەتوانێت تەقینەوەیەك لە ناوەندی دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمیدا بخوڵقێنێت. بەرنامە داڕێژەرێکی خەواڵو دەتوانێت بە هەڵە وا لە کۆمپیوتەرەکانی پێنتاگۆن بکات کە ساروخێکی نەویستراو بتەقێنێت. کێڵگەیەکی ڤایرۆسی، گەر لێکۆڵەرەوەیەکی بێ ئاگا کاری لەسەر بکات بە ئاسانی لە ریفۆرم دەردەچێت و ئیدی جارێکی تر کۆنترۆڵ ناکرێتەوە.

ڕێڕەوی ژیانی ئێمە بە وەها دونیایەکی (ئامادە بۆ کارەساتدا) تێدەپەڕێت. لەمڕووەوە ئەدەب و هونەر دەبێت ئەم پرسیارە دەرببڕێت کە ئایا مرۆڤ لە تەنگوچەڵەمەیەکی کامڵدا نەچەقیووە و بەرەو لەناوبردنی خۆی هەنگاو نانێت؟

+تۆ نووسیوتە (ئێمە هاتینە سەر زەوی، خۆمان ناساند، قسەکانمان کردو، سەرکەوتوو نەبووین) ئایا ئەمە بەمانای ئەوە نیە کە مرۆڤ بەرهەمێکی تەواو گەلۆرانەیە؟

–زانایەکی بایالۆژی گوتوویەتی کە تراژیدیای مرۆڤ ئەوەیە کە لە ڕاستیدا لەلایەن مێشکی تاکێکی تەمەن ٣ ساڵانەوە ڕێنوێنی دەکرێت. مرۆڤ ناتوانێت لە ئاستی زانست و زانیاری خۆیدا مامەڵە بکات، ئەقڵ بە تەواوەتی و هەموو تواناوە کار ناکات. من ئەمە بە کارەسات دەزانم.

+بەپێی ئەو ڕووداوانەی لە دونیای سیاسی ئەمڕۆدا ڕوودەدەن دەڵێی جیهان سەرقاڵی دەورگێڕان و بەرجەستەکردنی شانۆنامەیەکی دۆرێنماتە، جیهانێک کە لە شێتخانە دەچێت. جیهانێک کە کوشتن و خوێنڕشتن تیایدا سەرەتای کاری ڕۆژانەیە. بۆ نموونە لە دوا شانۆنامەتدا سەرکردە سیاسیەکانت وا بیر دەکەنەوە و وا قسە دەکەن، بەجۆرێك بیر دەکەنەوە بەڵام بەجۆرێکی تر کارەکان ڕادەپەڕێنن. کتومت بارودۆخی سیاسی ئەمڕۆ هێند کۆمێدیە کە لە شانۆنامەکانی تۆ دەچێت؟

–هەندێك جار وای بۆ دەچم کە جیهان لە شانۆکانی من شێتترە. کەس نازانێت کە ئایا هیندو پاکستان بۆمبی ئەتۆمیان هەیە یان نا. بیرکردنەوەش لێی ترس هێنەرە. چەکی ئەتۆمی لە دەستی سەرانی جیهانی سێیەمدا کە کەس ناتوانێت پێشبینی فیکر و کاردانەوەکانیان بکات. یان پرۆسەی نابودکردنی سروشت – کە ئێمە بە تەکنەلۆژیامانەوە سەرقاڵی ئەوەین. ئەم پرۆسانە بێ ئەقڵین، کوێرانەن، چونکە لە ڕاستیدا مرۆڤ بەو جۆرە کارانە زوتر ژیانی خۆی ڕووبەڕووی وەستان دەکاتەوە.

## سەرچاوە

سایتی ئەدەبیات و فرهنگ.

# شیعری قەرەج

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



زەحمەتـــە مـــرۆڤ پێناســـەیەکی دیـاریکراو و ڕوون بـۆ شـیعری قـەرەج بدۆزێتـــەوە، پێدەچـــێ شـــەفافییەت و سوك بەدەستەوە هـاتن لە سیمای ئەم شـــیعرانە بـــن کـــە بـــەبێ ئـــەوەی بنوســـرێنەوە ماونەتـــەوە، بـــەردەوام گەشـــەیانکردووە و لەگـــەڵ ژیـــانی سەختی ئەو گەلە کۆڵنەدەرەدا یەکانگیربووە. قەرەج دەتـوانن شانازی بـە شیعرەکانیانەوە بکـەن، چونکە ئـــەم شـــیعرانە شـــیعرێکی ڕاســـتگۆن و لـــەناوەوە گوزارشت له ڕاستی و شکۆمەندی و زمان و فیکریان دەکـــەن، تەنهاچـــەند ئامـــاژە و چـــرپەیەك نـــین، ڕاســـتییەکان ناشـــارنەوە و درێـــوی ناڕازێننـــەوە، گوزارشـت لـە دەروون و هەسـت و سـۆز و ئـارەزو و ناڕەزایی دەکەن...

ئـەم شـیعرانە بـەبێ بـونی ناوەنـدێکی ئـەدەبی یـاخود بـەبێ بـونی شاعیرانی پایەبڵند یـان زانیـاری دروست لە زانستی جوانناسیدا توانیویانە خۆیان بۆ جیهـان دەربخـەن، گەلان و نەتەوەیـەکی زۆر سـودیان لـەم شـیعران وەرگرتـووە، تەنانـەت ئـەو شـیعرانە خۆشـیان بوونەتـە سەرچـاوەیەك بـۆ شـاعیری گـەورەی ئیسـپانی "لۆرکـا". ئەم شیعرانە وەك شیعری هـەر گـەلێکی دیکە خاوەنی ئامرازی شیعری و کەش و هـــەوای تایبـــەت بەخۆیـــەتی و بـــە گەڕانـــەوە بـــۆ منـــداڵی و بەرائـــەت و سادەیی و ڕاستەخۆیی دەناسرێنەوە.

## سوارچاك و ئەسپەکەی

سەفەرێکی دوورم کرد
ئەسپەکەم ئاونەدا.
ئەسپەکەم ماندووە، خەریکە لەژێر زینەکەیدا دەمرێ.
بەدەنگێکی ناسك دەیلاوێنم.
وەك منداڵ دەیدوێنم.
پێیدەڵێم خۆشمدەوێی.
ئەسپەکەم ماندووە، تائاستی مردن ماندووە
ڕێگایەکی دوورمان بڕی، دوور
لغاوی، کەفی سپی دەرکردبوو،
یاڵی، ئارەقی لێدەتکا.

لەژێرما دەینالاند.
لێیدەپاڕامەوە سەبری هەبێ.
پێم دەووت: غاردە ئەی ئەسپە باشەکە.
بەم نزیکانە دەگەینە ماڵەوە.
لای لێکردمەوە و، بەدوو چاو وەك چاوی دایکم
سەیریکردم.
چاوە باشەکان دەکرێ زۆر دڵ تەنگ بن
ڕێگایەکی دوور..دوورم بڕی و
ئەسپەکەم ئاو نەدا.
غاردە ئەی ئەسپی باش! لە پشت ئەو شاخەوە
دەوارێکی سپی لێیە، دەواری شۆخێکە..
لەوێ کانیاو و
ئالیکی زێڕینی لێیە
تا تەوێڵ نوقم دەبین تێیدا.

******

## ئازاری خۆشەویستی.

دایکە تەماشاکە و هیچی تر
ئەو کوڕە بۆ من دەگری.
دایکە لێمگەڕێ،
لەگەڵیدا بونووم.
بێ ئەو ناتوانم بنوم.
ئەو دەگری.
بیرم هەمیشە لایەتی.
بەدرێژایی شەو بەخەبەرم.
دایکە لێمگەڕێ،
لەگەڵی بنوم.
تاکو ڕۆحم گەرمی بێتەوە.

******

## حەوت کەس لە زیندانێکدا

حەوت کەس لە زیندانێکدا ڕاکشاون
حەوت گریان، حەوت خەفەت.
حەفتاو حەوت شەو،
حەوت کەس لە زیندانێکدا ڕاکشاون.
خودایە، چۆن دەتوانی بە هێمنی
حەوت جار لەم ناخۆشییە ڕەشە بڕوانی.
ڕەحمەتی خۆت بنوێنە و
بە حەفتاهەزار کلیلەوە وەرە
دەرگای زیندانەکە بکەرەوە.
تاریکی حەوت جار
ڕادەکاتە سەر شەقامەکە
شکۆداربێت ناوەکەت

******

## شۆخێك

بەیانیت باش، ئەی کچە شۆخەکە!
لەپێناو نیگایەکت
هەزار دینار بەپولێ.
لەپێناو سنگ و مەمکت
دە ساڵ بە پێ دەڕۆم.
لەپێناو لێوەکانت
زمانی خۆم لەبیردەکەم.
لەپێناو پێیەکانت
دەبمە کۆیلە.
بەیانیت باش، ئەی کچە شۆخەکە!
سواری ئەسپە سپیەکە دەبم و،
وەك تیر دەردەچم.
لە دارستانەکە چاوەڕێت دەکەم
لە دەوارێکدا هێشتا هیچ منداڵێکی تێدا لەدایك
نەبووە.
لەگەڵ بولبول و گوڵ
سنگمت بۆ دەکەم بە فەرش و
باسکمت بۆ دەکەم بە سەرین.
بەیانیت باش، ئەی کچە شۆخەکە!
گەر نەهاتی،
چەقۆی ناو نانەکە هەڵدەگرم و

دەیسڕم
ئەوسا دەیچەقێنمە ناوەڕاستی دڵت.

******

## مەرگ

وادەی مەرگە
ئەی خودایە: با نەمرم
مردن لە دەرگا دەداو
لە ژێر پێخەفەکە خۆم دەشارمەوە.
خودایە: بەم گەنجییە نەمرم
مردن لەبەر قاپییە و
هێشتا هیواکانم نەهاتونەتە دی
مەرگێکی ڕەش، شەوێکی سپی
تەنها مەرگ ڕەشە.
خودایە بانەمرم
هێشتا چەندین هیوا نەهاتونەتەدی

******

## ئازار

ئەوەی لەخوام داواکرد
پێی بەخشیم.
کوڕێك.
کوڕێك لە باوەشما.
ئاه، دایکە،
کوڕێك لەسەر سنگم.
لەباوەشما، لەسەر سنگم
لەوێشەوە بۆ گۆڕ.

******

## قەرەجە دەوڵەمەندەکان و قەرەجە هەژارەکان

قەرەجە دەوڵەمەندەکان.
ئەسپی بەهێزیان هەیە.
ڕەشوەی چاك و ڕازاوە بە زەنگۆڵە.
سواری ئەسپە دزراوەکان دەبن و،
بەدەروی ئەم جیهانە جوانەدا دەگەڕێن.
بەڵام ئێمەی هەژار،
سواری ئەسپە لەڕەکان دەبین.
کە زینەکانیان پەڕپوتە و
ناڵەکانیشیان نابریسکێنەوە.

******

## پۆلیس و ئەسپ دز

لە ڕێگای "تمسفار"
پیاوانی پۆلیس گرتمیان.
بەدوان لێیاندەدام و
سێیەمیش پرسی:
کوان ئەسپەکان،
ئەسپە دزراوەکان؟
–گەورەم ئەسپەکانم فرۆشت.
–ئەی دزی لەعنەتی
پارەکەی کوا؟
– بەنیوەی خواردم و سەرخۆش بووم
نیوەکەی دیکەشم دا بە تۆ، گەورەم!

******

## ڕاکردن

ئەوان شوێنم کەوتوون و
بەڵام عەیامێکە من هەڵاتووم.
گەر پاسەوانەکان ویستیان
بە تفەنگ و دەنگی فیشەك ڕاومکەن
پەنا دەبەم بۆ تاریکی و
دزە دەکەمە نێو دارستان
کە ئەنگوستەچاوە
ئیدی شوێنەوارم نامێنی.
لە هەرشوێنێکدا درەخت هەبێ
دەبمە سێبەر.

ئه‌وان شوێنم که‌وتوون.
به‌ڵام عه‌یامێکه من هه‌ڵاتووم و.
له‌نێو زوڵمه‌تدا ون بووم.
وه‌ك خه‌ڵوزێك بوبێته خۆڵه‌مێش.
له‌ده‌ست "ڕۆژ" ڕاده‌که‌م
نه‌بادا تاریکی که‌م.
وه‌ك گه‌رمترین پۆشاك،
خۆم له تاریکیه‌وه ده‌پێچم.
******

## خودا و زیندان

خودایه توانای خۆت بخه‌گه‌ڕ.
به بروسکه و شمشێری بڵێسه
فریشته باڵداره‌کان و که‌شیشه ڕیشداره‌کان پرچه‌ك بکه‌و
ئه‌و کلیلانه بێنه که هه‌موو زیندانێك ده‌که‌نه‌وه.
ده‌ساڵ تێپه‌ڕی و من به‌ندم.
ڕۆژ بنێره کۆتوبه‌ندی مه‌چه‌کم بتوێنێته‌وه.
ده‌مه‌وێ بگه‌ڕێمه‌وه لای منداڵه‌کانم
گه‌وره‌م مۆمێکت بۆ داده‌گیرسێنم.
سوپای ئاسمان بنێره.
ئه‌وه بۆ تۆ چی تێده‌چێ؟
له که‌ڵێسادا دوو مۆم داده‌گیرسێنم.
له‌م زیندانه ڕزگارمکه!
ئه‌وه بۆ تۆ چی تێده‌چێ؟
له کڵێسا و له‌به‌رده‌م میحرابدا
سێ مۆمت بۆ داده‌گیرسێنم.
گه‌وره‌م فریامکه‌وه.
ڕزگارمکه.!
******

## خۆزگه‌یه‌ك

ئاه، گه‌ر ته‌یرێك بومایه
بۆ هه‌ر شوێنێك بمویستایه ده‌فڕیم
له‌سه‌ر مه‌نجه‌ڵێك ده‌نیشتمه‌وه
مه‌نجه‌ڵێکی گه‌وره.
تا تێرده‌بووم گۆشتم ده‌خوارد.
پارچه‌یه‌کم هه‌ڵده‌گرت و
به‌ره‌و گژوگیاکه ده‌مبرد.
تاکو که‌س نه‌مبینێ و
به‌ته‌واوه‌تی تێر بخۆم.
ئاه، خۆزگه شه‌مشه‌مه‌کوێره‌یه‌ك بوومایه و
له‌سه‌ره‌وه بکه‌وتمایه‌ته خوارێ
بۆ نێو سنگی ئافره‌تێك!
ئافره‌تێکی سپی و، منێکی ڕه‌ش.
******

## کچێك و گوڵێك

له ژێر په‌نجه‌ره‌که‌دا
گوڵێك بۆ من ده‌ڕوێ.
هه‌ر ده‌بێ بڕوێ
ئه‌و ده‌ڕوێت و
له‌ژێر کراسه‌که‌ی منیشه‌وه.
مه‌مکه‌کانم خڕده‌بن.
هه‌ردوکیان ده‌بێ بگه‌شێنه‌وه
که ده‌گه‌شێنه‌وه
گوڵێك لێده‌که‌مه‌وه
له‌نێوان مه‌مکه‌کانمی داده‌نێم.
ئه‌و ده‌بێ داوای بکا
کاتێکیش داوای ده‌کا.
قۆپچه‌ی کراسه‌کەم ده‌ترازێنێ.
******

## له‌ده‌ستدانی دۆستێك

که‌س نازانێ چه‌ند دڵته‌نگم.
ئه‌مڕۆ بێ ئه‌وه‌ی بیر له‌من بکاته‌وه ژنی هێنا

ئەمشەو تامی خۆشەویستی ئافرەتێکی دیکە دەکات.
کاتێ لە ژورەکەیدا خەبەریدەبێتەوە.
لە قۆرییەکی مسدا چای دەداتێ و
کاتێکیش دەچێتە دەرەوە.
تاچیاکان دەیگەیەنێ.
کە دەگەڕێتەوە
بە شەوقەوە لەپێش دەرگا چاوەڕێیەتی.
کەس نازانێ چەند دڵتەنگم
لە مێرگی ئەسپەکاندا،
گۆرانی خۆشەویستی دەچڕێ.
وشەکان ناوی من ناهێنن، ناوی من وشەی نییە.
سەر مێزەکە بەدیاریەکانی زاوا دەبریسکێتەوە.
ژنەکە بە رووتی ژورەکە جێدەهێڵێ و
بە دوو دەستی کراوەوە لە ئامێزی دەگرێ.

******

## پیاوێکی بەجێماو

باران بە ڕێژنە دێتەخوارێ
پیاوێك لەسەر چەقی ڕێگاکە دانیشتووە و دەگری
دانیشتووە، دەگری و لەخوا دەپاڕێتەوە.
ئافرەتەکە ڕۆشت و سەفەری خێر.
لەگەڵ گەنجێکی سمێڵ بابڕدا
بۆ جێگایەك ڕۆشتن.
لە ڕێگالای مێرگێك لادەدن
مریشکێکی بۆ دەبرژێنێ.
مێردەکەی هەرگیز مریشکێکی بۆ نەبرژاندووە
هەربۆیە دەگری!

******

## ترس لە مردن

کەس ناتوانێ یارمەتیم بدات
مردن بەڕێوەیە.
کێ بە مردنی قەرەج دڵتەنگ دەبێ؟
گۆڕەپانێ بێ پەرژین
ماڵێك بێ بنمیچ و بێ پەنجەرە.
قەرەج دەمرێ و
ڕۆژی سپی سەر شاخەکان و
شەقامە سپیەکانی جیهان ئازا ناچێژن.
ئەی کێ بۆم دەگری؟
گۆڕەپانێکی بێ چاو و بێ فرمێسك.
خانوو لەگریان تێناگاو.
شەقامە سپیەکەش بەخێرایی جیهان دەبڕێ.
پاشان دەگەڕێتەوە و پێم دەڵێ
هەرگیز سواری ئەسپێکی عەرەبی نابیت.
مردن بەڕێوەیە.
ناتوانم بەری بگرم.
بەرویدا دەقیژێنم، بەڵام ناترسێ.
لە ژورەکەمدا هەڵدەکورمێم.
دەلەرزم و دەلەرزم.
کەس نامبینێ.
گەر هەموو قەرەجەکان کۆببنەوە.
گەر لە دەورەم کۆببنەوە
لەوانەیە بتوانن مردنی ڕەش بترسێنن.
بەڵام ئەوان کوچە و کۆڵانەکان تەیدەکەن
منیان بەلاوە گرنگ نییە.
ئەوانە لەوێن..دەڕۆن و جێمدەهێڵن و
منیش دەمرم.

## سەرچاوە

کتێبی "گۆرانی قەرەج" نوسینی هانزیکۆن فۆکێت/ وەرگێڕانی بۆ عەرەبی نامق کامل/ لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئەلمەدا بۆ ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە/٢٠٠١

ئەم کتێبە پێشەکییەکی درێژ و کۆمەڵێ شیعری زۆری لەخۆگرتووە، ئێمە تەنها ئەوەندەمان هەڵبژارد کە بڵاوکراوەتەوە.

# زۆنگاوەکە

*Joseph Conrad*

لە ئینگلیزییەوە: بەختیار سابیر حەمە

پیاوە سپی پێستەکە خۆی دابوو بەسەر سەربانی ژوورە بچوکەکەی بەشی دواوەی بەلەمەکە و بە کەشتیوانەکەی وت، "ئەم شەو لە ساباتەکەی ئارسات دەبەینە سەر، کات درەنگە". پیاوە مالیزییەکە بۆڵەیەکی لێوەهات و بەردەوام بوو لەسەر سەیرکردنی روبارەکە. پیاوە سپی پێستەکە چەناگەی خستە سەر قۆڵە راست و چەپ کراوەکانی و دەیڕوانییە ئەو هێڵە ئاوانەی بەلەمەکە لە دوای خۆیەوە جێی دەهێشت. لەسەری ئەو سەری ڕێگا ئاویەکەوە کە ئەمبەروبەری دارستانی چڕوپڕ بوو، خۆر بە رونی و شەوقداری دەرکەوت و بە نزمی و لەسەر ئەو ئاوەی کە وەك پارچە کانزایەکی تەخت بە هێمنی دەدرەوشایەوە لەنگەری گرتبوو. دارستانەکان، تاریك و نوتەك، بێ جوڵە و بە بێدەنگی لەسەر هەردوو بەری رووبارەکە قنج راوەستابوون. لەبەر پێی درەختە گەورە بورج ئاساکاندا، دارخورمای کورتی بێ قەد لە ناو لیتەی کەنارەکەدا و لە ناو ئەو گەلاو گۆڵانەوە کە کەوتبوونە سەر ئاوەکە بەرز بووبونەوە. لە هەوا وەستاوەکەدا، هەموو دارەکان، هەموو گەڵاکان، هەموو پەلی درەختەکان، هەموو تەرزێکی رووەکە خشۆکەکان و هەموو پەڕێکی گوڵە ساواکان وا دەردەکەوتن کە جادووی وەستانێکی تەواو و هەتا هەتاییان لێکرابێت. لە رووبارەکەدا جگە لەو هەشت سەوڵەی کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك پێکەوە بەرز دەبونەوەو دەردەکەوتن و بەیەك شڵپە نقوم دەبونەوەو جارێکی تر دەهاتنەوە دەرەوە هیچ شتێکی تر نەدەجولایەوە. ناو بەناو و لە ناکاو کەشتیوانەکە خۆی دەسوڕاند و بە سەرە تاس و لوسەکەی وێنەی نیمچە بازنەیەکی دەکێشا. ئاوە شڵقاوەکە گرمە گرمێکی لێوەدەهات و بە درێژایی هەردوو کەنارەکەی کەفی کردبوو. بەلەمەکەش کە پیاوە سپی پێستەکەی تێدابوو بە ناو لێڵبیە تەمەن کورتەکاندا کە خۆی دروستی دەکردن بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت و دەتوت دەچێتە ناو دەروازەی وشکانییەکەوە کە لە فەرهەنگی یادەوەرییەکانیدا شتێك بە ناوی جووڵەوە نەمابوو. پیاوە سپی پێستەکە پشتی کردە خۆرەکە کە لە ئاوابووندا بوو،

روانییە دەریا بەرفراوان و چۆڵ و هۆڵەکە. لە سێ میلی کۆتاییەکەیدا، روبارە بێ ئارام و سەرهەڵگرتووەکە وەك ئەوەی لە لایەن ئاسۆیەکی گەشەوە مژدەی ئازادی پێ درابێت بێ هیچ بەربەستێك راستەوخۆ دەڕژێتە ناو دەریایەکەوە، راستەوخۆ بەرەو خۆرهەڵات دەڕوا — بەرەو خۆرهەڵاتێك کە پەنای تاریکی و ڕووناکیش دەدات. لە پشت بەلەمەکەوە دەنگی پۆلە باڵندەیەك کە چەند جارێك دووبارە بۆوە و بە لاوازی و زەبوونی دەیانخوێند بەسەر روبارە نەرم و نیانەکەدا کشاو پێش ئەوەی بگاتە بەرەکەی تری روبارەکە لەو جیهانە بێ چرپەیەدا ونبوو. کەشتیوانەکە سەوڵەکەی لە روبارەکەدا چەقاند و توند بە بازوە بەهێزەکانی گرتی و خۆی دا بەسەریدا بەشێوەیەك کە جەستەی کەمێك بەرەو پێشەوە خزابو. ئاوەکە بە دەنگێکی بەرز کەوتە بڵقە بڵق و دەسکە درێژ و راستەکەی سەوڵەکە وا دەردەکەوت کە لەسەر بنکەکەی خۆی لەنگەری گرتبێت، دارستانەکان بە دەوری نیمچە بازنەیەکدا دەسوڕانەوە و تیشکە لارەکانی خۆرئاوابونەکەش کە ئاگر ئاسا دەسوتان بەر لا گەورەکەی بەلەمەکە دەکەوتن و سێبەرە لاواز و نارێکەکانی تاقمی بەلەمەکەشی فڕێدەدایە سەر شەپۆلە درێژکۆلە درەوشاوەکانی روبارەکە. پیاوە سپی پێستەکە ئاوڕێکی دایەوە تاکو سەیرێکی پێشەوە بکات. ڕێڕەوی بەلەمەکە بە شێوەی گۆشە وەستاوێك بەرەو جۆگەیەك گۆڕدرا. ئەو کەللەسەری ئەژدیهایە (رأس التنين)ی لە بەشی پێشەوەیدا هەڵکۆڵدرابوو رویکردە بۆشاییەك لە ناو دەوەنە پەرش و بڵاوەکانی سەر رۆخی روبارەکە، لەسەرخۆ بەناویاندا گوزەری کردو چڵە شۆڕەوەبووەکانی لەراندەوە. وەك چۆن هەندێك گیانەوەر کە وشکانیشن و ئاویشن بۆ دانانی هێلکەکانیان دەچنە

ناو دارستانەکەوە، ئەمیش بەو شێوەیە لەچاو ونبوو. جۆگە باریکەکە کە زیاتر لە خەندەقێکی پێچاوپێچ و قوڵ دەچوو لە ژێر ئاسمانە شین و ساف و بێگەردەکەدا رەش هەڵگەڕابوو. داری گەورە گەورە چوبوون بە ئاسماندا و ئەو ناوە پڕ بو بوو لە کاژی فڕێدراوی گیانەوەرە خشۆکەکان. لێرەو لەوێ رەگی پێچاوپێچی چەند دارێکی گەورە لە ناو رووەکە سەرخەسیەکانەوە دەرکەوتبون، رەنگیان رەش و بێ شەوق بوو، کرژببوون و جوڵەیان نەدەکرد هەر دەتوت ماری سڕ بوون. دەنگە دەنگی سەوڵ لێدەرەکان لە نێوان دیوارە تەختە ئەستورە رەشەکانی بەلەمەکەدا دەنگیان دەدایەوە. بە ناو درەختەکاندا و لە ناو ئەو تولە ڕێیانەوە کە خشۆکەکان دروستیان کردبوون و لە پشت گەڵا گەورە و بێ جوڵەکانەوە وردە وردە تاریکی دەهاتە دەرەوە. تاریکییەکە گەلێك نهێنی لە ناخی خۆیدا حەشاردابوو وە نەشدەتوانرا ڕێگە لە هاتنی بگیرێت. تاریکییەکە بۆنی خراپەی لێوە دەهات و دارستانەکانی پڕ کردبوو لە ترس. پیاوەکان لە تەنکاوەکەدا سەوڵیان لێدەدا. کۆتایی جۆگەکە فراوان بوو چونکە دەڕژایە ناو زۆنگێکی بەرفراوانی وەستاوەوە. دارستانەکە پێش ئەوەی بگاتە کەناری زۆنگەکە کۆتایی پێ هاتبوو، لە نێوان دارستانەکە و ئاوەکەدا پانتاییەکی قامیش و زەلی قەرسیلی هەبوو کە رەنگدانەوەی شینی ئاسمانەکە بوو. پەڵە هەورێکی ڕەنگ پەمەیی بە ئاسمانەوە بوو، وێنەکەی لە ژێر گەڵا سەرئاو کەوتووەکان و گوڵە زێڕینەکانی شلێرە ئاوییەکانەوە دەبینرا. خانویەکی بچکۆلە کە لەسەر تەپۆڵکەیەك دروستکرابوو لە دەرەوە رەش دەچۆوە. لە نزیکییەوە دوو داری گەورە هەبوو بەسەر سەربانە تەپیوو و بێ کەڵکەکەیدا کەمێك چەمابونەوەو جۆرێك لە غەم و پەژارەیان لە گەڵا

شۆڕەوەبووەکان و سەرە بڵندەکەیاندا هەڵگرتبوو. کەشتیوانەکە بە سەوڵەکەی ئاماژەی بۆ شوێنێك کرد و وتی: "ئارسات لەوێیە. لە نێوان تەپۆڵکەکانەوە بەلەمەکەی دەبینم". سەوڵ لێدەرەکان کە بەملاولای بەلەمەکەدا بڵاوبوبوونەوە لەسەر شانی یەکترەوە روانیانە ئەو شوێنەی کە دوای گەشتێکی دورو درێژ لەو ڕۆژەدا گەیشتونەتێ. گشتیان حەزیان دەکرد ئەو شەوە لە شوێنێکی تر بەرنە سەر نەك لەو زۆنگەدا کە پێشبینی بوونی جانەوەری دڕندەی لێدەکرێت و خەڵکیش دەڵێن گوایە خێوی هەیە. سەرباری ئەمانەش، ئەمان حەزیان بە چارەی ئارسات نەدەکرد. یەکەم لەبەرئەوەی بێگانەبوو، دووەمیش لەبەرئەوەی ئەم پیاوە خانووە روخاوەکانی چاك دەکردەوەو تیایدا دەژیا، هەروەها دەشیوت ئەو لەوە ناترسێت لە ناو ئەو ڕۆحانەدا بژی کە شەو دەدەن بەسەر ئەو شوێنانەدا کە مرۆڤ چۆڵی کردوون. پیاوی لەم جۆرە بە سەیرکردن یاخود بە قسە دەتوانێت ڕێڕەوی قەدەر بگۆڕێ و ئەو ڕێبوارانەش کە ڕێیان دەکەوێتە ئەم شوێنە و دەیانەوێت ئارەزووە شەڕەنگێزییەکانی گەورەی خێوەکان کە مرۆڤێکە لەناوبەرن بە ئاسانی لە دەست خێوەکانی ئەم پیاوە رزگاریان نابێت. مرۆڤە سپی پێستەکان گوێ بەم شتانە نادەن و گوێ نادەن بەوەی بێ باوەڕبن و هاوپەیمانی شەیتان بن کە بێ ئەوەی ئازاریان پێ بگات بە ناو مەترسییە شاراوەکانی ئەم جیهانەدا دەیانبات. ئێستا چی بکەین؟ بەم شێوەیە دەستیانکرد بە بیرکردنەوە و خۆیان دابوو بەسەر کلکی سەوڵەکانیاندا. بەلەمە گەورەکە لەسەرخۆ و بە بێدەنگی بەرەو ساباتەکەی ئارسات ملی نا. هەموو سەوڵەکان بە جارێك فڕێدران و غەڵبەغەڵبی پیاوەکان کە بەیەك دەنگ دەیانوت پشت بە خوا لەگەڵ تەپەی پێیاندا تێکەڵ بوو بوو کاتێك بەسەر گردە کوڕەکانی بەردەم خانووەکەدا سەردەکەوتن. پیاوەکان سەریان هەڵبڕی و بەیەك دەنگ هاواریان کرد، "ئارسات. هۆ و ئارسات". کەس وەڵامی نەدایەوە. پیاوە سپی پێستەکە بەسەر ئەو پەیژە شەق و شڕەدا سەرکەوت کە تەنها ڕێگەیەك بوو دەچووە سەر سەکۆکەی بەردەم خانووەکە. کاپتنی بەلەمەکە بە نابەدڵییەکەوە وتی، "لە ناو بەلەمەکەدا خواردن ئامادەدەکەین و لە ئاوەکەشدا دەنوین". پیاوە سپی پێستەکە بە توڕەییەکەوە وتی: " پێخەفەکانم و سەبەتەکەی من داگرن". لەسەر لێواری سەکۆکە کەوتە سەر چۆك و خۆی شۆڕکردەوە بۆ ئەوەی شتومەکەکانی وەربگرێت. پاشان بەلەمەکە کەمێك لە کەنارەکە کشایەوە و پیاوە سپی پێستەکە هەستایەوە سەرپێ و چاوی بە ئارسات کەوت کە لەو کاتەدا لە دەرگا بچوکەکەی کوخەکە دەهاتە دەرەوە. پیاوێکی گەنجی بەهێزی چوارشانە بوو، هیچی لەبەردا نەبوو تەنها پەشتەماڵێك نەبێت کە لە خۆیەوە ئاڵاندبوو. سەری روت بوو. چاوە گەورەو گەشەکانی بە پەرۆشەوە دەیانڕوانییە پیاوە سپی پێستەکە و بێ ئەوەی بەخێرهاتنی بکات لێی پرسی، "بەڕێز، هیچ دەرمانێکت پێیە؟" میوانەکە بە زمانێکی تێکەڵ و پێکەڵ وەڵامی دایەوە: "نا". "نەخێر بۆچی؟ کەس نەخۆشە؟" "وەرە ژوورەوە بە چاوی خۆت ببینە" ئارسات بە هێمنی وەڵامی دایەوەو رووی وەرگێڕاو جارێکی تر بە دەرگا بچوکەکەدا چووەوە ژوورەوە. پیاوە سپی پێستەکە شتومەکەکانی داناو شوێنی کەوت. لە ژوورە تاریکەکەدا چاوی بە ژنێك کەوت لەسەر قەرەوێڵەیەك کە لەدار حەیزەران دروستکرابوو لەسەر گازی پشت راکشابوو و چەرچەفێکی خوری سوری دابوو بە خۆیدا. تەخت لێی کەوتبوو دەتوت مردووە، بەڵام چاوە گەورەکانی

کرابوونەوە و لە تاریکییەکەدا دەبریسکانەوەو چەقیبوونە دارە باریکە بێ جوڵەکانی بنمیچەکە کە غەرقی تاریکییەکە بووبوون. تایەکی بەتینی لێهاتبوو، پێدەچوو لەهۆش خۆی چووبێت. روومەتەکانی چوبوون بە قوڵا و کەمێك دەمی داچەقاندبوو. لەسەر روخسارە منالکارانەکەی جۆرە گوزارشتێك بە بەردەوامی هەستی پێدەکرا کە بۆنی باشەی لێ نەدەهات ئەمەش تەواو سەرنجی رادەکێشایت، گوزارشتێك کە پێشبینی مەرگی تیا دەکرا بۆ ئەوانەی لە هۆش خۆیان چوون و لەسەرە مەرگدان. هەردوو پیاوەکە بە پێوە وەستابوون و سەریان داخستبوو و بە بێدەنگی سەیری ئەویان دەکرد. "دەمێکە نەخۆشە؟" گەشتیارەکە پرسی. "ماوەی پێنج شەوە خەو نەچۆتە چاوم". پیاوە مالیزییەکە لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە. "یەکەم جار گوێی لە چەند دەنگێك بوو لە ئاوەکەوە بانگیان دەکرد، منیش گرتبووم و ئەو خۆی رادەپسکاند و هەر پەلەقاژەی دەکرد، بەڵام کە خۆری ئەو بەیانییە لە کەل دەرکەوت، هیچی نەدەبیست — دەنگی منیشی گوێ لێنەبوو، هیچی نەدەبینی — منیشی نەدەبینی — من!". بۆ ساتێك بێدەنگ بوو، پاشان لەسەرخۆ پرسیاری کرد "بەڕێز، تۆ بڵێی بمرێت؟" "منیش لەوە دەترسم بمرێت" پیاوە سپی پێستەکە بە غەم و پەژارەیەکەوە وتی. ئەم پیاوە سپی پێستە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە وڵاتێکی دوور و لە کاتی لێقەوماندا ئارساتی ناسی بوو، لە کاتێکدا کە هاوڕێ قودسیەتی تایبەتی خۆی هەبوو. لەو کاتەوەی ئەم هاوڕێ مالیزییەی بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لەگەڵ ژنێکی نەناسیاودا هات و لەم کوخەی سەر زۆنگاوەکەدا نیشتەجێ بوو، ئەم چەند جارێك لە کاتی گەشتەکانی بە روبارەکەدا لایداوە و لایان ماوەتەوە. ئەم ئەو پیاوەی خۆشدەویست چونکە دەیزانی چۆن لە ناو کۆمەڵدا دڵسۆزبێت و چۆن بەبێ ترس شان بە شانی هاوڕێ سپی پێستەکەی بجەنگێت. خۆشی دەویست — رەنگە هێندەی پیاوێك نا کە سەگە دڵسۆزەکەی خۆی خۆشدەوێت، بەڵام بەشی ئەوەش خۆشی دەویست کە یارمەتی بدات و هیچ پرسیارێکی لێ نەکات و گومانی شتی خراپ لەو پیاوە تەنهایە و لەو ژنە قژ درێژە نەکات کە خاوەنی دوو چاوی جوان و روخسارێکی ئەوتۆ بوو کە لێوەشاوەیی تیا بەدی دەکرا و پێکەوە بە تەنها و بەترسەوە دەژیان و لە دارستانەکەدا خۆیان حەشاردابوو. لە دەمەدەمی خۆرئاوابووندا، پیاوە سپی پێستەکە لە کوخەکە هاتە دەرەوە بۆ ئەوەی ئەو ئاگرە سورە گەورەیەی خۆر ئاوابوونەکە ببینێت کە وردە وردە ئەو تاریکییە دایدەپۆشی کە وەك تەمێکی تەنك لەسەر ترۆپکی درەختەکانەوە بەرزدەبۆوەو بە ئاسماندا بڵاودەبۆوە و پەڵە هەورە داگیرساوەکان و ئاگرە سورە بریقەدارەکەی دەکوژاندەوە. پاش چەند ساتێك ئەستێرەکان بەسەر زەوییە قەترانییەکەوە کەوتنە درەوشانەوەو لە ناکاویش زۆنگاوەکە بە هۆی دانەوەی روناکی ئەستێرەکانەوە چەخماخەی داو لە پارچەیەکی هێلکەیی ئاسمان دەچوو کە خۆی دابێت بەسەر شەوێکی بێ هیواو خامۆشی چۆڵەوانییەکدا.

پیاوە سپی پێستەکە کەمێك خواردنی لە سەبەتەکەی دەرهێناو لە دەوروبەری سەکۆکە هەندێك چیلکە و چەواڵی کۆکردەوەو ئاگرێکی بچوکی کردەوە، ئەویش بۆ خۆ گەرم کردنەوە نەبوو بەڵکو لەبەر خاتری دووکەڵەکەی بوو بۆ ئەوەی مێشولەکان لە خۆی دوربخاتەوە. بەتانیەکەی لە خۆیەوە پێچاو پشتی کردە دیوارە قامیشەکەی خانووەکە و بەدەم جگەرە کێشانەوە دەستی کرد بە بیرکردنەوە. ئارسات بە بێدەنگی لە دەرگاکە هاتە

دەرەوە و بە دیار ئاگرەکەوە هەڵتوتا. پیاوە سپی پێستەکە کەمێك قاچی راکێشا. "هەناسە ئەدات" ئارسات بە دەنگێکی نزم وتی، وای چاوەڕوان دەکرد ئەم پرسیارە لەو بکرێت. "هەناسە ئەدات و گەرم داگیرساوە، ئەڵێی ئاگرە. هیچ ناڵێت، هیچ نابیستێ.. و وەك گڕی ئاگر ئەسوتێ". تۆزێك وەستاو پاشان بە هەمان شێوەی جاری پێشوو بە دەنگێکی نزم و بەشێوەیەکی هاکەزایی وتی "بەڕێز، تۆ بڵێی بمرێت؟". پیاوە سپی پێستەکە شانێکی هەڵتەکاند و بە دوودڵییەکەوە وتی "ئەگەر لە چارەی نووسرابێت". "نا، بەڕێز" ئارسات لەسەرخۆ وتی "ئەگەر لە چارەی من نوسرابێت. ئەبیستم، ئەبینم، چاوەڕێ دەکەم، لە بیرمە.. بەڕێز، تۆ رۆژانی رابردووت لە یادە؟ براکەی منت لە بیرە؟ "بەڵێ" پیاوە سپی پێستەکە وەڵامی دایەوە. کتوپڕ پیاوە مالیزییەکە هەستاو چووە ژوورەوە. پیاوە سپی پێستەکە کە هێشتا لە دەرەوە دانیشتبوو گوێی لە دەنگێك بوو لە کوخەکەوە دەهات، ئارسات دەیوت "گوێت لێمە! قسە بکە!"، بەڵام وەڵامەکەی لە بێدەنگییەك بەولاوە هیچی تر نەبوو. "ئاخ دیامێلێن" کتوپڕ ئارسات هاواری کرد. دوای ئەم هاوارە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و هاتەوە دەرەوە و لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. هەردووکیان بە بێدەنگی لە پێش ئاگرەکە دانیشتن. ناو خانووەکەش خامۆش بوو، لە دەوروبەریشیاندا هیچ دەنگێك نەدەبیسترا، بەڵام لە دورەوە و لە ناو زۆنگەکەدا گوێیان لە دەنگی پیاوەکانی ناو بەلەمەکە بوو کە ناوە ناوە بە دەنگێکی بەرز و روون قسەیان دەکرد. ئاگرەکەی ناو بەلەمەکە لە دوورەوە بە کزی دەسوتا و رەنگێکی سوری تەڵخی هەبوو. پاش کەمێك ئەو تروسکەیەش نەما. دەنگە دەنگەکە وەستا، وشکانی و ئاوەکە نوقمی تاریکی بوون، هیچ

شتێك نەدەجوڵایەوە، هەموو شتێك خامۆش بوو، دەتوت لەم جیهانەدا هیچ شتێك نەماوە تەنها رووناکی ئەستێرەکان نەبێت کە بەردەوام و بە لوتبەرزییەوە بەناو تاریکییە ئەبەدییەکەی شەودا هاتوچۆیان دەکرد. پیاوە سپی پێستەکە چاوی داپچڕاندبوو راستەوخۆ دەیڕوانیە تاریکییەکەی بەردەمی خۆی. ترس و تێرامان، ئیلهام و بیرکردنەوە لە مردن — لە مردنێکی نزیکی شاراوە کە ناشتوانی خۆتی لێ بەدوور بگریت، جۆرێك لە ئارامییان بەخشیبووە جەستە ماندووەکەی و لە ناخەوە بیروبۆچوونەکانی هەژاندبوو. ئەو گومانە خراپەی هەموو کاتێك ئامادەیە، ئەو گومانە بە ئازارەی لەناخماندا خۆی حەشارداوە هاتە دەرەوەو تێکەڵ بە بێدەنگییەکەی دەوروبەری بوو، ئەو گومانە تێکەڵ بەو بێدەنگییە گەورەیە بوو وە وای لێکرد جێی متمانە نەبێت و ناوبانگی خراپ ببێت، ئەو گومانە وای لەو بێدەنگییە کرد کە وا دەربکەوێت دەمامکێك بێت بۆ توندوتیژییەکی لە رادەبەدەر بێئەوەی بتوانرێت هیچ پاساوێکی بۆ بهێنرێتەوە. لەم گێژاوە کاتی و بەهێزەی بونی خۆیدا، زەوی کە بە روناکییە هێمنەکەی ئەستێرەکان دەورەدرابوو ببوو بە مەملەکەتێکی تاریکی ململانێی دێو و درنجەکان، ببوو بە شەڕگەیەکی تارماییە تۆقێنەرو سەرنج راکێشەکان کە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دەجەنگان بۆ داگیرکردنی دڵە بێ دەسەڵاتەکانی ئێمە، زەوی ببوو بە مەملەکەتێکی شڵەژاو و پڕ نهێنی ئەو ترس و ئارەزوانەی کە نەدەتوانرا دابمرکێنرێنەوە. ورتە ورتێکی زۆر لە تاریکییەکەوە دەهات، ورتە ورتێکی غەماوی و ترسناك بوون وەك ئەوە وابوو دارەکانی ئەو دەوروبەرە لە تەنهایدا نهێنی بڵندی خۆیان و کەمتەرخەمییەکەیان بە گوێی ئەمدا بچرپێنن. دەنگەکان پچڕ پچڕ و بەنادیاری لە

هەواکەی دەوروبەریدا بڵاودەبوونەوە و وردە وردە خۆیان دەکرد بە وشەو پاشانیش دەبوون بە رستەو لە شێوەی خوڕەی جۆگەلەیەکدا لەسەرخۆ دەڕۆیشتن. پیاوە سپی پێستەکە وەکو کەسێك کە هەستابێت لە خەو خۆی جوڵاند و کەمێك شوێنەکەی گۆڕی. ئارسات کە بەبێ جوڵە و لە شێوەی تارماییەکدا سەری شۆڕکردبۆوەو لەژێر ئەستێرەکاندا دانیشتبوو، بە دەنگێکی نزم و وەك ئەوەی خەوببینێ دەستی کرد بە قسەکردن،"....جگە لە دڵی هاوڕێیەك لە کوێی تردا دەتوانین بارگرانی غەمەکانمان هەڵڕێژین؟". مرۆڤ دەبێت باسی جەنگ و باسی خۆشەویستی بکات. تۆ، بەڕێز، دەزانیت جەنگ چییەو لە کاتێکی پڕ مەترسیدا منت ناسی کە بەدوای مردندا دەگەڕام، لە کاتێکدا کە پیاوەکانی تر بەدوای ژیاندا دەگەڕان! لەوانەیە نووسینێك بفەوتێت، درۆیەك بنووسرێت، بەڵام ئەوەی کە چاو دەیبینێ راستییەو لە مێشکدا دەمێنێتەوە!"."لەبیرمە" پیاوە سپی پێستەکە لەسەرخۆ وتی. ئارسات بە غەمبارییەکەوە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی "کەواتە باسی خۆشەویستیت بۆ دەکەم. لەم تاریکییەدا بۆت باس دەکەم، پێش ئەوەی شەو و خۆشەویستی بڕۆن و چاوەکانی رۆژ سەیری غەم و شەرمەزارییەکەم، سەیری روخسارە ڕەش هەڵگەڕاوەکەم، سەیری دڵە هەڵقرچاوەکەم بکەن بۆت باس دەکەم". هەناسەیەکی کورت و خنکاوی هەڵکێشا کە وەستانێکی کورتی بەدوای خۆیدا هێناو پاشان بێ ئەوەی بجوڵێت یاخود بە دەست هیچ ئاماژەیەك بکات وشەکان بە لێشاو لە زاریەوە هاتنە دەرێ، "دوای ناخۆشییەکان و دوای ئەوەی جەنگەکە کۆتایی هات و تۆش وڵاتەکەی منت جێهێشت و شوێن حەزو ئارەزووەکانی خۆت کەوتیت، کە ئێمەی پیاوی دورگەکان نازانین چییە، من و براکەم دووبارە وەك جاری جاران بووینەوە بە شمشێر بەدەست و پاسەوانی سەرۆك. خۆت دەزانیت ئێمە لە خێزانێك بووین سەر بە بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوابوو، ئەوەش بۆ ئێمە لە هەموو شتێکی تر گونجاوتر بوو کە ئارمی دەسەڵات بخەینە سەر شانی راستمان. لەکاتی سەرکەوتنەکاندا (سی دێندرێن) خۆشەویستی بۆ ئێمە نیشان دەدا هەروەك چۆن ئێمەش لەکاتی ناخۆشیدا دڵسۆزی خۆمان بۆئەو دووپات دەکردەوە. سەردەم سەردەمی ئاشتی بوو، سەردەمی راوەئاسك و شەڕە کەڵەشێر، سەردەمی فیشاڵ هەڵڕشتن و چەلەحانێ بوو لەنێوان ئەو پیاوانەدا کە سکیان تێرو تفەنگەکانیان ژەنگاوی بوون، بەڵام جوتیارەکان چاودێری چڵە مەرەزە تازە شینبووەکانیان دەکرد کە بەبێ ترس گەشەیان دەکرد، بازرگانەکان هاتوچۆیان دەکرد و بە لاوازی دەڕۆیشتن و بە قەڵەوی دەگەڕانەوە بۆ ناو روباری ئاشتی، هەروەها هەواڵیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا. درۆو راستییان پێکەوە تێکەڵ کردبوو، کەس نەیدەزانی کەی دڵخۆش بێت و کەی غەمبار، تەنانەت چەند هەواڵێکیشیان دەربارەی تۆ هێنا. دەیانوت کە لێرەو لەوێ تۆیان بینیوەو منیش حەزم بە بیستنی ئەم قسانە دەکرد بۆ ئەوەی کاتە سەختەکانم بیرکەوێتەوەو هەمیشە تۆم لە یاد بێت تا ئەو کاتەی چیتر چاوەکانم نەیانتوانی هیچ شتێکی رابردوو ببینن چونکە تەنها ئەو کەسەیان دەبینی کە ئێستا لەوێدا لەناو خانووەکەدا لە سەرەمەرگدایە".

کەمێك وەستاو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو لەبەر خۆیەوە وتی "ئاخ دەردی سەری، ئاخ نەگبەتی" و دواتر بە دەنگێکی کەمێك بەرزتر بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی "بەڕێز، هیچ دوژمنێك لە برا خراپتر نییەو هیچ هاوڕێیەکیش لە برا باشتر نییە چونکە برا

برای خۆی چاك دەناسێت و هەمیشە پاڵپشتێکە ئەگەر بۆ کاری خراپە بێت یاخود بۆ کاری چاکە بێت. من براکەی خۆمم خۆشدەویست. جارێکیان چووم بۆلای‌و پێم وت کە هیچ شتێك نابینم تەنها یەك ڕوخسار نەبێت، هیچ شتێك نابیستم تەنها یەك دەنگ نەبێت، ئەویش پێی وتم "دڵت بکەرەوە بۆ ئەوەی ئەویش بزانیت کە چی تێدایەو چاوەڕێ بکە. دان بەخۆداگرتن ژیرییە. ڕەنگە ئینچی میدا ( *Inchi Midah*) بمرێت یاخود سەرۆکەکەمان ئەو ترسە لە دڵی خۆی دەرکات کە بەرامبەر بەو ژنە هەیەتی!".....چاوەڕێم کرد. ..بەڕێز، ئەو ژنەت دێتەوە یاد کە پەچەکەی پۆشیبو، ئەوەشت هەر لە بیرە کە چۆن سەرۆکەکەمان لە زیرەکی‌و زۆرزانییەکەی دەترسا. باشە ئەگەر ئەو خزمەتکارەکەی خۆی بویستایە من چیم بکردایە؟ بەڵام هەرچۆنێك بێت بە چاوبڕکێ و قسەی ژێر لێو کەف و کوڵی دڵی خۆمم دامرکاندەوە. بەڕۆژ لەسەر ڕێگای حەمام چاوەڕێم دەکرد و کاتێکیش خۆر دەچووە پشت دارستانەکەوە خۆم دەخزاندە ناو ئەو پەرژینەی گوڵە یاسەمینەکانی حەوشەی ژنەکە دروستیان کردبوو. بێ ئەوەی کەس بمانبینێت، لەناو بۆنی گوڵ و سەرپۆشی گەڵاکان و ئەو چڵە گیایانەی لەبەردەم لێوەکانماندا قیت ببونەوە قسەمان لەگەڵ یەك دەکرد، زۆر دەترساین. هەرچەندە زۆر تامەزرۆی بینینی یەکتربوین، بەڵام زۆر بە هێواشی قسەمان دەکردو ڕازونیازی دڵمان بۆیەکتر هەڵدەڕشت. کات لەسەرخۆ تێپەڕی و ژنان کەوتبونە قسەو قسەڵۆك و ناحەزەکانیشمان چاودێریان دەکردین. براکەم زۆر خەفەتی بەمە دەخوارد. بیرم لەوە کردەوە کە دەست بکەم بە کوشتن و ئازاردانی ئەو کەسانە. ئێمە سەر بە گەلێکین چیمان بوێت دەیکەین وەك ئێوەی سپی پێست. جاری وا هەیە وا پێویست دەکات مرۆڤ دڵسۆزی و ڕێز لەبیر خۆی بەرێتەوە. گەورەیی‌و دەسەڵات دەدرێت بە سەرۆکەکان، بەڵام هەموو مرۆڤێك خۆشەویستی و هێزو ئازایەتی دەدرێتێ. براکەم وتی،"بە زوترین کات بیبەو بڕۆ، ئێوە یەکترتان خۆشدەوێت" منیش وتم "تا زوتر ئەوە بکرێت چاکترە، چونکە هیچ گەرمییەك لەو خۆرەدا نابینم کە لەسەر ئەو هەڵنایەت". کاتی ئەوە هات کە ئیتر سەرۆك و هەموو پیاوە ماقوڵەکان بە چراکانیانەوە روبکەنە روبارەکان بۆ ڕاوە ماسی. بە سەدان بەلەم لەو ناوەبوو، لەسەر لمە سپییەکەو لە نێوان ئاوەکەو دارستانەکەدا چەن شوێنێکی حەوانەوە لەگەڵا بۆ خانەوادەی میرەکان دروستکرابوو. دوکەڵی ئاگری چێشت لێنانەکە وەك تەمی ڕەنگ شینی ئێواران وابوو و لەناویدا چەند دەنگێك بە خۆشحاڵییەوە دەزرنگانەوە. کاتێك ئەوان خەریکی ئامادەکردنی بەلەمەکان بوون بۆ گرتنی ماسییەکان، براکەم هات بۆلام و وتی "ئەمشەو!" منیش سەیرێکی چەك و تفاقەکانم کردو کە کاتی ڕۆیشتنیش هات، بەلەمەکەی ئێمەش کە چەند چرایەکی پێوەبوو لەناو ئاپۆڕەی بەلەمەکاندا شوێنی خۆی گرت. ڕوناکییەکان لەسەر ئاوەکە دەدرەوشانەوە، بەڵام لە پشت بەلەمەکانەوە تاریکی هەبوو. کاتێك هاتوهاوار دەستی پێکردو ئەوان لە خۆشیدا وەك شێتیان لێهاتبوو، ئێمە بەپەلە ئەو ناوەمان جێهێشت. ئاوەکە ئاگرەکەی ئێمەی هەڵلوشی و گەڕاینەوە بەرەو کەنارە تاریکەکە کە تەنها لێرەو لەوێ پزیسکی چەند کۆمەڵە پشکۆیەك دەبینرا. لەناو خانووە بچوکەکانەوە گوێمان لە دەنگی کچە کۆیلەکان بوو. دواتر گەیشتینە شوێنێکی چۆڵ و بێدەنگ. لەوێ چاوەڕێمان کرد تا ئەو هات. بەدرێژایی کەنارەکە ڕایکردبوو. وەك ئەو

گەلایەی رەشەبا هەڵیدەگریٚ بۆ ناو دەریایەك، بەخێرایی بیٚ ئەوەی هیچ شوێنپێیەك جێبهێڵێت هات. براکەم بە غەمبارییەکەوە وتی "برۆ بیبە لەگەڵ خۆت، هەڵیگرە بۆناو بەلەمەکە" منیش هەڵم گرت. هەناسە برکێی پێکەوتبوو. پێم وت "لە دەست ئەمانە رزگارت دەکەم. تۆ بەدەم گریانی دڵمەوە هاتی، بەڵام باڵەکانم بە پێچەوانەی ئارەزوی گەورەکانەوە بردیانیت بۆ ناو بەلەمەکە!" "زۆر چاکە" براکەم وتی، ئێمە لەو جۆرە مرۆڤانەین کە چیمان بوێت دەیبەین و دەشتوانین لە زۆر کەسی تری بپارێزین. ئەبوایە بە رۆژی روناك بمانبردایە، منیش وتم، "تازووە بابڕۆین چونکە لەوەتەی ئەم پێی ناوەتە ناو بەلەمەکەوە من هەر بیر لە پیاوە بیٚ شومارەکانی سەرۆك دەکەمەوە"."راست دەکەی، باهەر ئێستا بکەوینە ریٚ" براکەم وتی. ئێستا ئێمە دەربەدەرین و ئەم بەلەمە نیشتمانی ئێمەیەو دەریاش پەناگەمانە. براکەم لەسەر کەنارەکە کەمێك خۆی دواخست، منیش پێم وت کە تۆزێك خێرابکات چونکە تەپەکانی دڵیم بیرکەوتەوە کاتێك سەری نابوو بە سنگمەوە و بیریشم کردەوە کە دوو پیاو ناتوانن بەرەنگاری سەدان پیاو ببنەوە. رۆیشتین، لە نزیك کەناری روبارەکەو بەرەو خوار دەستمانکرد بە سەوڵ لێدان و کاتێکیش بەلای ئەو چەمەدا رۆیشتین کە ئەوان راوەماسیان تێدا دەکرد بینیمان هاوارهاوارەکە نەمابوو، بەڵام غەڵبەغەڵبەکە هێندە زۆر بوو دەتوت فرەی پۆلە مێرووە کە لە نیوەڕواندا دەفڕن. بەلەمەکان لەناو روناکییە سورەکەی چراکان و لە ژێر سەربانێکی رەشی دوکەڵدا، کەوتبونە سەر ئاوەکە و چوبوون بەناویەکدا و پیاوەکانیش باسی ئەو جۆرە وەرزشەیان دەکرد، پیاوە لە خۆبایی بووەکان، ئەوانەی خۆیان هەڵدەکێشا و قاقایان لێدەدا و گاڵتەیان بە خەڵکی تر دەکرد، ئەو پیاوانەی هاوڕێمان بوون، بەڵام ئەو شەوە بوبوون بە دوژمنمان. لەسەرخۆ بەردەوام بوون لەسەر سەوڵ لێدان. لەو نیشتمانەدا کە شوێنی لەدایکبونمان بوو هیچ هاوڕێیەکمان نەبوو. دیامێلێن لە ناوەڕاستی بەلەمەکەدا دانیشتبوو و سەری خستبووە کۆشییەوە، ورتەی لێوە نەدەهات وەك چۆن ئێستا بێدەنگە، هیچی نەدەبینی وەك چۆن ئێستا هیچ نابینیٚ، منیش پەشیمان نەبووم لەو رۆیشتنەم چونکە لە تەنیشت خۆمەوە گویٚم لە دەنگی هەناسەی بوو وەك چۆن ئێستاش گویٚم لێیە". پشوویەکی دا، روی وەرگێڕا بۆ لای دەرگاکە و گوێی هەڵخست، پاشان سەرێکی باداو کەوتەوە قسەکردن، "براکەم ویستی بە تەحەدایەکەوە هاوار بکات. تەنها یەك هاوار، تاکو خەڵك بزانێت ئێمە ئەو دزانەین کە بە ئازادی لەدایك بووین و ئەوانیش باوەڕیان بە دەست پاکی ئێمە و بە دەریا گەورەکە کرد. سوێندم دا بە خۆشەویستییەکەمان کە بێدەنگ بێت. ئەوە نییە لە تەنیشتمەوە گویٚم لە دەنگی هەناسەیەتی؟ دەمزانی بە زوترین کات شوێنمان دەکەون و دەمانگرن. براکەم خۆشی دەویستم بیٚ ئەوەی بهێڵێت شڵپەی بێت سەوڵەکەی بە ئاوەکەدا دەهێنا و دەبرد. تەنها وتی، "تۆ نیوە پیاوی، نیوەکەی ترت ئەو ژنەیە. چاوەڕیٚ دەکەم، کەی بویت بە پیاوی تەواو لەگەڵما بگەڕێرەوە بۆ ئێرە تاکو بیٚ باکانە هاوار بکەی". من وەڵامم نەدایەوە. هەموو هێز و تینێکم لەو دەستانەدا بوو کە سەوڵەکانیان گرتبوو چونکە حەزم دەکرد لە شوێنێکی سەلامەتدا لەگەڵ ئەودا بژیم دور لە توڕەیی پیاوەکان و رقی ژنەکان. خۆشەویستییەکەم هێند گەورەبوو بەس لە غەزەبی ئینچی میدا و شمشێری سەرۆك رزگارم بوایە وام هەست دەکرد بەرەو وڵاتێك بمبات کە لە فەرهەنگی وشەیدا شتێك نەبێت بە ناوی مردنەوە. بە خێرایی

سەوڵمان لێدەدا و هەناسەبڕکێمان پێکەوتبوو. دەمی سەوڵەکان بە تەواوی لە ئاوە هێمنەکەدا نقوم دەبوو. رووبارەکەمان بڕی و چووینە ناو جۆگەلە تەنکەکانەوە. بە دەوری کەنارە تاریکەکەدا سوڕاینەوە، بەدەوری کەنارە لمینەکەدا، لەو شوێنەدا کە دەریا دەیچرپاند بە گوێی خاکدا، روناکی لمێکی سپی دای لە بەلەمەکەمان و شەوقی دایەوە. هیچ قسەمان نەدەکرد تەنها یەك جار نەبێت من وتم، "بخەوە دیامیلین با هێز و تینت تێبێتەوە چونکە لەوانەیە بەم زوانە پێویستت پێیان بێت!" گوێم لە دەنگە ناسکەکەی بوو، بەڵام هەرگیز رووم بۆ وەرنەگێڕا. خۆرهەڵهات و ئێمە هێشتا هەر دەڕۆیشتین، وەك چۆن باران بە لێزمە لە هەور دێتە خوار ئاوها ئارەق بە دەم و چاوماندا دەهاتە خوارەوە. بە ڕۆژی روناك و بە گەرما رۆیشتین. هەرگیز سەیری دواوەم نەدەکرد، بەڵام دەمزانی براکەم لە دوامەوە بێ چاو تروکاندن سەیری پێشەوە دەکات، بەلەمەکە زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت و دەتوت تیری راوچیانەو لە (سەمپیتان)ەوە* دەردەچێت (*sumpitan* جۆرە تفەنگێکە لە مالیزیا زۆر بڵاوە و تیری پێدەهاوێژرێت). هیچ سەوڵ لێدەرێك و هیچ کەشتیوانێکیش هێندەی براکەم باش نەبوو. چەند جارێك پێکەوە بەم بەلەمە پێشبڕکێمان بردبۆوە، بەڵام هەرگیز وەك ئەو کاتەی پێکەوە بۆ دواجار سەوڵمان لێدا خۆمان ماندوو نەکردبوو! لە شارەکەماندا هیچ پیاوێك لە براکەم ئازاتر و بەهێزتر نەبوو. من هێزم لەبەر بڕابوو، نەمدەتوانی ئاوڕ بدەمەوە، بەڵام هەموو کاتێك لە پشتمەوە گوێم لە فیشکەی هەناسەی براکەم بوو کە تا دەهات دەنگی بەرزتر دەبوو. هێشتا هیچ قسەی نەکردبوو. خۆر هەڵکشا بەرەو چەقی ئاسمان. گەرما وەك کڵپەی ئاگر خۆی دەدا بە پشتمدا. پەراسووەکانم خەریك بوو دەتەقین، چیتر نەمدەتوانی هەوای پێویست هەڵمژم و پاشان بەدەم دوا هەناسەوە هاوارم کرد " با پشویەك بدەین". "... باشە" براکەم بە دەنگێکی گڕ وەڵامی دایەوە. "براکەم زۆر ئازاو بەهێز بوو، نەیدەزانی ترس و هیلاکی چییە!". هاژە هاژێکی بەهێز و نەرم، گەورە و خنکاو، هاژە هاژی گەڵا لەریوەکان، هاژە هاژی چڵی درەختەکان بە ناو قوڵایی دارستانە تێکچڕژاوەکەدا و بەسەر زۆنگاوە ئەستێرە رێژکراوەکەدا دەڕۆیشت و ئاوەکەش لە بەینی گردۆڵکەکانەوە بە شڵپەیەکی گەورە خۆی دەدا بە کۆڵەکە قوڕاوییەکەی خانووەکەدا. گڕەیەك خۆی دا بە روخساری دوو پیاوەکەدا و گڕەی هات و نەما. گڕەیەکە کورت بوو، دەنگێکی بەرزی لێوەهات، لە ئاهی پڕ حەسرەتی زەوی دەچوو لە کاتی خەوبینیندا. ئارسات بە دەنگێکی نزم بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی، "بەلەمەکەمان لەسەر کەنارێکی رەنگ سپی کەنداوێکی بچوك راگرت لە نزیك دورگەیەکەوە کە کەوتبوە قوڵایی دەریاوە و بە درەختی بەرز دەورە درابوو، پێدەچوو ئەوە کۆتایی ڕێگەکەمان بێت. براکەم شارەزای ئەو شوێنە بوو. لە پشت ئەو دورگەیەوە دەروازەی روبارێك و لە جەنگەڵەکەشدا تولە رێیەك هەبوو. ئاگرمان کردەوە و دەستمان کرد بە برنج لێنان. پاشان ئێمە لەسەر لمە نەرمەکە و لەبەر سێبەری بەلەمەکە راکشاین تاکو سەرخەوێك بشکێنین و دیامێلێنیش پاسەوانی دەکردین. هێشتا بە تەواوی چاوم نەچووبووە خەو کە قیژاندی. بەرزە پێ هەستاینە سەرپێ. خۆر دەمێك بوو چەقی ئاسمانی جێهێشتبوو، بەرەو ئاوابوون ملی نابوو. لە ناو کەنداوەکەوە کەشتییەکەمان بینی کە ژمارەیەکی زۆر پیاو سەوڵیان لێدەدا. یەکسەر زانیمان کە ئەمە یەکێکە لە کەشتییەکانی میرەکەمان. سەیری کەنارەکەیان

دەکرد و ئێمەیان بینی. بە توندی کێشایان بە زەنگی ئاگادارکردنەوەکەی ناو کەشتییەکەدا و سەری کەشتییەکەیان بەرەو کەنارەکە وەرگێڕا. هەستم بە ترسێکی زۆر کرد. دیامێلێن لەسەر لمەکە دانیشتبوو. روخساری بە هەردوو لەپی دەستی داپۆشیبوو. لە دەریادا راکردن نەبوو. براکەم پێکەنی. بەڕێز ئەو تفەنگەی پێبوو کە تۆ پێش ئەوەی بڕۆیتەوە دابوت پێی، بەڵام تەنها مشتێك باروتی پێبوو. خێرا پێی وتم، "بەم ڕێگایەدا بە راکردن بڕۆن. من وایان لێدەکەم پاشەکشە بکەن چونکە چەکیان پێ نییە و دابەزینیش بۆ روبەروبونەوەی پیاوێکی چەکدار مانای مەرگێکی مسۆگەرە بۆ هەندێکیان. لەگەڵ ئەودا راکە. لە پشت ئەو دارانەوە ماڵی راوچییەك و بەلەمێکی لێیە، منیش کە هەموو فیشەکەکانم تەقاند بە دواتاندا دێم، لە راکردندا زۆر خێرام و پێش ئەوەی ئەوان بێن ئێمە بۆی دەردەچین. تا بتوانم بەرگری دەکەم، بەڵام ئەو ژنە، نە ئەتوانێ رابکات نە ئەشتوانێ شەڕ بکات، تەنها دڵی تۆی لە دەستە لاوازەکانیدا هەڵگرتووە! کاکم خۆی هەڵدایە پشت بەلەمەکەوە. کەشتییەکە بەرەو پێشەوە دەهات. من و دیامێلێن رامانکرد. کاتێکیش بە ڕێگاکەدا دەڕۆیشتین گوێم لە دەنگی تەقەبوو. کاکم تەقەی کرد، جارێك – دوو جار، دەنگی زەنگە گەورەکە وەستا. هەموو شتێك لە دوامانەوە خامۆش بوو. ئەو شوێنەی پێیدا دەڕۆیشتین تولە ڕێیەکی باریك بوو. پێش ئەوەی گوێم لێبێت سێیەم فیشەك بتەقێنێ، چاوم بە کەناری ئاوێك کەوت، جارێکی تر چاوم بە ئاو کەوتەوە کە دەمی روبارێکی گەورەبوو. بە ناو پانتاییەك لە گیای سەوزدا رۆیشتین. رامانکرد بەرەو ئاوەکە. لەسەر لیتە رەشەکەی کەنارەکە کوخێکی بچوکم بینی و لەولاشەوە بەلەمێك کە بەسترابۆوە. لە دوامەوە گوێم لە دەنگی تەقەیەکی تر بوو. بیرم کردەوە، "ئەوە دوا فیشەکییەتی تەقاندویەتی". بە هەڵەداوان چووین بۆ لای بەلەمەکە. پیاوێك بە راکردن لە کوخەکە هاتە دەرەوە، بەڵام پەلامارم دا و لە قوڕەکەدا خۆمان هێناو برد. پاش بێنەوبەردەیەکی زۆر من هەستامەوەو ئەویش لەبەر پێمدا کەوتبوو، دڵنیا نەبووم لەوەی کە کوشتبووم یان نا. من و دیامێلێن پاڵمان بە بەلەمەکەوە نا بۆ ناو ئاوەکە. لە دوامانەوە گوێم لە هاوار هاوار بوو، کاکمم بینی بە ناو گیاکەدا رایدەکرد، ژمارەیەکی زۆر پیاوی بە دواوە بوو.. ئەوم هەڵگرت خستمە ناو بەلەمەکەوەو خۆشم بە دوایدا بازم دایە ناوەوە. کە ئاوڕم دایەوە بینینم براکەم کەوتووە. ئەکەوت و هەڵئەستایەوە، بەڵام پیاوەکان چواردەوریان گرتبوو. هاواری کرد، "وا هاتم". پیاوەکان لێی نزیك بوونەوە. سەیری ئەو دیمەنەم دەکرد. پیاوەکان ژمارەیان زۆر بوو، پاشان سەیرێکی دیامێلێنم کرد. بەڕێز، پاڵم نا بە بەلەمەکەوە! پاڵم نا بە بەلەمەکەوە بەرەو قوڵایی ئاوەکە. دیامێلێن کەوتبووە سەر چۆك، سەیری منی دەکرد و منیش بەدەم سەوڵ لێدانەوە پێم وت، "سەوڵەکەی خۆت هەڵگرە". بەرێز گوێم لە کاکم بوو هاواری دەکرد. گوێم لێبوو دووجار بانگی کردم و گوێم لە چەند دەنگێکی تر بوو هاواریان دەکرد "بیکوژن! لێیدەن!". "هەرگیز ئاوڕم نەدایەوە. گوێم لێبوو بەدەم هاوارێکی بەرزەوە دوبارە بانگی کردم، پێدەچوو لەگەڵ هاوارەکەدا گیانیشی دەرچوبێت. منیش هەرگیز ئاوڕم نەدایەوە. ناوی خۆم!... کاکم! سێ جار بانگی کردم، بەڵام من لە ژیان نەترسام، ئەی دیامێلێنیش لە بەلەمەکەدا نەبوو؟ نەمدەتوانی لەگەڵ ئەودا شوێنێك بدۆزمەوە کە مەرگی تێدا لە بیر کرابێت – کە مەرگی تێدا نەبێت!". پیاوە سپی پێستەکە هەستایە سەرپێ،

ئارساتیش بە پێوە وەستا، وەك تارماییەكی بێدەنگ و لێڵ وابوو بەسەر پشكۆ كزەكانی ئاگرەكەوە كە لە سەرەمەرگدا بوون، لەسەر زۆنگاوەكەوە تەمێك بەرزبۆوە، بە نزمی كشاو لەسەرخۆ جەستە درەوشاوەكانی ئەستێرەكانی دەسڕییەوە. هەڵمێكی سپی سارد زەوییەكەی داپۆشیبوو، بە ناو تاریكییەكەدا دەڕۆیشت و بە دەوری قەدی درەختەكان و سەكۆی خانووەكەدا كە دەتوت كەوتۆتە سەر دەریایەكی سەرهەڵگرتوی پڕ نهێنی بە بێدەنگی گێژی دەخوارد. درەختەكان چوبوون بە ئاسماندا و بە ترۆپكەكانیان هێلێكیان دروست كردبوو كە لە كەنارێكی تاریك و ترسناك، لە كەنارێكی هەڵخەڵەتێنەر و بێ بەزەیی دەچوو. دەنگی ئارسات دڕی بە بێدەنگییەكە دا، "لەوێ دیامێلێنم لەگەڵدا بوو! لەگەڵمدا بوو. بۆ ئەوەی دیامێلێنم دەست بكەوێت ئامادەبووم بەرەنگاری هەموو بەشەریەت ببمەوە، بەڵام ئەم لەگەڵمدا بوو.. وە...". قسەكانی لەو چۆڵەوانییەدا دەنگیان دەدایەوە. كەمێك وەستا، دەتوت بۆ ئەوە وەستاوە تا گوێ لە قسەكانی خۆی بگرێت بزانێت كەی لە شوێنێكی دورەدەست و بێ ئەوەی بتوانێت بیانگێڕێتەوە دەمردن. پاشان بە هێمنی وتی، "بەڕێز، من براكەی خۆمم خۆشدەویست". كزەبایەكی سارد هەڵی لەرزاند. گەڵا هەڵوەریوەكانی دار خورماكان پێكەوە بەسەر سەریدا و بەسەر دەریا بێدەنگە هەڵمییەكەدا هاڕەیان كردو دەنگێكی كپ و مردوویان لێوەهات. پیاوە سپی پێستەكە قاچەكانی راكێشا. چەناگەی كەوتە سەر سنگی و بێ ئەوەی سەری بەرز بكاتەوە لەبەر خۆیەوە دەستی كرد بە ورتە ورت، "ئێمە هەموومان براكانی خۆمان خۆشدەوێت". ئارسات بە دەنگێكی نزم و بە توندی وتی، "من چ باكم بوو كێ دەمرێت؟ من خۆشگوزەرانی خۆمم دەویست". پیاوە مالیزییەكە هەڵوەستەیەكی كرد، پێدەچوو گوێی لە دەنگێك بوبێت لە ژوورەوە، پاشان لەسەرخۆ و بێ چپە چووە ژوورەوە. پیاوە سپی پێستەكە هەستایە سەرپێ. ناوە ناوە كزەبایەك هەڵی دەكرد. ئەستێرەكان بە ئاستەم تروسكەیان دەهات دەتوت كشاونەتەوە بۆ قوڵاییە بەستوەكانی ئاسمانی پان و بەرین. كزەبایەكی سارد بۆ چەند ساتێك بێدەنگییەكی بە دوای خۆیدا هێنا. دواتر لە پشت دارستانەكەوە كە بەدەم شنەی بایەكەوە دەشنایەوە، تیشكێكی ئاڵتونی بەرەو ئاسمان هەڵكشاو بە ئاسۆ نیمچە بازنەییەكەدا بڵاوبۆوە. خۆر هەڵهات. تەمەكەش بەرز بۆوە و بوو بە چەند پارچەیەكی پەرش و بڵاو و لەناو گەڵا تەنكەكانی درەختەكاندا ونبوون. زۆنگاوەكەش لەبەر سێبەری دارەكاندا بە رووتی راكشابوو، رەنگێكی رەشی بریقەداری هەبوو. هەڵۆیەكی سپی لەسەر زۆنگاوەكە بەرزبۆوەو بە هێواشی و لەسەرخۆ فڕی تاكو گەیشتە ئاستی تیشكی خۆرەكە و شەوقێكی دایەوەو پاشان بەرزتر بۆوەو بوو بە پەڵەیەكی رەش و بێ جوڵە، ئیتر دیار نەما و دەتوت بۆ هەتا هەتایە زەوی جێهێشتووە. پیاوە سپی پێستەكە كە لە بەردەم دەرگاكەدا وەستابوو و بەرەو لای سەرو دەیڕوانی، لە ناو كوخەكەوە گوێی لە ناڵە ناڵ و هات و هاوارێكی شڵەژاو و پچڕ پچڕ بوو كە بە ئاخێكی درێژ كۆتایی هات. لە ناكاو ئارسات لە كوخەكە دەرپەڕییە دەرەوە. باڵەكانی بڵاوكردبۆوە و لەرز دایگرتبوو. بۆ ماوەیەك بێ جوڵە وەستاو چاوی لێ نەدەتروكاندم، پاشان وتی، "ئیتر تای لێنایەت". لەبەردەم ئەودا و بەسەر ترۆپكی درەختەكانەوە لێوارەكانی خۆر دەركەوت كە راستەوخۆ بەرەو ئاسمان هەڵدەكشا. شنەبایەكی فێنك هەڵیكردبوو، روناكییەكی گەورە

لەسەر زۆنگاوەکە شەوقی دایەوە و لەسەر وردە شەپۆلەکانی ئاوەکە وەك پولەکە دەبریسکایەوە. دارستانەکان لە سێبەرە رونەکەی ئەو بەیانییە هاتنە دەرەوە و بە ئاشکرا دەبینران دەتوت هاتونەتە پێشەوە بۆ ئەوەی کەمێك لە ناو لەرینەوەی گەڵاکان و سەرلەقاندنی قەدی درەختەکان و سەماکردنی چڵەکانیاندا بوەستن. لەو خۆرەتاوە بێ بەزەییەدا، چرپەی ژیانی بێ ئاگا بەرزتر بۆوە، بە دەنگێك کە تێی نەدەگەیشتی بە دەوری سێبەرە لاوازەکەی ئەو مرۆڤە خەفەتبارەدا کەوتە ورتە ورت. ئارسات بە هێواشی بەدەور و پشتی خۆیدا دەیڕوانی و دواتر چاوی بڕیە خۆرەکە. "هیچ نابینم" ئارسات لەبەر خۆیەوە وتی. "هیچی لێ نییە" پیاوە سپی پێستەکە ئەمەی وت و بەرەو لێواری سەکۆکە ڕۆیشت دەستی بۆ بەلەمەکەی راوەشاند. وەڵامێکی کورت و خنکاو لە زۆنگاوەکەوە هات و وردە وردە بەلەمەکە هات بەرەو لایماڵی هاوڕێی خێوەکان. "ئەگەر حەز دەکەیت لەگەڵمدا بێیت چاوەڕێت دەکەم" پیاوە سپی پێستەکە بە ئارساتی وت. "نەخێر بەڕێز" ئارسات بە نەرمی وەڵامی دایەوە. "جارێکی تر لەم خانوەدا نە نان دەخۆم نە دەشخەوم، بەڵام پێش هەموو شتێك پێویستە بەرپێی خۆم ببینم. ئێستا من هیچ نابینم — هیچ نابینم! لە جیهاندا نە روناکی هەیە نە ئاشتی، بەڵام مردن هەیە، مردن بۆ زۆر کەس. ئێمە کوڕی یەك دایکین — کەچی من لە ناو دوژمنەکاندا بە تەنیا جێم هێشت، بەڵام ئێستا دەگەڕێمەوە". هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بە منگە منگێکەوە دەستی کردەوە بە قسەکانی، "پاش ماوەیەکی کەم بەشی ئەوە ئەتوانم ببینم کە بڕۆم — کە بڕۆم، بەڵام دیامێلێن مردووە و.. ئێستا... تاریکی". هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو پاشان داینانەوەو بەبێ جوڵە بە پێوە وەستاو بە دوو چاوی بەرد ئاساوە روانییە خۆرەکە. سەوڵ لێدەرەکان بە لێواری بەلەمەکەدا بە دوای یەکدا دانیشتن و لەسەر شانی یەکترەوە دەیانڕوانییە سەرەتای دەستپێکردنی گەشتێکی پڕ لە هیلاکی و ماندووبوون. کەشتیوانەکە پەڕۆیەکی سپی لەسەریەوە ئاڵاندبوو و لە بەشی دواوەی بەلەمەکە بە غەمبارییەکەوە دانیشتبوو، سەوڵەکەی شۆڕکردبۆوە بۆ ناو ئاوەکە و بە دوای خۆیدا رایدەکێشا. پیاوە سپی پێستەکەش هەردوو قۆڵی خستبووە سەر سەربانە پوشەکەی ژورە بچوکەکەی بەلەمەکە و سەیری ئەو شەپۆلە وردانەی دەکرد کە بەلەمەکە دروستی دەکردن. ئارسات لە شوێنی خۆی نەجوڵابوو. لەبەر خۆرەکە بە تەنها و بە پێوە وەستابوو، لە پشت روناکییە گەورەکەی رۆژێکی ساماڵەوە دەیڕوانییە تاریکی جیهانێکی سەرابی.

### سەرچاوە

*Modern short stories*

# دیموكراسی:
# بیرۆكەیەك لە تازەبوونەوەدا

ئالان تۆرین
لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

## سەركەوتنێكی گوماناوی

دیموكراسی بیرۆكەیەكە تازەدەبێتەوە. چونكە كاتێ رژێمە دەسەلاتخوازەكانی خۆرهەلات و باشور هەرەسیان هێناو ولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا جەنگی ساردی لە دژی یەكێتی سۆڤێت بردەوە، ئەو یەكێتیەی پاش لەدەستدانی ئیمپراتۆریاو حیزبە سەرتاپاگیرو توانا تەكنەلۆجیە پێشكەوتۆكەی، هەرەسی هێنا" لەوكاتەوە ئێمە باوەڕمان وایە كە دیموكراسی سەركەوتووەو ئەمڕۆ خۆی وەك فۆرمێكی سروشتی رێكخستنی سیاسی دەسەپێنێ، هەروەها وەك دەركەوتێكی سیاسی خۆی نمایشدەكا كە پشتئەستورە بە تازەكردنەوەی ئابوری بازاڕ لەڕووی فۆرمە ئابوریەكەیەوە، لەڕووی گوزارشتە رۆشنبیریەكەیشیەوە لەسەر عەلمانیەت دامەزراوە. بەلام ئەم بیرۆكەیەی كە خۆرئاواییەكانی خۆشحال كردووە، هێندە ساكارە كە باشتروابوو نیگەرانیان بكا. چونكە دیموكراسی نە بازاڕی سیاسی كراوەی كێبڕكێخوازەو نە ئابوری بازاڕیش بەتەنها كۆمەلگای پیشەسازی دروستدەكا. بەلكو دەتوانین بلێین: لە هەردوو حالەتەكەدا، سیستمی كراوە لەڕووی سیاسیو ئابورییەوە، تەنها تاكە مەرجێكی پێویستی دیموكراسی و گەشەی ئابورییە، نەك هەموو مەرجەكان. راستە دیموكراسی بوونی نیە، بەبێ بوونی ئازادی هەلبژاردنی دەسەلاتداران لەلایەن حوكمكراوەكانەوە، بێ بوونی فرەیی سیاسی، بەلام لەگەل ئەوەشدا ناتوانین قسە لە دیموكراسی بكەین ئەگەر ئەوانەی كە دەنگ دەدەن هیچ دەرەتانێكیان لەبەردەستدا نەبێ جگە لە هەلبژاردنی یەكێك لە بالە ئۆلیگارشیەكان، یان سوپا، یان دەزگای دەولەت. هەمان حالەتیش لە ئابوری بازاردا بەدیدەكرێ، چونكە راستە باوەڕێك

لەئارادایە دەربارەی سەربەخۆیی ئابوری لەئاست دەسەڵاتی دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان، یان کەنیسەیەك لە کەنیسەکان، یان کاستێك لە کاستە داخراوەکان" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین قسە لە کۆمەڵگایەکی پیشەسازی یان گەشەکردنێکی گەورەی ئابوری ناوخۆیی بکەین، گەر سیستمێکی یاساییو کارگێڕییەکی گشتی لەئارادا نەبێ لەسەر خاکێکی یەکگرتو و یەکتەواوکەر، هەروەها بەبێ بوونی ئەو کەسە باوەڕپێکراوانەی کە بەرهەمی نیشتمانی دەبەشنەوە.

چەندین ئاماژە لەئارادان دەمانگەیەننە ئەو باوەڕەی کە ئەو رژێمانەی ناونراون دیموکراتی بەرەو لاوازبوون دەڕۆن، هەروەك چۆن رژێمە دەسەڵاتگەرەکان لاوازبوون، چونکە کەوتونەتە ژێر باری بازاڕێکی جیهانی بەهێزو تەگبیربۆکراو لەلایەن هێزی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە، هەروەها بەهۆی رێکەوتنەکانی نێوان سێ نێوەندە سەرەکیەکەی دەسەڵاتی ئابوری (جیهان)ەوە. ئەم بازاڕە جیهانییە نەرمی دەنوێنێ لەئاست وەرگرتنی وڵاتە جیاوازەکان، کە هەندێکیان وڵاتی دەسەڵاتگەری بەهێزن، هەندێکیان رژێمی خاوەن دەسەڵاتن کە بەرەو لاوازبوون دەڕۆن، هەندێکیشیان وڵاتی خاوەن رژێمی ئۆلیگارشین، دواجاریش هەندێکیان ئەو رژێمانەن کە دەکرێ ناویان بنرێ دیموکراتی، واتە ئەو رژێمانەی کە حوکمکراوەکان بەئازادی نوێنەری خۆیان لە دەسەڵاتداران هەڵدەبژێرن.

ئەم بۆپاشەوەچونەی کە وڵاتان بەخۆیانەوە دەیبینن، جا وڵاتی دیموکراتی بن یان نا، هاوکاتە لەگەڵ نزمبوونەوەی بەشداری سیاسیو بۆتە هۆی ئەو شتەی، کە بەهەق، ناونراوە قەیرانی نوێنەرایەتی سیاسی. چونکە دەنگدەرەکان هەستناکەن نوێنەرایەتی دەکرێن. ئەوان گوزارشت لەم حاڵەتە دەکەن لەڕێگای ناڕەزایی دەربڕین دژی ئەو چینە سیاسییەی کە تاکەکانی هیچ مەبەستێکیان نیە جگە لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی تایبەتی، هەندێ جاریش لە کۆششی ئەوەدان خۆیان دەوڵەمەند بکەن. هەستکردن بە هاوڵاتیبوون و مافەکانی هاوڵاتیبوون بەرەو لاوازبوون دەڕوا، ئیدی هۆکارەکەی ئەوەبێت کە زۆربەیان هەست بەوەدەکەن بەرخۆرن (مستهلك)ن نەك هاوڵاتی، یان کۆسموپۆلۆتین نەك رۆڵەی نەتەوەیەکی دیاریکراو" یان بەپێچەوانەوە هەندێکیان هەستدەکەن پەراوێزخراون و لە کۆمەڵگا دورخراونەتەوەو لەبەر چەند هۆکارێکی ئابوری یان سیاسی یان ئیتنی یان کولتوری هیچ بەشدارییەکیان پێناکرێ لە کاروباری کۆمەڵگادا.

لەکاتێکدا دیموکراسی بەمجۆرە لاوازبووبێت، کەواتە ئەگەری لەناوبردنی لەئارادایە، جا لە سەرەوە بێت لەلایەن دەسەڵاتێکی بەهێزەوە، یان لە بنەوە بێت بەهۆی پاشاگەردانیو زەبروزەنگ و جەنگی ناوخۆوە، یان بە دیاریکراوی بەهۆی ئەو چاودێریو سانسۆرەی سەردەسەڵاتەوە بێت کە توێژە ئۆلیگارشیەکان و حزبەکان پێڕەوی دەکەن و لەگەڵیدا داهاتی ئابوریو سیاسی خڕدەکەنەوە، بەمەبەستی سەپاندنی جۆری هەڵبژاردن بەسەر هاوڵاتیاندا، کە ئێستا تەنها بوونەتە دەنگدەرو هیچی تر. خەسڵەتێکی تایبەتی سەدەی بیستەم تاڕادەیەکی زۆر ئەوەبوو رژێمە تۆتالیتارەکان لەئارادابوون، ئیدی خەڵك باوەڕیان وابوو کە تەنها لەناوبردنی ئەو رژێمانە بەڵگەیەکی بەسە بۆ سەلماندنی سەرکەوتنی دیموکراسی. بەڵام لەقاڵبدانی پێناسەی دیموکراسی لە داڕشتنێکی نەرێخواز (سەلبی)و ناڕاستەوخۆی پەتیدا، واتە

کورتکردنەوەی شیکردنەوەکە لە چوارچێوەیەکی ناپەسەندو ناڕەوادا. بۆیە ئیتر مافی خۆیەتی "جیوڤانی سارتۆری"، لەدوا کتێبیدا هەروەکو کتێبی یەکەمی، نکوڵی تەواو بکا لە جیاکردنەوەی دووە فۆرمەکەی دیموکراسی: سیاسیو کۆمەڵگەیی، رواڵەتیو کردەیی، بۆرجوازیو سۆشیالیستی، (ئەو چەمکانەی) کە ئایدیۆلیۆجیستەکان حەزدەکەن گوزارشتی لێبکەن، تا ئەو شوێنەی دەڵێ دیموکراسی یەك دیموکراسییە. سارتۆری دووجار لەسەر هەقە: یەکەم لەبەرئەوەی ئێمە ناتوانین تاکە وشەیەك لە واتای دوو واقعی جیاوازدا بەکاربێنین، ئەگەر بێتو لەنێوان ئەو دوو واقعەدا رەگەزی هاوبەشی گرنگ لەئارادا نەبێت" دووەم لەبەرئەوەی ناونانی دیموکراسی لە رژێمێکی دەسەڵاتگەر، بەڵکو دەسەڵاتگەری تۆتالیتار، خۆی لەخۆیدا ناونانێکی پوچەو خۆی پوچەڵدەکاتەوە.

ئایا تەنها هێندە بەسە بڕوانینە میلی کاتژمێر، کە لەجوڵەی بەردەوامدایە، بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ ئازادییە دەستوریەکان، پاش ئەوەی چاخێکی تەواو، کە سەرەتاکەی لە فەرەنسا ساڵی ١٨٤٨ دەستیپێکرد، کۆششمان کرد لەپێناو ئەوەی ئازادی سیاسی، ئازادی ئابوریو ئازادی کۆمەڵگەییش بگرێتەوە؟ هەڵوێستێکی لەمجۆرە هیچ وەڵامێکمان ناداتێ سەبارەت بەو پرسیارەی دێتەگۆڕێ سەبارەت بە چۆنیەتی تێکەڵکردن و لێکگرێدانی دەسەڵاتی یاسا لەگەڵ نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکان. چونکە ئەوە تەنها ئاماژەیەکە بۆ دژبوونی نێوان هەردوو ئامانجەکە، پاشان بۆ ئاستەمبوونی بنیاتنانی دیموکراسی بەڵکو ئاستەمبوونی پێناسەکردنی. بەم چەشنە سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە بۆ ئەو خاڵەی کە لێوەی دەستمان پێکرد. کەواتە لە هەلومەرجێکی وادا، با وەك "نۆربرتۆ بۆبیتۆ" رێکبکەوین لەسەر پێناسەکردنی دیموکراسی کە بریتیە لە سێ پرەنسیپی دامودەزگایی سەرەکی" سەرەتا دەڵێین: دیموکراسی "کۆمەڵێك یاسای بنەڕەتییە کە دەستنیشانی ئەوە دەکەن کێ ئەو مافەی هەیە بڕیارە دەستەجەمعیەکان دەربکاو لەو مافەدا پشت بە چ فەرمانێك ببەستێ؟"(ئایندەی دیموکراسی: ل٥)، دووەم دەڵێن: ئەو رژێمە زیاتر دیموکراتیە کە تیایدا زۆرترین ژمارەی خەڵك، بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەشداری دەکەن لە وەرگرتنی بڕیاردا. سێیەم: جەختکردن لەسەرئەوەی دەبێ هەڵبژاردن، بەکردەوە هەڵبژاردن بێت. با ئەوەش وەك بەڵگەنەویستێك وەرگرین کە دیموکراسی دامەزراوە لەسەر وەلانانی تێگەیشتنی ئۆرگانیکی کۆمەڵگاو گۆڕینی ئەو تێگەیشتنە بۆ دیدێکی تاکگەرانە، کە توخمە سەرەکیەکانی کورتدەکرێنەوە لە: بیرۆکەی پەیمان، گۆڕینی چەمکەکەی ئەرستۆ لە (بونەوەری سیاسی)یەوە بۆ ئۆمیکۆنۆمیکۆس واتە بۆ (بونەوەری ئابوری) یان بەرەو رێچکەی سودگەریو کۆششکردن بۆ بەدیهێنانی کامەرانی بۆ زۆرترین کەس. بەڵام دوای ئەوەی "بیبۆ" ئەم تێزە لیبراڵە دەخاتەڕوو، بۆمان ئاشکرادەکا کە هاندەری سیاسی زۆر جیاوازترە لەو نمونەیەی کە باسمانکرد" چونکە رێکخراوە گەورەکان، حزبەکان و سەندیکاکان، قورساییەکی گەورە دەخەنەسەر ژیانی سیاسی، بەجۆرێك زۆرجار دەبێتەهۆی داماڵینی گەل "کە پێویستە خۆی سەرداری خۆی بێت" لەهەموو خەسڵەتێکی واقعی. چونکە بەرژەوەندییە تایبەتەکان بوونیان نامێنێ گەر لەلایەن کارگێڕیی گشتییەوە ئاڕاستەبکرێن، هەروەها توێژە ئۆلیگارشیەکان وەك خۆیان دەمێننەوە. ئەمە جگە لەوەی شێوازی دیموکراسی لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەییدا ناخرێتەگەڕ. ئیدی

کاری نهێنی، کە دژی دیموکراسییە، رۆڵێکی گرنگ دەبینێ‌و زۆرجار لەپشت فۆرمەکانی دیموکراسیەوە حکومەتێك لە تەکنۆکرات و خەڵکانی دەزگاکان پێکدەهێنرێ. لەپاڵ ئەم گومانانەدا پرسیارێکی ریشەیی تر دێتەگۆڕێ: ئەگەر دیموکراسی تەنها چەند یاساو هەڵسوکەوتێك بێت، ئیتر بۆ دەبێت هاولاتیان بە حەماسەوە بەرگری لێبکەن؟ بەم چەشنە کەس نامێنێتەوە ژیانی خۆی بخاتە بەرمەترسی لەپێناو یاسایەکی هەڵبژاردندا تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە خۆیان کاندید دەکەن.

لێرەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی دەبێ لەپشت یاسا ئیجراییەکانەوە، کە پێویستن بۆ بوونی دیموکراسی‌و ناکرێ دەستیان لێهەڵبگیردرێ، بەشوێن چۆنیەتی دروستبونی ئەو ئیرادەیەدا بگەڕێین کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندی زۆرینە دەکا، چۆنیەتی گوزارشتکردنی ئەو ئیرادەیە لە خۆی و چۆنیەتی پێڕەوکردنی. هەروەها دەبێ بگەڕێین بەدوای ئەو هوشیارییەی هەمواندا بەوەی هاونیشتمانین و بەرپرسن لە کاروباری کۆمەڵگەیی. چونکە یاسا ئیجراییەکان شتێك نین جگە لە ئامرازگەلێك لەپێناو ئەو مەبەستانەی کە سەرباری نەبوونی رێگەیەك بۆ چنگکەوتنیان بەتەواوی، بەلام دەبێ هەموو ماناکانیان لە چالاکیە سیاسیەکاندا رەنگبداتەوە: دەبێ رێگەنەدرێ بە چەوساندنەوەو کاری نهێنی، دەبێ داخوازیەکانی زۆرینە لەبەرچاو بگیرێ، زۆرترین ژمارەی خەڵك لەژیانی گشتیدا بەشداربن. بەلام حاڵی حازر، کە رژێمە دەسەلاتگەرەکان بۆ پاشەوەدەچن و ئەو رژێمە (دیموکراتیە میللیانە) روخاون، کە هیچ نەبوون جگە لە دیکتاتۆریەتی تاکحزب بەسەر گەلێکی دیاریکراوەوە، ناکرێ تەنها باس لە زەمانەتی دەستوری‌و یاسایی بکەین، لەکاتێکدا ژیانی ئابوری‌و کۆمەڵگەیی بەدەست ئەو توێژە ئۆلیگارشیانەوەیە، کە کەس ناتوانێ لێیانبپێچێتەوە.

ئەمەیە بابەتی کتێبەکەمان. ئەم کتێبە ترسی لە دیموکراسی بەشداریگەری هەیە، ترسی لە پرۆژەی دەسەلاتە مەرکەزیەکان هەیە، دژی ئەو بانگەشانە دەوەستێتەوە کە ئاڕاستەی گەل و نەتەوەو مێژو دەکرێن _ ئەو بانگەشانەی هەمیشە رەوایەتی بەو دەوڵەتانە دەبەخشن کە زادەی هەڵبژاردنی ئازاد نین _" لەهەمان کاتدا ئەم کتێبە پرسیاردەکا سەبارەت بەو ناوەرۆکە کۆمەڵگەیی‌و کولتورییەی کە رژێمە دیموکراتەکان لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا پەنای بۆ دەبەن. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، چەند رژێمێکی نیمچە دیموکراتی روبەڕووی چەند گوشارێك بوونەوە کە تێیانپەڕاندو لێی دەربازبوون، رەنگە ئەو تێپەڕاندنە بەهۆی دەرکەوتنی دیموکراسی پیشەسازی‌و دروستبونی حکومەتە سۆشیال دیموکراتەکانەوە بووبێ کە لەلایەن سەندیکاکانەوە پشتگیری دەکران، یان بەهۆی دروستبوونی ئەو حزبە شۆڕشگێڕانەوە بووبێ کە پێڕەوی فیکری "لینین"یان دەکردو هەموو ئەو کەسانەی کە روخاندنی رژێمە کۆنەکانیان لە دامەزراندنی رژێمی دیموکراتی پێ باشتربوو. ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە لێوانلێو بوو لە مشتومڕ سەبارەت بە دیموکراسی "کۆمەڵگەیی"، بەلام دیموکراسی دوای ئەوەی پێویستی بە ناوەرۆکێکی نوێ نەما دوچاری قەیران هاتەوە، تا ئەو رادەیەی دیموکراسی وەك کینایە بۆ ئازادی بەرخۆری‌و بازاڕی سیاسی بەکاردێ. خاوەن دیدەکان بەم تێگەیشتنە کاڵوکرچەی دیموکراسیەوە نیشتنەوە کاتێ ئیمپراتۆریای سۆڤێتی‌و رژێمەکەی هەرەسیانهێنا. بەلام مرۆڤ ئەو ساناکردنەوەیەی

پێ‌قووت ناچێ که دیموکراسی به شێوه‌یه‌کی نه‌رێخواز (سه‌لبی)و په‌تی پێناسه‌ده‌کا. ئه‌م تێگه‌یشتنه کرچه‌ی بیرۆکه‌ی دیموکراسی، له وڵاته لیبراڵیه‌کان و سه‌راپای وڵاتانی جیهاندا، دواجار ده‌بێته‌هۆی گوزارشتکردن له داواکاریی کۆمه‌ڵگه‌یی‌و ئومێدو خه‌ونی زیاتر، له ده‌ره‌وه‌ی پارله‌مانه‌کان، ته‌نانه‌ت له ده‌ره‌وه‌ی خودی سیاسه‌ت. ئه‌ی ئه‌وه ئێمه نین ده‌بینین له‌ملاوه گرفته کۆمه‌ڵگه‌ییه‌کان ده‌سپێردرێن به‌که‌رتی تایبه‌ت، له‌ولاوه ره‌چه‌ڵه‌کخوازی (ئسوڵیه‌ت) جۆشده‌درێ، به‌جۆرێك خه‌ریکه ده‌زگا دیموکراتیه‌کان هه‌موو توانایه‌ك له‌ده‌ستده‌ده‌ن و وه‌ك گه‌مه‌یه‌کی مینرپێژکراو، یان وه‌ك ئامرازێکیان لێهاتووه، بۆ خزمه‌تی ده‌ستێوه‌ردانی به‌رژه‌وه‌ندییه بیانیه‌کان له کاروباری کۆمه‌ڵگادا؟

له‌ئاست ئه‌م بێ‌ماناییه‌دا، باشتروایه هه‌وڵبده‌ین بۆ تێگه‌یشتنێکی نوێ که کاری دیموکراتی پێناسه‌بکا به‌وه‌ی ئازادکردنی ئه‌و تاك و گروپانه‌یه که لۆجیکی ده‌سه‌ڵات جڵه‌وی کردوون، واته ئه‌و که‌سانه‌ی ملکه‌چی جۆرێك له (سانسۆر)ن که له‌لایه‌ن سه‌رداره بزوێنه‌ره‌کانه‌وه له سیسته‌مه‌کاندا پێڕه‌وی ده‌کرێ، به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك بوونه‌ته که‌ره‌سه‌ی ئه‌و سیسته‌مانه.

کاتی خۆی هه‌ندێ که‌س میلله‌تانیان هانده‌دا که ده‌سه‌ڵات له ڕژێمه پاشایه‌تیه ره‌هاکان بپچڕن و کۆنترۆڵی بکه‌ن. به‌ڵام ئه‌و هاندانه شۆڕشگێڕییه بووه‌هۆی له‌دایکبوونی ئۆلیگارشیه نوێکان و هه‌ندێ جاریش بووه‌هۆی دامه‌زراندنی رژێمه سته‌مگه‌ره میللیه‌کان. به‌ڵام ئه‌و قۆناغه‌ی ئێستا پیای تێده‌په‌ڕین که فۆرمه‌کانی ئاماده‌سازی (تعبئه) جه‌ماوه‌ری باڵاده‌سته، جا له‌ڕووی سیاسیه‌وه بێ یان رۆشنبیری یان ئابوری، پێویست ده‌کا به‌ئاڕاسته‌ی پێچه‌وانه‌دا هه‌نگاوبنێن. ئه‌مڕۆ ده‌بینین بیرۆکه‌ی مافه‌کانی مرۆڤ به زه‌خمێکی گه‌وره‌تره‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه، چونکه ئه‌وانه‌ی هه‌ڵگری ئه‌م بیرۆکه‌یه بوون له به‌رهه‌ڵستکاره‌کان بوون، یان له یاخیه‌کان، یان خاوه‌ن دیده ره‌خنه‌ییه‌کان بوون، ئه‌وانه‌ی له رۆژگاره ره‌شه‌کانی ئه‌م چه‌رخه‌و قۆناغه سه‌خته‌کانیدا دژی ده‌سه‌ڵاته تۆتالیتاره‌کان تێکۆشاون. زه‌ینیه‌تی دیموکراسی به فه‌زڵی هه‌موو ئه‌و که‌سانه ژیایه‌وه که جه‌ختیان له‌سه‌ر مافه بنه‌ڕه‌تیه‌کان ده‌کرد له ژیاندا، وه‌ك که‌سانێکی ئازاد دژی ئه‌و ده‌سه‌ڵاته ره‌هاخوازانه‌ی که رۆژ له‌دوای رۆژ ده‌سه‌ڵاتی ره‌هایان په‌ره‌ی ده‌سه‌ند. ئه‌وانه، هه‌ندێ جار کرێکارو رۆشنبیره‌کانی "گادانسك" بوون، هه‌ندێ جار کرێکارو رۆشنبیره‌کانی "تێن ئان" بوون، هه‌ندێ‌جاریش تێکۆشه‌ره‌کانی بزاوتی مافه مه‌ده‌نیه‌کانی ئه‌مریکاو بزاوتی خوێندکارانی ئایاری ٦٨ی ئه‌وروپا بوون" هه‌ندێکیان ئه‌وانه‌بوون که دژی جیاکاری ره‌گه‌زپه‌رستی (ئاپارتاید) خه‌باتیان ده‌کرد، یان ئه‌وانه‌ی که تائێستاش دژی دیکتاتۆریه‌ت له به‌رمانیا خه‌باتده‌که‌ن، بزاوتی "ڤیکاریا دولا سۆڵیداریداد" له چیلی، نه‌یارانی سربیاو به‌رهه‌ڵستکاره بۆسنیه‌کان، سه‌لمان روشدی‌و ئه‌و رۆشنبیره جه‌زایریانه‌ی که هه‌ڕه‌شه‌ی تیرۆریان له‌سه‌ره‌و ...هتد.

ره‌نگه دیموکراسی ببێته ته‌نها وشه‌یه‌کی کرچ گه‌ر نه‌یبه‌ستینه‌وه به مه‌یدانه‌کانی تێکۆشانه‌وه، چونکه چه‌ندین ئافره‌ت و پیاو له‌پێناویدا خه‌باتیانکردوه. گه‌ر پێویست بکا پێناسه‌یه‌کی به‌هێز بۆ دیموکراسی بدۆزینه‌وه، ئه‌وا به‌شێکی ئه‌و پێناسه‌دۆزیه ده‌خوازێ شوناسی دیموکراتی له هه‌موو ئه‌و که‌سانه بستێنینه‌وه که به‌ناوی خه‌باتی دیموکراتیی دێرینه‌وه بوونه‌ته خزمه‌تکاری

حکومەتە رەهاخوازو ستەمگەرەکان. چونکە ئیدی ئێمە دیموکراسی بەشداریگەری (پەتی)مان ناوێ، تەنها دیموکراسی راوێژخوازیمان ناوێ، بەڵکو دیموکراسیەکی ئازادیخوازمان دەوێ.

ئەڵبەتە پێش هەموو شتێك پێویستە جیاکارییەك بکەین لەنێوان ئەو تێڕوانینانەی کە تاکەکان هەیانە دەربارەی "کۆمەڵگای باش"و لەنێوان پێناسەی سیستامی دیموکراتیدا. ناکرێ بوونی دیموکراسی وێنابکرێ بەبێ بوونی فرەیی، بێبوونی عەلمانیەت پڕبەمانای فراوانی وشەکە. چونکە گەر کۆمەڵگا وابزانێ دەزگاکانی شیاوترین و باشتر دەزگایە، ئەوا ئایدۆلۆجیاو بەهاکانی خۆی بەسەر ئەندامەکانی خۆیدا دەسەپێنێ سەرەڕای هەمەچەشنیە زۆرەکانیان. فەرمانڕەوایی وەك قوتابخانەی رەسمی وایە، ئەو قوتابخانەیەی کە جیاکاری دەکا لەنێوان شێوازی وانەوتنەوەی خۆیو شێوازی پەیوەندی تاکەکان لەنێوان خۆیان و جۆری هەڵبژاردنەکانیان. واتە نابێ وێنایەکی دیاریکراو سەبارەت بە خێرو شەڕ بسەپێنێ، بەڵکو دەبێ بەر لەهەر شتێك ئەو مافە بچەسپێنێ کە هەموو مرۆڤێك بۆی هەیە گوزارشت لە ئارەزو و بۆچونەکانی خۆی بکا. دەبێ هەموو کەس ئازاد بێو پارێزراو بێت، دەبێ ئەو بڕیارانەی نوێنەرانی گەل دەریدەکەن زۆرترین بایەخ بدەن بەو بۆچونانەی گوزارشتیان لێدەکرێو ئەو بەرژەوەندیانەی بەرگریان لێدەکرێ. بیرۆکە دەبێتە ئاینی دەوڵەت، ئەگەر بێتو دەوڵەت ژمارەیەك یاسای ئەخلاقیو فیکری بسەپێنێ، بیرۆکەیەکی لەمجۆرە لەسەرەوەی هەموو ئەو شتانەیە کە دژی دیموکراسییە. ئازادی رادەربڕین و کۆبونەوەو خۆڕێکخستن، ئازادییەکی بنەڕەتیە سەبارەت بە دیموکراسی، چونکە ئازادیەکی ئاوها هیچ حوکمێکی دەوڵەت لەخۆناگرێ لەئاست باوەڕە ئەخلاقیو ئاینیەکاندا.

تێگەیشتنێکی ئیجرایی بۆ ئازادی، بەس نیە بۆ رێکخستنی ژیانی کۆمەڵگەیی. چونکە یاسا زۆر لەوە دوورتر دەڕوا، کاتێ هەندێجار ڕێگەدەداو هەندێجار رێگەدەگرێ، بەچەشنێك جۆرە تێگەیشتنێکی دیاریکراو بەژیان و موڵکداریێتیو فێرکردن دەبەخشێ. بۆیە داخۆ دەتوانین بیر لە مافە کۆمەڵگەییەکان بکەینەوە کاتێ کورتدەکرێنەوە بۆ تەنها کۆدیکی ئیجرایی؟.

کەواتە چۆن دوو پێداویستی یان زیاتر بەدەستبێنین، کە لە رواڵەتدا دژبەیەکن: رێزگرتنی بێسنوری ئازادیە تاکەکەسیەکان لەلایەك و رێکخستنی کۆمەڵگا بەو شێوەیەی کە لە دیدی زۆرینەدا کۆمەڵگایەکی دادپەروەرە لەلایەکی ترەوە؟! ئەم پرسیارە دەخزێتە کرۆکی کتێبەکەمان لە دەسپێکەوە بۆ کۆتایی، بەڵام زانای کۆمەڵناس ناتوانێ چاوەڕوانیەکی زۆر بکا تا وەڵامێکی سۆسیۆلۆجی پڕاوپڕی چنگدەکەوێ، واتە وەڵامێك رەفتاری تاکە چالاکەکان لەکۆی پەیوەندیە کۆمەڵگەییەکاندا شیبکاتەوە. شتێك کە ئازادی نەرێخواز (سەلبی) دەبەستێتەوە بەئازادی ئەرێخوازەوە (ئیجابی) بریتیە لە ئارەزویەکی دیموکراتیانە بۆ بەخشینی توانا بە سەرکوتکراو و کەسە پاشکۆکان، تا بەئازادی هەڵسوکەوت بکەن، تا بتوانن لەگەڵ ئەو کەسانە بکەونە گفتوگۆوە کە جڵەوی داهاتە ئابوریو سیاسیو کولتوریەکانیان بەدەستەو یەکسان بن لەگەڵیاندا لە ماف و دەستەبەریەکاندا (زەمانەتەکان). هەربۆیە دانوستانی دەستەجەمعی لەلایەك و دیموکراسی پیشەسازی لەلایەکی ترەوە بەگشتی ، دوو سەرکەوتنی گەورەی دیموکراسین: چونکە شێوازی کاری سەندیکاکانی

کرێکاران و کرێگرتەکان دەرفەتی ئەوەی رەخساندوە کە بچنە دانوستانەوە لەگەڵ خاوەن کارەکاندا لە هەلومەرجێکدا کە تا ئەندازەیەکی زۆر خراپ نیە. بەهەمان شێوە ئازادی رۆژنامەگەری، کە تەنها بەرگری لە ئازادی تاکەکەس ناکا بەڵکو چانس دەبەخشێ بە مرۆڤە لاوازەکانیش تا دەنگی خۆیان بگەیەنن، لەکاتێکدا بەهێزەکان دەتوانن بەنهێنی بەرگری لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بکەن و چەندین تۆڕ سازو ئامادەدەکەن لەڕێگەی پەیوەندی خزمایەتیو هاوڕێیەتیو بەرژەوەندی دەستەجەمعییەوە. واتە لەنێوان دیموکراسی ئیجرایی، واتە ئەو فەرمانانەی کە هەموو حەماسێکیان لەدەستداوەو ... دیموکراسی بەشداریگەری، واتە ئەو شێوازەی بەشداری کە هیچ حیکمەتێکی لەپشتەوە نیە، کاری دیموکراسی سادەو ساکاردەبێتەوە، ئەو کارەی غایەتە بنەڕەتیەکەی ئەوەبوە کە تاکەکان و گروپەکان لەو بارە رزگاریان بێ کە سەرشانی قورسکردوون. دارێژەرانی زەینیەتی کۆماریخوازی لە هەوڵی ئەوەدابوون مرۆڤی _ هاوڵاتی دروستبکەن و خۆبەختکردنی تاکەکەسیان زۆر بەرز دەنرخاند لەپێناو بەرژەوەندی باڵای شاردا. ئەم خێرومەندییەی کۆماریخوازەکان باسی لێوە دەکەن لەبری ئەوەی قایلمان بکا زیاتر دەمانترسێنێ. چونکە ئێمە ئەمڕۆ پەنا نابەین بۆ دەوڵەت تا لەژێر باری نەریت و ئیمتیازەکان رزگارمان بکا" بەڵکو خودی دەوڵەت و هەموو فۆرمەکانی دەسەڵات دەمانترسێنن و بوونەتە سەرچاوەی نیگەرانی لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا (سەدەی بیستەم) کە رژێمە تۆتالیتارەکان و ئامرازەکانی داپڵۆسینیان زیاتر لە پێشکەوتنەکانی بەرهەمهێنان و بەرخۆری لە بەشێکی جیهاندا حوکمیان کرد. لەمێژە بەو زمانە راهاتووین کە دەسەڵاتە ستەمگەرەکان بەکاریدەهێنن بۆ جۆشدانی جەماوەرو گەل، هێندە راهاتووین کە چیتر نامانترسێنێ. تەنانەت چیتر شێوازەکانی دیسپلینی داخراو، کە بەناوی تەکنەلۆجیاو چالاکبوون و ئاسایشەوە بەسەرماندا دەسەپێندرا، قەبوڵ ناکرێن. دیموکراسی کاریگەریەکی بەهێزی نامێنێ، گەر بەسەر باڵی ئارەزوی ئازادبوونەوە، بەبەردەوامی نەفڕێ بەرەو ئاسۆ تازەکان و سنورە دوورەکان یەك لەدوای یەك تەی نەکا" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا دوورتر بڕوا نزیکتر خۆی دەنوێنێ، چونکە بەگژ هەموو ئەو فۆرمانەی خۆسەپاندن و داپڵۆسیندا دەچێتەوە کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە ئەزمونە شەخسیەکانەوە هەیە.

گەر پێناسەکردنی زەینیەتی دیموکراسی ئاوهابێت، کەواتە ئەو دوو پێداویستیە بەرجەستەدەکا کە سەرەتا دژبەیەك دەردەکەون: سنوردارکردنی دەسەڵات و بەجێهێنانی داواکانی زۆرینە. بەڵام لە چ هەلومەرجێکدا و تا چ سنورێك ئەمە سەردەگرێ؟ ئەم کتێبە هەوڵدەدا وەڵامی ئەو دوو پرسیارە بداتەوە.

## خودئازادی

تەواوی ئەم بابەتانە لە بابەتێکی مەرکەزیدا یەکدەگرنەوە کە بریتیە لە خودئازادی. مەبەستمان لە "خود" پێکهاتەی تاکەکەس یان "گروپ"ە، بەوپێیەی گروپیش خودێکی چالاکە کە لەیەك کاتدا ئازادی خۆی دەسەلمێنێو سود لە ئەزمونی ژیانی خۆیشی وەردەگرێو وانەی لێوە فێردەبێ. واتە خود کۆششێکە دەخرێتەگەڕ لەپێناو گۆڕینی هەلومەرجی ژیان بۆ کردارێکی ئازاد. ئازادی دەخاتە نێو ئەو روبەرانەوە کە پێشتر لە (چوارچێوەی) سنوری کۆمەڵگەییو کەلەپوری رۆشنبیریدا دەرکەوتوون.

ئەم کرداری ئازادییە چۆن پێڕەودەکرێ؟ ئایا تەنها هێندە بەسە بگەڕێینەوە بۆ هوشیاری مرۆڤ لەئاست خود و کەینونەی خۆیدا؟ نەخێر. چونکە خەسڵەتی تایبەتی کۆمەڵگای مۆدێرن بریتیە لە سەلماندنی ئازادی، بەوەی ئازادی بەر لەهەر شتێك، لە بەرەنگاری ئەو بارە قورسەدا بەرجەستەدەبێ کە لەلایەن دەسەڵاتی کۆمەڵگەییەوە دەخرێتەسەر کەسایەتیو رۆشنبیری. دەسەڵاتی پیشەسازی، وەك دەڵێن، ئاساییکردنەوەو رێکخستنی کاری بەجۆرێکی زانستی سەپاندوە، "کرێکار"ی بەزۆر ملکەچی تاقەکانی کار کردوە. پاشان ئەم دەسەڵاتە، لە کۆمەڵگای بەرخۆردا، سەرفکردنی زۆرترین بڕی لە ئاماژەکانی بەشداری سەپاندوە. هەرچی دەسەڵاتی سیاسی سازوئامادەکار (تەعبەوی)یشە، لای خۆیەوە، شێوازەکانی "وەلا"و لایەنگری دەسەپێنێ. لەئاست ئەم دەسەڵاتانەدا کە قورسایی دەخەنەسەر زەین و جەستە" یان لەوەش زیاتر هەروەك "تۆکڤێڵ" دەیوت: لەئاست ئەو دەسەڵاتانەی کە وێنەیەك دەربارەی مرۆڤ و جیهان دەسەپێنن بەسەر مرۆڤدا کە هاندەر نین بۆ رێزگرتنی یاساو رێسای گشتی... لەئاست دەسەڵاتگەلێکی ئاوهادا، خود وەك بەرگریکەرێك دەردەکەوێ، کە بوونی خۆی لەڕێگەی تایبەتمەندیو ئارەزوی ئازادبوونەوە دەسەلمێنێ، واتە لەڕێگەی دۆزینەوەو کاراکردنی "خود"ێکەوە کە توانای گۆڕینی دەوروبەری هەبێ.

دیموکراسی تەنها چەند زەمانەتێکی دەستوری نیە، واتە بە ئازادییەکی نەرێخوازەوە ناگیرسێتەوە. بەڵکو خەباتێکە کە خودە چالاکەکان، لەبۆتەی ئازادیو کولتوری خۆیاندا، دژی لۆجیکی بالادەستیی سیستەم پێڕەویدەکەن. دیموکراسی، هەروەك "رۆبێر فریس" وتوویەتی، سیاسەتی خودە. ئەو گۆڕانکاریە گەورەیەشی هاتۆتەگۆڕێ، بەسەر "خود"دا هاتووە" چونکە لەسەرەتای چاخی مۆدێرندا، کاتێ زۆربەی بونەوەرە مرۆییەکان یەخسیری گروپە دیدتەسکەکان بوون و ملکەچی زەبری سیستەمەکانی بەرهەمهێنان بوون نەك زەبری هێزەکانی بەرهەمهێنان، لەو کاتەدا "خود" بوونی خۆی لەڕێگای شوناس گۆڕینەوە (تەماهیکردن) لەگەڵ ئەقڵو کاردا دەسەلماند. لەهەمان کاتدا، لەو کۆمەڵگایانەدا کە تەکنیکە نوێکانی بەرهەمهێنان و بەرخۆریو پەیوەندییە جەماوەریەکان داگیریانکردبوون، پەیوەندی نێوان ئازادیو ئەقڵی ئامرازی لێکدەترازان. هەندێجار ئازادی لەو ئەقڵە هەڵدەگەڕایەوە، هەندێجاریش بەرگری لە ڕوبەرێکی دیاریکراو بۆ داهێنان دەکرد، بەمەرجێ لەهەمان کاتدا بوارێك بۆ یادەوەری بمێنێتەوە" یان لەپێناو خولقاندن و هێنانەکایەی بوارێکی لەوجۆرە کە لە بنەڕەتدا بوونی نەبوو، یاخود لەپێناو دروستکردنی خودێك کە لەیەك کاتدا خاوەن بونێکی جێگیربێو لە تازەبونەوەشدا بێت، لەیەك کاتدا ئینتماو پرۆژەش بێت، جەستەو زەینیش بێت. بەم شێوەیە پرسە گەورەکەی دیموکراسی، دەبێتە پرسی بەرگریکردن لە هەمەجۆریو بەرهەمهێنانی هەمەجۆری لەنێو رۆشنبیریەکی جەماوەریدا.

سەبارەت بە بیرۆکەی کۆماریخوازی، کولتوری سیاسی فەرەنسی زۆر دوور رۆیشت کاتێ لەنێوان ئازادی تاکەکەس و کارکردن لەسەر یاسا هاوشوناسیو لێکچونی دۆزیەوە، هەروەها لەنێوان مرۆڤ و هاولاتی، لەنێوان نەتەوەو پەیمانی کۆمەڵایەتیدا چونیەکیی سازاند. ئەو کولتورە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خۆیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کاتێ خۆی وەك بانگەشەکەرو گشتێنەری بەهای کۆخوازی نیشاندا، بەئەندازەیەك کار گەیشتە ئەوەی

تایبەتمەندیو تەنانەت یادەوەری خۆی بەتەواوی بسڕێتەوە بە دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی دیاریکراوی پشتئەستور بە یاساو پرنسیپەکانی فیکرو کاری ئەقڵانی. بەمجۆرە دەرخستنی هاودژی لەنێوان "کولتوری دیموکراتی" بەو شێوەیەی باسمانکردو "کولتوری کۆماریخوازی" بەشێوازە فەرەنسیەکەی، هاوکاریمان دەکا بۆ تێگەیشتنی باشتری ئەو وەرچەرخانەی بەسەر بیرۆکەی دیموکراسیدا هاتووە. کولتوری کۆماریخوازی کۆششدەکا بۆ سەقامگیرکردنی یەکێتی، بەڵام کولتوری دیموکراتی هەوڵدەدا بۆ پاراستنی هەمەجۆری. یەکەمیان ئازادی یەکساندەکاتەوە بە هاوڵاتیبون، بەڵام دووەمیان لەنێوان مافەکانی مرۆڤ و ئەرکەکانی هاوڵاتی، یان ئەو مافانەو داواکاریەکانی کەسی بەرخۆر جۆرێك لە ناکۆکی بەدیدەکا. دەسەڵاتی گەل، لای دیموکراتخوازەکان، مانای ئەوە ناگەیەنێ گەل بچێتە سەر عەرشی (میر)" بەڵکو هەروەك "کلود لۆڤۆر" دەیوت، مانای ئەوەیە شتێك نەمێنێ ناوی عەرش بێ. دەسەڵاتی میللی مانای ئەوەیە زۆرترین ژمارەی هاوڵاتیان بتوانن بە ئازادی بژین، واتە ژیانی تاکەکەسیی خۆیان بنیاتبنێن، دۆخی ئێستایان بگونجێنن لەگەڵ ئەو دۆخەدا کە ئومێددەکەن بیگەنێ، بەرەنگاری دەسەڵات ببنەوە لەیەك کاتدا بەناوی ئازادیو بەناوی وەفاداریشەوە بۆ کەلەپوری رۆشنبیری.

رژێمی دیموکراتی ئەو فۆرمەی ژیانی سیاسییە کە ئازادی دەبەخشێ بە زۆرترین ژمارەی خەڵك، فۆرمێکە زۆرترین هەمەجۆری دەپارێزێو دەسەلمێنێ.

لەکاتی نوسینی ئەم کتێبەدا، واتە ساڵی ١٩٩٣، توندوتیژترین هێرش دەکرایە سەر دیموکراسی، هێرشی رژێم و هێزەکانی سربیا، کە بەناوی پاکتاوی رەگەزیو کارکردن بۆ سەپاندنی هاورەگەزیو هاوجۆریی کولتوریو نەتەوەیی، بەجۆرێك بوەهۆی لەت و پەتکردنی بۆسنیا، کە چەندین سەدەیە خەڵکانێکی سەر بە نەتەوەو ئاینە جیاوازەکانی تیادەژین. سەدان هەزار کەس لە خاکی خۆیان بەزەبری چەك و لاقەکردن و تالانیو برسیکردن دەرکران. هەموو ئەمە لەژێر ناوی دروستکردنی دەوڵەتێکی هاوجۆر لەڕووی ئیتنیەوە ئەنجامدرا. لە هەر چاخ و زەمانێکدا باشترین شت بۆ ناسینەوەی دیموکراسی ئەو هێرشانەن کە دەکرێنەسەری. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دیموکراتخوازەکانی ئەوروپا، لەڕێگەی بەرهەڵستیکردنی پاکتاوی رەگەزییەوە، یەکدی دەناسنەوە. گەر رژێمێکی دیموکراتی لەئارادابوایە نەیدەتوانی بانگەشە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجێکی لەوجۆرە، واتە پاکتاوی رەگەزی، بکا بەڵکو جێبەجێکردنی سیاسەتێکی لەوجۆرە پێویستی بە رژێمێکی دیکتاتۆری دژ بە دیموکراسی هەیە، لێرەدا ئەوە گرنگ نیە کە ئایا "میلۆسۆڤیچ" یان ئەو نەتەوەپەرستانەی کە لەو توندڕەوتر بوون نوێنەرایەتی زۆرینەیەکی باشی رای گشتی سربیان کردووە یان نا؟!. ئەوەی لە بۆسنیا ڕوویدا سەلماندی کە دیموکراسی تەنها بە هاوبەشیکردن و رەزامەندی گشتی ناناسرێتەوە، بەڵکو بە رێزگرتن لە ئازادیەکان و هەمەجۆری دەناسرێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش پێشوازیمان کرد لە هەڵوەشانەوەی سیاسەتی جیاکاری ئیتنی (ئاپارتاید) لە ئەفەریقیای باشور، وەك سەرکەوتنێکی دیموکراسی. بەڵام گەر سبەینێ زۆرینەی رەشپێست لەڕێگەی هەڵبژاردنی راستەوخۆو دەنگدانی گشتییەوە توانی بەسەر کەمینەی سپیپێستدا زاڵ ببێ، ئەوا ناکرێ لەڕێگەی دیموکراسییەوە پاساو بۆ سیاسەتێکی

نەگریسی لەو جۆرە بهێنرێتەوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، رێکەوتنی "دوکلیرك" و "ماندێلا"و سەلماندنی هەمەجۆری لەو ولاتەدا کە رەشپێستە ئەفریقیەکان و بەریتانییە بەئەفریقیبوەکان و هیندیەکان و گروپی تری تێدا دەژین، دوو هەنگاوی گرنگن بەرەو پێشەوە.

دەوڵەتە نەتەوەییە ئەوروپییەکانی ئێمە، کە زۆرجار بنەماڵە پادشاییەکان حوکمیانکردوون، گۆڕانیان بەسەرداهاتوەو و بوونەتە رژێمی دیموکراتی، چونکە زۆرجار _ بەخۆشی خۆیان بووبێ یان ناچاری _ ئیعترافیان بە هەمەجۆری کۆمەڵگەیی‌و کولتوری کردوە ، لەبەرامبەر گروپە ئاینیەکاندا (*Lirritoriclisme*) کە لەهەردوو سەدەی شازدەو حەڤدەدا بڵاوببوونەوە. واتە ئەو دەوڵەتانەی کە دەسەڵاتی مەرکەزییان بەشێوەیەکی بەرفراوان خزاندبوە ژیانی تاك و گروپەکان، دەسەڵاتی مەرکەزی خۆیان و سەلماندنی هەمەجۆرییان پێکەوەکۆکردەوە. بۆ نمونە ولاتە یەکگرتوەکان، هەروەها کەنەدا، لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراون کە دوو کۆمەڵگان فرەکلتوری دەسەلمێنن" ئەو سەلماندنی فرەییەش بەندە بە رێزگرتن لە یاساکان و سەربەخۆیی دەوڵەت و پشتبەستن بە تەکنەلۆجیاو زانستەکان. واتە دیموکراسی لە دەرەوەی سەلماندنی هەمەجۆری بیروبڕوا، رەچەڵەك، دیدو پرۆژەی جیاواز... بوونی نیە.

لێرەوە، ئەوەی دیموکراسی دیاریدەکا تەنها چەند زەمانەتێکی دامودەزگایی یان دەسەڵاتی زۆرینە نیە، بەڵکو بەپلەی یەکەم بریتیە لەڕێزگرتنی پرۆژەو خواستە تاکەکەسی‌و دەستەجەمعیەکان، کە لەیەك کاتدا جەختکردنە لەسەر ئازادی تاکەکەس و لەسەر مافی چونیەکی‌و هاوشوناسی لەگەڵ گروپێکی کۆمەڵگەیی یان نەتەوەیی یان ئاینی دیاریکراویشدا. لەلایەکی دیکەوە دیموکراسی تەنها لەسەر بنەمای یاساگەلێك دانامەزرێ، بەڵکو بەر لە هەر شتێك پشت ئەستورە بە کولتورێکی سیاسی. زۆرجار پێناسەی دیموکراسی کراوە بەوەی بریتیە لە یەکسانی. ئەمە پێناسەیەکی راستە بەمەرجێ وەکو "تۆکڤێڵ" لە وتەزای یەکسانی گەیشتبین، کە (پێیوایە) دیموکراسی دەخوازێ سیستەمی پلەبەندی‌و دیدی گشتگیر بۆ کۆمەڵگا لەناوببرێ، هەروەها وەك "لیۆ دۆمۆن" وتوویەتی: پێویستە چەمکی (ئۆمۆ هیراشیکۆس) بگۆڕدرێ بە (ئۆمۆ کوالیس)، واتە لە مرۆڤە پلەدارەکانەوە بۆ مرۆڤی یەکسانەکان. بەلاّم ئەمجۆرە تاکگەرییەش گەر سەربکەوێ، دەبێتەهۆی بەرپابوونی کۆمەڵگەیەکی جەماوەری، تەنانەت رەنگە ببێتەهۆی هاتنەئارای دەسەلاّتێکی تۆتالیتار، هەروەك "لادمۆند بۆرك" سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسی تێبینی کردوە. واتە بۆئەوەی یەکسانی، یەکسانیەکی دیموکراتیانە بێ، پێویستە هەر مرۆڤێك مافی هەڵبژاردنی سروشتی (بوون)ی خۆی‌و شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو بوونەدا هەبێ، مافی پاراستنی تاکێتی خۆی هەبێ دژی هەموو ئەو گوشارانەی پێڕەو دەکرێن بەئاراستەی گونجاندنی (لەگەڵ ئەوانی‌تر)و بەئەخلاقیکردنی (واتە سەپاندنی ئەخلاق لەلایەن کۆمەڵگاوە). لێرەدا بۆمان ئاشکرادەبێ کە پێڕەوانی "ئازادی نەرێخواز" لەسەر هەقن، کاتێ دژی پێڕەوانی "ئازادی ئەرێخواز"ن. هەرچەندە مرۆڤ زۆر حەزی لە هەڵوێستی پێڕەوانی ئازادی نەرێخواز نیە، بەلاّم ئەو بنەمایەی هەڵوێستەکەیانی لەسەر دامەزراوە راستە" هەروەك چۆن بنەمای ئازادی ئەرێخواز مەترسیدارە، سەرەڕای ئەوەی سەرنجمان بۆ لای خۆی رادەکێشێ‌و فریوماندەدا.

ئەم پوختەیە، دژایەتی لەنێوان ئازادی (بەتێگەیشتنی) کۆنەپارێزەکان و ئازادی نوێخوازەکان، تائەوپەڕی قووڵدەکاتەوە. ناچارماندەکا لە وێنەی قارەمانئامێزی کەلەپوری دیموکراتی دووربکەوینەوە، وێنەی ئەو شۆڕشگێڕە میللیانەی نەتەوەکان سازو ئامادەدەکەن دژی دوژمنانی ناوخۆو دەرەوە. شۆڕشەکان زۆرجار ویستوویانە دیموکراسی لە دوژمنەکانی بپارێزن. بەڵام دواجار رژێمی دژ بە شۆڕشەکان هاتونەتە سەرحوکم کە دەسەڵاتیان بەشێوەیەکی مەرکەزی لەخۆیاندا چڕکردۆتەوە، بانگەشەیان بۆ یەکێتی نەتەوەییو پابەندبوونی دەستەجەمعی کردووە، دژایەتی کەسانێکیان کردووە بەوەی دوژمنن و پێکەوەژیان لەگەڵیاندا مەحاڵە چونکە لەخانەی خائینانداندان، لەبری ئەوەی وەك کەسانێکی خاوەن بیرو بەرژەوەندی جیاواز لە بیرو بەرژەوەندی خۆیان تەماشایان بکەن.

## ئازادی و یادەوەری و ئەقڵ

دیموکراسی سەرەتا لەلایەن ئەو دەسەڵاتە میللییەوە دوچاری هەڕەشەبۆوە کە ئەقڵانیەتی بەکارهێنا بۆ سەرکوتکردنی هەموو شوناس و ئینتما کۆمەڵگەییو کولتوریەکان، بەوجۆرەش هەموو رکابەر و هاوتاکانی دەسەڵاتی خۆی لەناوبرد. هەروەها دوچاری شکستێکی دیکە بۆوە کاتێ سیستەمی سیاسی لە بازاڕێکی سیاسیدا کورتکرایەوە. پاشان دیموکراسی لە بەرەی سێیەمەوە هێرشی کرایەسەر، واتە ئەو رەوتە کولتورییەی رێزگرتنی کەمینەکانی هێندە خەستکردەوە تائەندازەی رەتکردنەوەی بیرۆکەی خودی زۆرینەو بەرتەسکردنەوەی روبەری یاسا تائەوپەڕی. ئەمەش مەترسییەکەی کاتێ بەدیدەکرێ کە رێزگرتنی جیاوازیەکان وەك دروشمێك بەکاردەهێنرێ لەپێناو خەستکردنەوەو دامەزراندنی دەسەڵاتی تایەفەگەریدا، ئەو دەسەڵاتەی لەنێوەندێکی تایبەتدا دەسەپێنرێ بەشێوازێکی دژ بە دیموکراسی. بەمجۆرەش کۆمەڵگای سیاسی دەبێتە بازاڕێك بۆ گرێدانی سەفقە ئاڵۆزو تەمومژاویەکان لەنێوان تایەفەگەلێکدا کە یەخسیری چەند خولیایەکن دەربارەی شوناس و هاوجۆری.

لەئاست ئەم یەخسیربوونە لە جوغزی تایەفەگەریدا کە هەڕەشە لە دیموکراسی دەکا، هیچ شتێك وەك کردەوەی ئەقلانی سوودبەخش نیە. مەبەستمان لەم کردەوە ئەقلانیە، بانگەوازکردنی بەردەوامە بۆ بیرکردنەوەی زانستی، پێڕەوکرنی حوکی رەخنەییو پەسەندکردنی ئەو یاسا جیهانییە کۆخوازانەی کە ئازادی تاکەکان دەپارێزن“ ئەڵبەتە ئەم بانگەوازە لەگەڵ یەکێك لە کۆنترین نەریتەکانی دیموکراسییدا یەکدەگرنەوە: کە بریتیە لە بانگەوازکردن بۆ مەعریفە، هاوکات لەگەڵ بانگەشەکردن بۆ تەواوی دەسەڵاتەکان. ئەوەی بانگەوازێکی لەمجۆرە دەکاتە کارێکی پێویست، لەو هۆکارەدا خۆی دەبینێتەوە کە دەوڵەتە دەسەڵاتگەرەکان رۆژ لەدوای رۆژ بەرگی شەرعیەتی تایەفەگەری دەپۆشن نەك "پیشکەوتوخواز"، ئەو حاڵەتەی بەسەر رژێمە کۆمۆنیستەکان و هاوپەیمانەکانیان هات.

ئەم سێ جەنگە، ئەو کولتورە سیاسیە دیاریدەکا کە دیموکراسی لەسەر دادەمەزرێ: دیموکراسی لە دەسەڵاتی ئەقڵدا کورتناکرێتەوە، هەروەك چۆن لە ئازادی گروپە خاوەن بەرژەوەندیەکان و نەتەوە تایەفەییەکاندا کورتناکرێتەوە. دیموکراسی ئاوێزانکردنی ئەو توخمانەیە کە هەمیشە هەوڵی لێکجیابوونەوە

دەدەن، بەلام گەر بەتەواوی لێکجیابینەوە ئەوا هەموویان بەرەو حوکمی دەسەلاتگەر دەچن. واتە ئەو نەتەوەیەی کە لەبنەڕەتدا ئازایدیخواز بووە لەچەند تایەفەیەکی داخراوی دوژمن بەیەکدا پەرتدەبێ، ئەو ئەقڵەیشی هەڵمەتی دەکردەسەر فۆرمەکانی جیاوازیو ستەمە بۆماوەییەکان دادەبەزێ بۆ ئاستی "سۆشیالیزمی زانستی". تاکگەریش کە مەرجێکی تەواوکەری ئازادییە، تاک کورتدەکاتەوە بۆ تەنها بەرخۆرێکی سیاسی.

بەوپێیەی نوێخوازی لەسەر ئەم ئاوێزانکردنە سەختەی ئەقڵو خود، یان ئەقلانیەت و خودگەری دامەزراوە، هەروەها بەو پێیەی خود بریتیە لە کۆششێك کە دەخرێتەگەڕ لەپێناو گرێدانی ئەقڵی ئامرازی بە شوناسی تاکەکەسیو دەستەجەمعیەوە، کەواتە باشترین پێناسە بۆ دیموکراسی ئەوەیە کە پێیوایە: دیموکراسی بریتیە لە ئیرادەی مرۆڤ لە ئاوێزانکردنی فیکری ئەقلانی بە ئازادی تاکەکەس و شوناسی کولتوری.

تاك "خود"ێکە بۆخۆی، گەر لە رەفتارو هەڵسوکەوتەکانیدا ئارەزوی ئازادیو ئینتما بۆ جۆرێك لە رۆشنبیری و بانگەواز بۆ ئەقڵ کۆبکاتەوە" واتە گەر بتوانێ سێ پرنسیپ پێکەوە کۆبکاتەوە: پرنسیپی تاکبوون، پرنسیپی تایبەتمەندیو پرنسیپی کۆخوازی. (ئەوا دەکرێ) هەمان حاڵەت بەسەر کۆمەڵگای دیموکراتیدا جێبەجێ ببێ، بەهەمان شێواز و لەبەر هەمان ئەو هۆکارانە، دەکرێ کۆمەڵگا ئازادی تاکەکان و رێزگرتنی جیاوازی گرێداتەوە بە رێکخستنی ئاقلانەی ژیانی دەستەجەمعیەوە، پشتئەستور بە تەکنیك و یاساکانی کارگێڕی گشتیو تایبەتی. تاکگەری تەنها پرنسیپی بنیاتنانی دیموکراسی نیە" چونکە ئەو تاکەی ملکەچی بەرژەوەندیو ئارەزوەکانی خۆیەتی، تەنانەت ئەو تاکەی نکوڵی لە رەفتاری مەرکەزی دەکا، مەرج نیە خاوەن رۆشنبیریەکی دیموکراتی بێت، هەرچەندە تاکێکی لەوجۆرە لە کۆمەڵگای دیموکراتیدا، زیاتر لەهەر کۆمەڵگایەکی، بەئاسانی دەژیو گەشەدەکا. دیموکراسی تەنها بازارێکی سیاسی کراوە نیە" ئەوانەی بەرژەوەندیەکانیان بەسەریاندا زاڵە هەمیشە بەرگری لەو کۆمەڵگا دیموکراتییە ناکەن کە تیای دەژین، بەڵکو زۆرجار راکردنیان پێباشترە بۆ پاراستنی ماڵومولکەکانیان، یان گەران بەشوێن ئەو رێگەچارە ستراتیجیە چالاکانەی بەرژەوەندیەکانیان دەپارێزێ، بێ گوێدانە پرسی بەرگریکردن لە پرنسیپ و دامودەزگاکان. کولتوری دیموکراتی نایەتەگۆڕێ گەر جۆرێك لە پەیبردن یاخود تێگەیشتن لەئارادا نەبێ سەبارەت بە کۆمەڵگای سیاسی، وەك پێکهاتەیەکی دامودەزگایی کە بە پلەی یەکەم هەوڵدەدا ئازادی تاك و گروپەکان پێکەوەبگونجێنێ لەگەڵ یەکخستنی چالاکیە ئابوریەکان و بنەما یاسایەکاندا.

سەختترین مشتومڕ کە جیهانی ئەمڕۆمانی زۆر بەئاشکرایی دوولەت کردووە، ئەو مشتومڕەیە کە لەنێوان بانگەشەچیانی فرەیی لەلایەك و بەرگریکاران لە رێچکەی یەکخەری یەکێتیخواز (تەوحیدی) لەلایەکیترەوە لەئارادایە، ئەو رێچکەیەی کە هەندێ جار کۆماریخواز یان یەعقوبیی پێدەوترێ. بەلام دیموکراسی نە لەگەڵ فرەییداو نە لەگەڵ یەکێتیخوازیدا هاوشوناس نیە. ئەو لەلایەکەوە خولیای شوناس بەتەواوی ریسوادەکا کاتێ مرۆڤ لە تایەفەیەکی دیاریکراودا بەنددەکا، ئەو خولیایەی ژیانی کۆمەڵگەیی کورتدەکاتەوە بۆ پرسی لێبوردن و نەرمی نیشاندان، بەچەشنێك گۆڕەپانی کۆمەڵگا بە کراوەیی دەهێڵێتەوە لەبەردەم ئەگەرەکانی خۆدابڕین و گۆشەگیریو جەنگی

پیرۆزدا. بەڵام لەلایەکی ترەوە زۆر بەتوندی ئەو زەینیەتە یەعقوبیە ریسوادەکا کە پەنا بۆ کۆخوازی دەبا تا هەمەجۆری بیروباوەڕو ئینتماو یادەوەرییە تایبەتەکان لەناوبەرێ. کولتوری دیموکراتی لە کۆششێکدا بەرجەستە دەبێ و پێناسەدەکرێ کە دەخرێتەگەڕ لەپێناو گرێدانی هەمەجۆریو یەکێتی، ئازادیو یەکبوونخوازی پێکەوە. بۆیە ئێمە هەر لە سەرەتاوە دیموکراسیمان پێناسەکرد بەوەی بریتیە لە پێکەوەگونجاندنی ژمارەیەك لە بنەمای دامودەزگایی هاوبەش لەلایەك و هەمەجۆریی بەرژەوەندیو هەمەجۆریی کولتورەکان لەلایەکیترەوە. پێویستە مرۆڤ دەسبەرداری ئەو قسە بریقەدارە ببێ کە دەسەڵاتی زۆرینە دەکا بەگژ مافی کەمینەکاندا، چونکە دیموکراسی بوونی نیە بەبێ رێزگرتن لە هەردوکیان. دیموکراسی رژێمێکە زۆرینە تیایدا مافی کەمینەکان دەسەلمێنێ، دان بەوەدا دەنێ کە ئەوەی ئەمڕۆ زۆرینەیە دەشێ سبەینێ ببێتە کەمینە، هەروەها دەبێ زۆرینە ملکەچی یاسایەك بێ کە رەنگە بەرژەوەندیگەلێك بپارێزێ ناکۆك بن لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەودا، بەڵام رێگر نیە لەبەردەم پێڕەوکردنی مافە بنەڕەتیەکانی خۆیدا. زەینیەتی دیموکراتی لەسەر ئەم هوشیارییە دادەمەزرێو پەیوەندی یەکتەواوکەر لەنێوان یەکێتیو هەمەجۆریدا دەدۆزێتەوە، خۆی موتوربە دەکا لەو کێبڕکێ بەردەوامەی، کە لەشێوەی بزاوتێکی بەردەوامدا، لەنێوان سنورەکانی یەکێتیو هەمەجۆریدا لەئارادایە، لەپێناو چنگکەوتنی باشترین ئەو کەرەستانەی کە پەیوەندی نێوان ئەو دوانە مکۆمتردەکا.

دیموکراسی بونەوەری مرۆیی کورت ناکاتەوە بۆ هاوڵاتیەکی پەتی. بەڵکو لەکاتێکدا بوونی وەك تاکێکی ئازاد دەسەلمێنێ، بوونی وەك کەسێکیش دەسەلمێنێ کە ئینتمای بۆ گروپی دیاریکراوی ئابوریو کولتوری هەیە.

## دیموکراسیو گەشەسەندن

ئەڵبەتە ئەوەی تائێستا باسمانکردووە، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر گۆڕانی بەسەردێو فۆرمی جیاواز دەپۆشێ، چونکە هەندێ وڵات لەناوەوە گەشەدەکا، بەڵام پەرەسەندنی هەندێکی تریان خۆبەخۆ نیە. لە وڵاتە تازە گەشەکردوەکاندا، دەشێ تاك و گروپ و کەمینەکان دوور لە گوشاری سیستەمی ئابوریو کارگێڕی، پارێزگاری لە بوونی خۆیان بکەن. لەو وڵاتانە کارەکە ئاسانترە تا کۆمەڵگا پاشکۆکان، ئەو کۆمەڵگانەی تازەکردنەوەیان پێ ناگا تەنها لە ڕێگە دەرەکییەکانەوە نەبێ، واتە لەدەرەوەی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکانەوە" کە هەندێجار سەرچاوەکەی دەوڵەتێکی نەتەوەیی یان هەر سەرچاوەیەکی ترە، ئەو مافانەش کە داوادەکرێن مافی تایەفەیین زیاتر لەوەی مافی تاکەکەسی بن، مافگەلێکن بۆ بەرەنگاربوونەوەی تازەگەری نەك بەرگریکردن لە ئازادی تاکەکەسی. پێویستە بڵێین ئەو پەشێوییەی کە لەو دۆخە دەکەوێتەوە بەر لەهەر شتێك کاردانەوەی دژبە دیموکراسی لێدەکەوێتەوە" لێرەوە هیچ شوێنێك بۆ دیموکراسی نامێنێتەوە لە کۆمەڵگایەکدا کە لەلایەکەوە دەوڵەت بەشێوەیەکی دەسەڵاتگەر دەستوەربداتە کاروبارەکانیەوە، لەلایەکی تریشەوە بەدەست کێشەی تایەفەگەرییەوە گرفتاربێ. ئیدی ئەگەری ئەوە لەئارادایە دەوڵەت لەهەر چرکەیەکدا زمانێکی تایەفەیی بەکاربێنێو ببێتە دەوڵەتێکی تۆتالیتار؟! ئەمەش پرسیارێك دەخاتەوە کە وەڵامەکەی دەمانگەیەنێتە دەرەنجامێکی سەخت، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە دیموکراسی تەنها لە

وڵاتە دەوڵەمەندەکاندا پەیدادەبێ، واتە ئەو وڵاتانەی کە هەژمونی بەسەر گۆی زەوی‌و بازاڕە جیهانیەکانەوە هەیە. بەڵام هەر ئەم قسەیە کە زۆرجار بەشێوەیەکی بریقەدار و بێناوەرۆك بانگەشەی بۆ دەکرێ پێچەوانەی ئەوەیە کە تائێستا من خستوومەتەڕوو. چونکە من بەرگریم لە بیرۆکەی دیموکراسی کردووە بەوەی گەڕانێکە بەشوێن فۆرمەکانی پێکەوەگونجاندنی ئازادی تایبەت و کاملبوونی کۆمەڵگەیی، یان خودو ئەقڵ لە هەلومەرجی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا. بەڵام تەماشاکردنی دیموکراسی وەك خەسڵەتێکی هاوتەریبی تازەکردنەوەی ئابوری، واتە ئەو قۆناغە مێژووییەی بەرەو ئەقڵانیەتی ئامرازگەری هەنگاودەنێ، ئەوە بابەتێکی تەواو جیاوازە. دیموکراسی لە حاڵەتی یەکەمیاندا جۆرێکە لە هەڵبژاردن، لە هەموو هەلومەرجێکیشدا هەڵبژاردنی پێچەوانە، واتە دژ بە دیموکراسی ئەگەرێکەو لەئارادایە، بەڵکو ئەگەرێکە زۆرجار روودەدا. بەڵام دیموکراسی لە حاڵەتی دووەمیاندا بەشێوەیەکی سروشتی لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەکردندا سەرهەڵدەدا، بەجۆرێك ئابوری بازاڕو دیموکراسی سیاسی‌و عەلمانیەت دەبنە سێ روخساری پرۆسەیەکی گشتی کە پرۆسەی مۆدێرنەکردن و تازەگەرییە. بەڵام پێویستە مرۆڤ وەڵامی ئەم تیۆری تازەگەرییە بداتەوەو بڵێ: دیموکراسی، لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا یان لەهەر وڵاتێکی تردا، لەژێر هەڕەشەدایە لەلایەن رژێمە دیکتاتۆریە تۆتالیتارەکانەوە، یان بەهۆی ئەو پاشاگەردانیەی کە جیاوازییە کۆمەڵگەییەکان خەستتر دەکاتەوەو مەرکەزیەتی دەسەڵات لەدەست تەنها چەند کەسێکدا چڕدەکاتەوە. هەروەها پێویستە مرۆڤ وردتر بڵێ: کرداری دیموکراتی‌و کرداری بەدیموکراتیکراو، سەرباری هەوڵی نەیارەکانی، لە هەردوو شێوازەکەی کۆمەڵگادا ئاشکرادەبێ" واتە چ ئەو کۆمەڵگانەی لە دەرەوە تازەدەکرێنەوە چ ئەو کۆمەڵگانەی لەناوەوە گەشەدەکەن.

پەنابردن بۆ تایەفە، بەناوی کولتورێکی تایبەتەوەو لەپێناو بەهێزکردنی دەسەڵاتێکی سیاسی دیاریکراودا، دیموکراسی لەناودەبا" هەروەك چۆن سەربەخۆیی سیستەمی سیاسی لەبەیندەباو پەیوەندیەکی راستەوخۆ لەنێوان دەسەڵات و جۆرە کولتورێکی دیاریکراودا، بەتایبەتی لەنێوان دەوڵەت و ئایندا دەسەپێنێ. لەچەند وڵاتێکی جیهانی سێیەمدا، بۆ نمونە جەزایری پاش کودەتاکەی دەوڵەت، رەنگە هیچ هەڵبژاردنێکی کردەیی لەبەردەستدا نەمابێ جگە یەکێك لەم دوانە: یان دیکتاتۆریەتی نەتەوەیی یان دیکتاتۆریەتی تایەفەیی. لە حاڵەتێکی وادا پێویستە فیکری دیموکراتی دژی هەردوو رێگەچارە دەسەڵاتگەرەکە بێ جیاوازی خەبات بکا، واتە بەرگری لەوانە بکا کە دەبنە قوربانی رەوتی تەوحیدی، هەروەك چۆن دەبێ بەرگری لەوانەش بکا کە دەبنە سوتەمەنی رەوتی عەسکەرتاری، بەتایبەتی (ئەو قوربانیانەی) لەڕیزی رۆشنبیرەکاندان" هەروەها یارمەتی ئەو هێزە کۆمەڵگەییانە بدا کە هەردوو رەوتەکە رەتدەکەنەوە.

بەڵام لە دۆخی پێچەوانەدا، بەرگریکردن لە تایەفەیەك دژی یەکێك لە هێزە دەسەڵاتگەرەکان، فاکتەرێکی چالاکی بە دیموکراتیکردنە گەر هاتو ئەو تایەفەیە بەشداری لە پرۆسەی مۆدێرنەکردندا بکاو نەبێتە رەگەزێکی هەڕەشەکار لەو پرۆسەیە. ئەم حوکمە بۆ ئەو وڵاتانەش راستە کە لەناوەوە خۆیان تازەدەکەنەوە، ئەو وڵاتانەی کە پیشترو تائێستاش بانگەوازی بەئەقڵانیکردنیان تێدا دەبیسترێ، (بەڵام

بەئەقڵانیکردنێك) کە "مرۆڤی ناوەوە" سەرکوتدەکاو نکوڵی لێدەکاو ئەو دیدە سوودگەرەی بەسەردا دەسەپێنێ کە "نیچە" دژیبوو. بەڵام تاقە جیاوازی نێوان هەردوو حاڵەتەکە لەوەدایە کە لەیەکەمیاندا تایەفە پەنادەبا بۆ رەتکردنەوەی بەئەقڵانیکردن، بەڵام لەحاڵەتی دوەمیاندا ئەقڵانیەت پەنادەبا بۆ لەناوبردنی خودی کارا و چالاك.

راستیەك کە مشتومڕ هەڵناگرێ، نابێ ئاوەڵناوی دیموکراتی بخەینەپاڵ رژێمە دەسەڵاتگەرەکان تەنها لەبەرئەوەی دەستیانگرتوە بەسەر چەند بزاوتێکی رزگاری نیشتمانیدا. هەروەك چۆن ناشێ ئاوەڵناوی دیموکراتی بدەینەپاڵ "ستالین" تەنها لەبەرئەوەی "شۆڕشگێڕ" بوو، یان "هیتلەر" هەر لەبەرئەوەی لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. بەڵام ئێمە مافی ئەوەمان نیە بڵێین هەژاریو پاشکۆیەتی (تەبەعیەت) یان ململانێ ناوخۆکان، دیموکراسی لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا دەکاتە کارێکی مەحاڵ. چونکە بەوپێیەی دیموکراسی کۆششێکە بۆ دۆزینەوەی سیستەمێکی سیاسی کە رێز لە ئازادییە بنەڕەتیەکان بگرێ، هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەدایە لەهەموو وڵاتەکاندا، جا سەروەت و سامان و دەوڵەمەندی ئەو وڵاتانە لەهەر ئاستێکدا بێ. بێگومان ئەم مەترسیانە لەهەموو وڵاتانی جیهاندا بە وێنەی جیاواز لەئارادان. بەڵام ئایا نەمانبینی لەناوجەرگەی ئەوروپادا چەندین رژێمی نەتەوەیی توندڕەوی دوژمن بە دیموکراسی سەرکەوتن؟ ئایا نەمانبینی لە یۆگۆسلافیای پێشو، کە هەرچەندە وەك کەنەداو وڵاتە پێشکەوتەکانی تر دەوڵەمەند نیە بەڵام زۆر لە جەزایرو گواتیمالا دەوڵەمەندترە، چەندین تاوانی دزێو دژی مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ ئەنجامدران؟.

لەو وڵاتانەدا کە لە (دۆخی) بەمۆدێرنەکردندان، پێشکەوتنێکی "سروشتی" بەرەو دیموکراسی لەئارادا نیە، لەو وڵاتانەشدا کە لەدەرەوە گەشەیان پێدەدرێ دەسەڵاتێکی خاوەن توانا لەئارادا نیە" مێژووش زۆر بە ڕوونی ئەم خاڵەی سەلماندوە. بەڵام کاری دیموکراتی ئەرێخواز (ئیجابی) لە وڵاتە مۆدێرنەکراوەکاندا بەرەو سنوردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەر تاکەکان هەنگاودەنێ" بەڵام لە کۆمەڵگا پاشکۆکاندا خۆسەلماندنی تایەفە بەشێوازی بەرگریکردن لەخۆ، کارئاسانی دەکا بۆئەوەی سەرلەنوێ بەشێوەیەکی دەستەجەمعی دەستبگیرێتەوە بەسەر ئامرازەکانی مۆدێرنەکردندا. بەمجۆرە لەلایەکەوە دەبینین ئازادیە فەردیەکان ئەرکی سەربەستی بەجێدەهێنن، بەڵام هەمان ئەو سەربەستییە لە بەرژەوەندیە تایبەتەکاندا قەتیس دەکەن" هەروەك چۆن لەلایەکی ترەوە دەبینین کە تایەفە بەرگری لە خۆی دەکا پەنادەبا بۆ دیموکراسی بەڵام هەر خودی خۆی بەناوی هاوچەشنی نەتەوەیی یان ئیتنی یان ئاینییەوە ئەو دیموکراسییە لەناودەبا. ئەم دوو بنارەی واقعی مێژویی رووبەڕوی هەردوو دیوی "خود" دەبنەوە، کە هەرچەندە دیوێکیان ئازادی تاکەکەسە بەڵام دیوەکەی تریان ئینتماکردنە بۆ کۆمەڵگەیەك و کولتورێك" (یان) هەرچەندە پرۆژەیەکی ئایندەییە، بەڵام لەهەمان کاتدا سەربە یادەوەرییە. واتە دەربازبوونە لە کۆت و بەند، بەڵام جۆرێکیشە لە پابەندبوون.

لەو وڵاتانەدا کە بەشێوەیەکی ناوەکی گەشەدەکەن، زەینیەتی دیموکراتی دەتوانێ لەبواری رێکخستنی ژیانی کۆمەڵگەییدا چەند ئەرکێکی ئەرێخواز بخاتە ئەستۆی خۆی. بەڵام لە وڵاتەکانی تردا کاری دیموکراتی، بەپێچەوانەوە، خەسڵەتێکی نەرێخوازو رەخنەگرانە وەردەگرێ: بەپلەی یەکەم

بانگەوازدەکا بۆ رەهاکردنی سەربەخۆیی، یان لەناوبردنی دەسەڵاتی ئۆلیگاریشی، یان سەربەخۆیی دەزگای دادوەری، یان رێکخستنی هەڵبژاردنی ئازاد. گواستنەوە لە ئازادبوونەوە بۆ رێکخستنی ئازادیەکان ئەرکێکی قورس و زۆرجاریش پچڕپچڕە. تا کۆمەڵگاش پاشکۆ بێو پشتئەستور بێ بەدەرەوە، جۆری ئازادبوونەکەی خۆسازدان بۆ شەڕ لەخۆدەگرێ، ئیدی ئەو مەترسییە دێتەگۆڕێ کە خەباتی رزگاری بە دۆخێکی دەسەڵاتگەرانە کۆتایی بێ. ئێمە نیو سەدەی دوورو درێژمان بەسەربرد، بینیمان رژێمە دەسەڵاتگەرەکان لە هەناوی بزوتنەوەکانی رزگاری نەتەوەییو کۆمەڵگەییەوە هاتنەدەرێ. نابێ ئەوەش لەیادبکەین کە ئەو رژێمانە بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات پەنایان بۆ ئومێدی رزگاربوون برد. بۆنمونە هەرچەندە بەرەی رزگاری نیشتمانی جەزایر بووە رژێمێکی دیکتاتۆری عەسکەرتاری، بەڵام ئایا دەتوانین نکوڵی لەوەبکەین کە فاکتەری کارای بزوتنەوەیەکی رزگاری بوو؟ یان ئایا قۆزتنەوەی ئاوەڵناوی پێشەنگی پرۆلیتاری لەلایەن رژێمە دیکتاتۆریە کۆمۆنیستەکانەوە، نەبوە رێگر لەبەردەم بزوتنەوە کرێکاریەکاندا بۆ خستنەڕووی داواکاریە دیموکراتیەکانیان؟. ئەو جیهانەی کە "ئێستا لە گەشەسەندندایە" ناتوانێ خۆی لەو بازدانە مێژووییەی مەرگ بپارێزێ، کە بریتیە لە گۆڕینی پرۆسەی بەرەنگاربونەوەی دوژمنان و لەمپەرە دیاریکراوەکان بۆ پرۆسەی دامەزراندنی دەزگاو نەریتی دیموکراتی. چونکە هەمیشە دڕندەیەکی تۆتالیتار لەنێوان رزگاریو ئازادیەکاندا خۆی حەشارداوە. لەئاست ئەو دڕندەیەدا هیچمان بەدەستەوە نییە جگە لە ئامادەکردنی خودە کۆمەڵگەییە کاراکان کە توانای بەجێهێنانی کاری ئابوریی ژیرانەیان هەبێ لەهەمان کاتدا توانای رێکخستنی پەیوەندیەکانی دەسەڵاتی لەناوخۆیدا هەبێ. تەنها بزاوتە کۆمەڵگەییە بەهێزەکان، کە پشتئەستورن بەخۆیان و لەهەناویاندا بەڕێوەبەرو بەڕێوەبراوانیش لەخۆدەگرن، توانای بەرەنگارییان هەیە لەئاست گوشاری دەوڵەتی دەسەڵاتگەردا، جا دەوڵەتێکی مۆدێرن بێ یا نەتەوەیی، چونکە هەر ئەو بزاوتانە کۆمەڵگەی مەدەنی پێکدێنن، کۆمەڵگەیەك توانای دانوستانی لەگەڵ دەوڵەتدا هەبێو بەکردەوە سەربەخۆیی ببەخشێ بە کۆمەڵگەی سیاسی.

پێویست ناکا دژبوونێك بخولقێنین لەنێوان وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا کە زەمینەی لەدایکبوونی دیموکراسییان هەیە، لەگەڵ وڵاتە دواکەوتوەکاندا کە ملکەچی قەدەری رژێمە دەسەڵاتگەرەکانن. پێویستیەکی لەمجۆرە خۆی دەسەپێنێ گەر ئیعتراف بە ساختەیی جیاکاری بکەین لەنێوان ئەو دوو جیهانەدا کە ئەمڕۆ بە باکورو باشور ناودەبرێن. چونکە ئێمە لەسەر هەسارەیەك ناژین دووکەرت بووبێ، بەڵکو لە تاقە کۆمەڵگەیەکی جیهانیدا دەژین کە لەخۆڕا کراوە بەدوو کەرتەوە. باکور رۆچۆتە ناو باشور، هەر وەك چۆن باشور لە باکوردا ئامادەیە. چەندین گەڕەکی ئەمریکیو ئینگلیزیو فەرەنسی لە باشوردا هەن، وەك چۆن چەندین گەڕەکی ئەفریقیو عەرەبیو ئاسیاییو ئەمریك_لاتینی لە شارەکانی باکورو نێوەندە پیشەسازیەکانیدا هەن. دروشمەکەی "وان وۆرڵد" تەنها بانگەوازێك نەبوو بۆ هاریکاری هاوبەش، بەڵکو بەر لە هەر شتێك گوزارشتکردن بوو لە واقع. بۆیە ناشێ دیموکراسی لەجیهاندا بوونی هەبێ، گەر تەنها لەچەند وڵات و کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا توانای ژیان بەسەربردن هەبێ. راستە واقعی مێژویی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە وڵاتە باڵادەستەکان دیموکراسی لیبراڵییان پەرەپێداوە،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی ئیمپریالی و کۆلۆنیالییان بەسەر جیهاندا سەپاندووە، تەنانەت لەسەر ئاستی هەسارەکەشمان بەگشتی ئەو وڵاتانە خەریکن ژینگە لەناودەبەن. لەپاڵ ئەم دۆخەدا، سەرهەڵدانی بزاوتەکانی رزگاری نەتەوەیی‌و کۆمەڵگەیی، لە وڵاتە بێدەرەتانەکاندا، شێوەیەك بوو لە کۆشش و بانگەواز لەپێناو دیموکراسیدا. بەڵام هەر هەمان ئەو وڵاتانە دەسەڵاتی تایەفەگەری ئەوتۆیان تیا دەرکەوت کە شوناسی ئیتنی یان نەتەوەیی یان ئاینییان تۆخکردەوەو بەکاریانهێنا لەپێناو دەسەڵاتی دیکتاتۆریدا، یان لەخزمەت ستەمگەریی بەرنامەڕێژی پرۆسەی تازەکردنەوەدا.

وتمان "خود"ی کارا کە پێیوایە دیموکراسی مەرجی پێشوەختی بوونی سیاسییە، خودێکە لەیەك کاتدا نوێنەرایەتی ئازادی‌و کەلەپوریش دەکا. بەڵام لە هەمان کاتدا لە کۆمەڵگە پاشکۆکاندا هەمان ئەو خودە لەژێر هەڕەشەی پانبوونەوەو لەژێر زەبری کەلەپورو نەریتەکاندایە. لە کۆمەڵگە مۆدیرنەکراوەکانیشدا، ئەو خودە لەژێر هەڕەشەی پوکانەوەدایە لە چوارچێوەی ئازادیەکدا کە کورتکراوەتەوە بۆ ئازادی بەرخۆری لە بازاڕدا. هەروەك چۆن لە بەرەنگاربونەوەی تایەفەگەریدا هیچ دەرەتانێك لەبەردەم مرۆڤدا نییە جگە لە پشتبەستن بە ئەقڵ‌و مۆدێرنەکردنی تەکنیکی، تا جیاکاری وەزیفی لەنێوان سیستەمە فەرعیەکاندا بکا، وەك سیستەمە سیاسی، ئابوری، ئاینی‌و خێزانیەکان و ...هتد" بەهەمان شێوە لە بەرەنگاربونەوەی فریودانەکانی بازاڕدا دەبێ پشت ببەستێ بەهەمان شت. چونکە مەحاڵە توانای بەرەنگاربوونەوەی هەبێ گەر ئینتمایەکی کۆمەڵگەیی‌و کولتوریی نەبێ. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا تەوەرەی سەرەکی دیموکراسی لەسەر بنەمای بیرۆکەی سەروەری میللی‌و بەرکەوتی سیاسی دادەمەزرێ کە بەرهەمی کردەی مرۆییە.

دیموکراتی لەهەموو لایەکەوە لەژێر هەڕەشەدایە، بەڵام لەزۆر شوێنی جیهاندا شوێنپێ‌و رێڕەوی بۆخۆی دۆزیوەتەوە" وەك لە ئنگلتەرای سەدەی حەڤدەو لە وڵاتە یەکگرتوەکان و فەرەنسای کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە دەرکەوت، هەروەها لە ئەمریکای لاتین کاتێ رژێمە نەتەوەییە میللیەکان گۆڕانیان بەسەرهات، بەهەمان شێوە لەوڵاتە پاش _ کۆمەنیستەکانی دنیای ئەمڕۆ. زەینیەتی دیموکراتی لەهەر شوێنێك بێ کاری خۆی دەکا، بەڵام لەهەر شوێنێکیش بێ لەژێر هەڕەشەی پاشەکشێ‌و لەناوچوندایە.

## سنوردارکردنی بایەخی سیاسی

ماوەیەکی درێژە فیکری مۆدێرن بەرژەوەندی کۆمەڵگا بە پرنسیپی خێرو چاکە دەبینێ: پێیوایە شتێك بەسوودبێ بۆ کۆمەڵگا دەچێتەخانەی خێرو چاکە، شتێکیش زیانبەخش بێ بۆی دەچێتە خانەی خراپەو شەڕ، بەجۆرێك جیاوازیەك نەما لەنێوان مافەکانی مرۆڤ و ئەرکەکانی مرۆڤ وەك هاوڵاتی. ئەم متمانە ئەقلانی‌و "پێشکەوتوخوازە" بەگونجاندنی بەرژەوەندی تاکەکەس لەگەڵ بەرژەوەندی دەستەجەمعیدا، لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا پەسەند نیە. ئەوانەی بانگەوازیان بۆ ئازادی نەرێخواز دەکرد، بە سوپاسەوە، ئاگاداریان کردینەوە لەو متمانە زۆر ترسناکە، ئەوان لەبری ئەوەی بەشوێن ئامرازگەلێکدا بگەڕێن بۆپێڕەوکردنی شێوازەکانی بەشداری، بانگەوازیان کرد بۆ گەڕان بەشوێن چەند زەمانەتێکی دیاریکراودا. بەڵام پێویستە ئەم سیاسەتی بەرگرییە بە پرنسیپێك تەواوبکرێ کە زیاتر لە ئەرێخوازییەوە نزیکە نەك نەرێخوازی:

چونکه دیموکراسی سەلماندنی مافی تاك و گروپەکانە بۆ دروستکردنی مێژوی خۆیان، نەك تەنها بۆ دەربازبوون لە کۆتوبەندەکانیان و هیچیتر.

دیموکراسی تەنها خزمەتکردنی کۆمەڵگاو خزمەتکردنی تاکەکان نیە، بەڵکو خزمەتکردنی بونەوەرە مرۆییەکانە بەوپێیەی خودی کاران، واتە بەوپێیەی دروستکەری خۆیان و دروستکەری ژیانی تاکەکەسیو دەستەجەمعی خۆیانن. تیورەی دیموکراسی شتێك نیە جگە لە تیۆرەی مەرجە سیاسیە تەواوکەرەکانی بوونی "خود"ێك، کە هەرگیز رازی نییە لە "پەیوەندی مرۆڤ بەخودی خۆیەوە" پێناسە بکرێ، چونکە پەیوەندییەکی لەوجۆرە شتێکی وەهمییە. رێکخستنی کۆمەڵگەیی بەجۆرێك بە وردەکاریەکانی "من"دا رۆدەچێ، هەموو هەوڵێکی مرۆڤ بۆ ناسینی خودی خۆی، یان بۆ ئەزمونکردنی ئازادی بەشێوەیەکی تاکەکەسیو پەتی، تەنها دوو وەهمن و هیچیتر. زۆرجار ئەو دوو وەهمە لەو کەسانەدا دەبینینەوە کە لە ئاستە بەرزەکانی پلەبەندیی کۆمەڵایەتی یان بەپێچەوانەوە لە ئاستە نزمەکانیدان، بەئەندازەیەك بەهۆی پێگەکانیانەوە وادەزانن سەر بە دنیایەکن لە دەرەوەی دنیای کۆمەڵگەیی، دنیایەکی فەردیی پەتی، یان دنیایەکی سنوربەند، یان پێچەوانەکەی، بەمەرجی مرۆیی هەمیشەییو گشتییەوە.

دیموکراسی لەسەر بنەمای ئیعترافکردنی دەزگا کۆمەڵگەییەکان بە ئازادی تاك و گشت دامەزراوە. ئازادی فەردیو ئازادی دەستەجەمعی نایەنەبوون گەر حوکمکراوەکان پڕبە خواستی خۆیان توانای هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارانیان نەبێ، گەر زۆرترین ژمارەی خەڵك توانای بەشداریکردنیان نەبێ لە پێکهێنانی دەزگا کۆمەڵگەییەکان و گۆڕینیاندا. بەڵام پێویستە فیکر هەرگیز کۆڵنەدا، لەپێناو هەڵسەنگاندن و پێوانەکردنی بەردەوامی ئەو رووبەرەی ئەو دوو پرنسیپە لێکجیادەکاتەوە.

هەموو ئەو کەسانەی پێیانوابوو ئازادی راستەقینە بریتیە لە شوناسگۆڕینەوە (تەماهیکردن)ی گەلێك لە گەلان لەتەك دەسەڵاتێك لە دەسەڵاتەکان یان خواوەندێك لە خواوەندەکاندا" هەروەها هەموو ئەو کەسانەی، بەپێچەوانەوە، پێیانوابوو تاك و کۆمەڵگا کاتێ ئازاد دەبن کە پێکەوە ملکەچی ئەقڵ بن... کەسانێك بوون رێگەیان خۆشکرد لەبەردەم رژێمە دەسەڵاتگەرەکاندا. فیکری دیموکراتی ناتوانێ درێژە بەژیانی بدا گەر ئەم وەڵامە تاکدیدانە رەتنەکاتەوە. ئەگەر مرۆڤ هیچ نەبێ جگە لە هاوڵاتیەك، هاوڵاتیش هیچ نەبێ جگە لە هۆکارێك لە بازنەی پرنسیپێکی گشتگیری کۆخوازدا، ئەوا شوێنێك بۆ ئازادی نامێنێتەوە، بەڵکو ئازادی بەناوی ئەقڵو بەناوی مێژووەوە لەناودەبرێ. چونکە ئەوانەی بانگەواز بۆ ئازادی نەرێخواز دەکەن، یان وەك لیبراڵەکان، بانگەواز بۆ کۆمەڵگای کراوە دەکەن، زیاتر لەهەرکەسێك بەرەنگاری ئەو وەهمە ترسناکانە بوونەتەوەو بەرگەیان گرتوە، ئەوان توانیان بەرگری لە دیموکراسی بکەن باشتر لەو کەسانەی کە بانگەوازیان بۆ توانەوەی تاك و کۆمەڵگا دەکرد لەبۆتەی دیموکراسیەکی میللیدا، ئەو دیموکراسیەی کە لەمرۆبەدواوە، مێژو رێگەنادا تەنانەت ناویشیببرێ.

## سەرچاوە

ئەم بابەتە تەرجەمەی نەسکی یەکەمی کتێبێکی "ئالان تۆرین"ە، لەژێر ناونیشانی "دیموکراسی چیە؟ دەسەڵاتی زۆرینە یان دەستەبەرکردنی مافەکانی کەمینە؟". (بیروت: دار الساقی، ١٩٩٥).

# دیموکراسی له دیدی فەیلەسوفانی کۆن و نوێوه

**ئالن دوبنوا**

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

جورج ئۆروێڵ دەیوت: "ئەو کەسانەی بەرگری له ڕژێمێك دەكەن، جا هەر ڕژێمێك بێت، ناوی بەڕژێمی دیموكراتی دەبەن" ئەمە باسێكی تازە نییە، له ساڵی ١٨٤٩ دا **گیزۆی** مێژوونووس و سیاسەتمەداری فەرەنسی نووسیویەتی: "وشەی دیموكراسی هێند كاریگەر و بەهەیبەتە كە هیچ دەوڵەت و حیزبێك توانای ئەوەی نیه بوێرێت قسەی بەرانبەر بكات مەگەر وشەكە لەسەر ئاڵاكەی خۆی هەڵكەنێت". ئەوەی ئەمڕۆ بەڕاستیی دەرئەكەوێ ئەوەیە كە هەموان دیموكرات نین، كەچی هەموو بانگەشەی دیموكراتی دەكەن و، هیچ حوكمڕانێكی زاڵم نابینیت بە خۆی نەڵێت تا سەر ئێسقان دیموكراتە. وڵاتە كۆمۆنیستەكانی خۆرهەڵات نەك تەنیا خۆیان بە دیموكرات دەزانن، كە لە ڕاستیا دەستووری ئەو وڵاتانەیش ئەو قسەیە بە درۆ ناخاتەوە. بەڵكو دەڵێن دیموكراسیی ڕاستەقینە تەنیا لە وڵاتە كۆمۆنیستیەكاندا هەیە نەك ئەو دیموكراتیە "ڕووكەش"انەی كە لە وڵاتانی لیبرال دیموكراتی خۆراوادایە[1].

بەم جۆرە، تەنانەت ئەگەر لەسەر مانا و چەمكی وشەی دیموكراسی دیدێكی هاوبەش نەبێت، بەڵام لەبارەی بایەخ و گرنگی ئەم واژەیەوە دیدێكی هاوبەش هەیە كە جۆرێك لە چەمكی ڕۆحی نزیك بە پیرۆز (مقدس)ی دەداتێ كە باسكردنی زیاتر بەرەو گرێ و گۆڵ دەبات و گەلێك لە نووسەرانیش ئەمەیان باسكردوە.

لە ساڵی ١٩٣٩دا **تی. ئیس. ئەلیوت** ئەیوت: "كاتێك وشەیەكی وەك **دیموكراسی**، لە هەر چوارگۆشەی دنیاوە، مانایەكی وا پیرۆز پەیدا دەكات، كاتێك خەڵكی تا ئەم ڕادەیە ئەو مانایەی كە خۆیان مەبەستیانە دەیدەنە پاڵ ئەم وشەیە، ئیدی من لە خۆ دەپرسم كە ئایا ئەم وشەیە هێشتا مانا و چەمكێكی هەیە؟" **برتران دو جوڤیل** ساڵی ١٩٤٥ زۆر بە ڕاشكاوی نووسیویەتی: "ئەم هەموو باس و خواستە دەربارەی دیموكراسی و ئەم هەموو بەڵگە و ئەنگێزانە لە ڕەت كردنەوە یان قبووڵ كردنیدا بە هیچ جۆرێك بایەخێكی عەقڵی نیە، چونكە هەردوو لای چەند و چوونكەر بە تەواویی نازانن لەسەر چی

قسەدەکەن" **جیوڤانی سارتوری** دەڵێت: "ئەگەر یەکێکی لە نەریت دەرچوو بیەوێت بە پێچەوانەی بیروڕای باوی خەڵکەوە قسە بکات، دەتوانێت وا پێناسەی دیموکراسی بکات کە دیموکراسی بێجگە لە ناوێکی زل چی تر نیە" سەرئەنجام **جولین فروند** بە گاڵتە پێکردنێکی خۆشەوە دەڵێت: "ئیتر ئەو قسەیە هیچ مانایەکی نەماوە بڵێی فلان کەس دیموکراتە، چونکە مرۆڤ دەتوانێت هەم بە شێوازی ئەمەریکی و هەم بە شێوازی ئینگلیزی دیموکرات بێت و هەروەها بە شێوازی کۆمونیستەکانی وڵاتانی خۆرهەڵات و دانیشتوانی کۆنگۆ و حکومەتی کوبایش. لە بارێکی وادا ئاساییە من لە سیفەتی دیموکراتی بوون خۆم کەلا بخەم، چونکە دراوسێکەیشم دەتوانێت بڵێت دیموکراتە، لە کاتێکدا کە هەواداری دیکتاتوریە".

کەواتە، هەرچەندە واژەی دیموکراسی هەموو دنیای گرتۆتەوە بەڵام هێشتا ماناکەی روون نیە، هەر لەبەرئەوە قووڵبوونەوەی زیاتری دەوێت.

یەکەم تیورە کە جێگای قبووڵ کردن و بڕوای زوربەی خەڵکە ئەوەیە **کە دیموکراسی بەرهەمی تایبەتی سەردەمی نوێیە و لەگەڵ گۆڕانە هەرە تازەکانی قۆناغی رەوتی مێژوویی و رژێمە سیاسیەکاندا دەگونجێت،** ئەمە بیروڕایەکە بەرگری لێ ناکرێت. دیموکراسی نە "نوێتر" و نە "گۆڕاوتر"ە لە ڕژێمەکان یان ئەو بیروڕایانە دەبینین کە مەیلی دیموکراسیان تیایە، ئەوەی کە مێژوی جیهان مێژوی بەرەو پێشچوونی دنیایە و مێژو رەوتێکی ڕاستەهێڵی هەیە هەر قسەی ڕووتە و بەتایبەتی لە بواری مێژووی گۆڕانی رژێمە سیاسیەکاندا بێ ماناییان سەلمێنراوە، لێرەوە دەکرێ وەك هەندێك لە لیبراڵەکان ئەوە قبووڵ بکەین کە هزری دیموکراسی بیرێکی "سروشتی" و "خۆڕسکە"، وەك چۆن ئاڵو وێری ئابووری پێویستی بە بازاڕێکە، سیاسەتیش بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی پێویستی بە ڕەوشی دیموکراتیە. هەر لەم هێڵە فیکریەوەیە **جان بشلەر** دەنووسێت: "ئەگەر ئەوەمان قبووڵ بێت کە مرۆڤ ئارەزوی لە حکومەتێکە ئاسایش و ئازادی و ژیانی بۆ دابین بکات، ئەنجامەکەی وا دەبێت کە هەر کاتێك هەلومەرجەکە هاتە دی هەر لە خۆیەوە دیموکراسی سەرهەڵدەدات و پێویست ناکات مرۆڤ بە دەست بەداوێنی گرتنی فیکر و فەلسەفە ببێتە دیموکراسی" وەلێ ئەو هەلومەرجانە کامانەن هەر ئەوەندەی هاتنە دی ئیتر چۆن ئاگر گەرمی دەخاتەوە دیموکراسیش ئاوا بێتە دی؟ باسکردنی ئەو هەل و مەرجانە کارێکی ئاسان نیە.

حکومەتە ستەمکارە رەهاکان، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەندێك جار لە خۆرهەڵاتا دەیبینین، لە ئەوروپادا زۆر دەگمەنن، هەر لە هەمان سەرەتای مێژوەوە دەبینین کە لە رۆمای کۆندا و لە کتێبی **ئیلیاد** و کتێبی ڤیدای هیندیەکان و لە ناو گەلانی هیندیدا خەڵکی ئەنجومەنیان دروستکردوەو کاروباری وڵات و سوپای خۆیان لە ڕێگای راوێژەوە چارەسەرکردووە، بێجگە لەمە، لە کۆمەڵگای هیندو ئەوروپاییدا پاشایان هەڵبژاردوەو هەموو حکومەتە سەڵتەنەتیەکانی کۆن لە سەرەتادا بە هەڵبژاردن دروست بوون. **تاسیت** دەڵێت: جەرمەنیەکان "پێشەواو سەرکردەی خۆیان لەسەر بنەمای کاری چاك و پاشاکانیان لەسەر بنەمای رەسەنایەتی رەچەڵەك هەڵدەبژارد" تەنانەت لە فەرەنساشدا کاروباری سەڵتەنەت، تاماوەیەکی زۆر، هەم بە هەڵبژاردن و هەم بە میراتی بوو، واتا دوای **پیپین لوبرف**[٢] نەریتەکە وای لێهات کە پاشا لە نێو ئەندامانی خانەوادەیەکی دیاریکراو هەڵبژێردرێت و پاش **هوگ کاپە**[٣] بوو کە بنەمای گواستنەوەی

دەسەڵات بۆ کوڕی گەورە هاتە ئاراوە. لە ئەسکەندناڤیادا شا لە لایەن ئەنجومەنی ویلایەتەوە بە ناوی تینگ (*Thing*) هەڵدەبژێراو ئەنجومەنەکانی تری وڵات پاڵپشتی هەڵبژاردنەکەی ئەنجومەنی یەکەمیان دەکرد. گەلانی تری جەرمەنی شارەکانیان دەڕازاندەوە و ئاڵای خۆیان بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسەی مەبەستیان بوو هەڵدەکرد. لە ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی[٤] جەرمەنیشدا ئیمپراتۆر بە هەڵبژاردن بوو، بەو جۆرەی کە شازادەکانی ئەڵمان (گراند ئەلکتور)[٥] لەسەر یەکێك ڕێکدەکەوتن و تێکڕا هەڵیان دەبژارد، بە گشتی، لە ئەوروپادا تەنیا لە سەدەی دوانزە و بەدواوە کەم تا زۆر سەڵتەنەتی هەڵبژاردن لە هەموو شوێنێکدا گۆڕاوە بە سەڵتەنەتی میراتگری. بێجگە لەمە، پێش شۆڕشی فەرەنسا پاشاکان بە یارمەتی پارلەمان حکومەتیان بەڕێوە دەبرد و دەسەڵاتی پارلەمانیش ئەوەندە کەم نەبوە، لە هەموو گروپە کۆنەکانی ئەوروپادا، کەسانی ئازاد مافی سیاسیان پارێزراوە. مەبەست لە مرۆڤی ئازاد هاووڵاتیە. هاووڵاتیان لەو گوندانەدا دەژیان کە باجیان لەسەر نەبوو، ڕێوڕەسمی تایبەتی خۆیان هەبوو. پاشاکان پێش بڕیاردان، لەگەڵ شورای تایبەتیا راوێژیان دەکرد و لەگەڵ ئەندامەکانیاندا لە بەرژەوەندیەکان دەدوان، ئەوەی کە مافە دنیاییەکان لە کاری دادگەریدا کاریگەریی هەبوە خۆی بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە خەڵکی لە دانانی یاسادا هاوبەشیان کردوە. بە کورتی ناتوانین بڵێین لە کۆندا حکومەتە سەڵتەنەتیەکان لەلایەن خەڵکەوە ڕەوایەتیان نەبوە.

کۆنترین پارلەمانی دنیا ساڵی ٩٣٠ لە ئایسلاند دامەزراوە، ئەنجومەنێکی فیدرالی بوە بە ناوی **ئالتینگ** کە هەموو ساڵێك لە ناوچەی دانیشتونشینی **تینگس ڤلیر** پێك هێنراوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٠٧٦ دا **ئادایم دوبریم** دەنووسێت: "ئەمانە پاشایان نیە، تەنیا یاسایان هەیە" **تینگ**[٦]، یان پەرلەمانی ناوچەیی، لە هەمان کاتدا بەمانای شوێن و بارەگایەکە کە مرۆڤە ئازادەکان، واتا ئەو پیاوانەی کە مافی سیاسی بەرانبەریان هەیە، لە کاتێکی دیاریکراودا لەوێدا کۆدەبوونەوەو دەکەوتنە دانانی یاسا و کاروباری دادوەریان حەل و فەسڵ ئەکرد. لە ئایسلاند خەڵکانی ئازاد دوو ئیمتیازیان هەبوە کە هیچیان هیچ کاتێك مروری زەمان کاری لێ نەکردوون. مافی ئەوەیان هەبووە چەك هەڵبگرن و مافی ئەوەشیان بوە بچنە ئەنجومەنی **تینگە**وە. فردریك دوران دەنووسێت "ئایسلەندیەکان توانیویانە ڕێکخراوێك دروست بکەن و بیخەنە کارەوە کە نا لێکچوو نیە لەگەڵ داهێنانی یۆنانیەکاندا، واتا توانیویانە لە هاوڵاتیانی ئازاد کۆمەڵێك دروست بکەن، ئەم هاوڵاتیەکە ئازادانە لە بەڕێوەبردنی کاروباری شاریاندا بەشداریەکی چالاکیان کردوەو خەڵکێك بوون زۆر ڕووناکبیر، بە بیرێکی دەوڵەمەندەوە پەیوەندیەکانیان لەسەر بنەمای قەدرزانی و ڕێزی بەرانبەر دامەزرابوو".

**موریس گراویە** دەڵێ: "دیموکراسی لە وڵاتانی ئەسکەندناڤیادا زۆر کۆنە و دەتوانرێت ڕەگ و ڕیشەیان تەنانەت بگەڕێنرێتەوە بۆ شارستانیەتی سەردەمی **وایکینگە**کان" لە هەموو ئەوروپای باکووردا، ئەم نەریتی "دیموکراتیە" لەسەر بنەمای هەستێکی زۆر بەهێزی پەیوەستی بوونی تاکەکانی کۆمەڵ دامەزراوە و جۆرێك لە ئارەزووی پێکەوەژیانە، کە مەبەستی سەرەکی دابین کردنی سوودی گشتیە، وەلێ لە هەمان حاڵدا، لەم جۆرە کۆمەڵانەدا جۆرە باوەڕێك پلە بە پلە هەبوە، هەر لەبەر ئەمەیشی بووە کە لە دەربڕینی ڕێکخراوی

سیاسیدا وشەی "ئاریستو – دیموکراسی" بە کاربراوە. ئەم نەریتە کە لەسەر بناغەی هاوکاریکردنی بەرانبەری تاکەکان و هەستی لێپرسراوەیی هاوبەش سەقامگیر بووە، هێشتا لە زۆر وڵاتا باوەو سویسرا یەکێکە لەو وڵاتانە.

لە هەموو قۆناغە مێژووییەکانی سەدەی ناوەڕاستی ئەوروپادا، ئەم هزرە هەمیشە بەردەوام بوە کە **خەڵکی خاوەنی راستەقینەی دەسەڵاتە**، بەڵام لە هەمان قۆناغدا، رۆحانیەتی مەسیحیی بڕوای وا بوە کە سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکان زاتی خودایە. هەر لەو کاتەدا هەندێك لە بیرمەندان وتوویانە دەسەڵات ئەمانەتێکی خواییە، بەڵام لە پێگەی خەڵکەوە بە شا سپێرراوە، لەو مێژوە بە دواوە ئەم چەمکی دەسەڵاتە کە سەرچاوەی خوایی هەیە، بەڵام خەڵك بە شای سپاردووە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و بەجۆرێك دەخرێتە ڕوو کە خەڵك بە تەواوی پەراوێز نەکرێت. **مارسیل دوپادو** باس لە چەمکی فەرمانڕەوایی خەڵك دەکات و مەبەستی لە ئەنجامدانی کارەکە ئەوەیە کە دەبێت ئیمپراتۆر لەسەرووی کڵێساوە بێت. (مەبەستی لە ئیمپراتۆر لویس دوباڤیرە) لەو سەردەمەدا خەڵکی لەگەڵ فەرمانڕەواکاندا جیاوازیەکی زۆریان نەبووە، هەر لەبەر ئەوەیشە لە دەقە کۆنەکاندا، بەردەوام وشەی خەڵکی و گەورەکانیان بەکارهێناوە.

دەبێت لێرەدا باس لەو مەیلی دیموکراتیە بکەین کە لە ڕۆحی کۆن و لە کۆمارە ناوچەییە کۆنەکانی ئیتالیا و شارۆچکەکانی فەرەنسا و فلاندەرو ناوچەکانی باکووری ئەڵمانیا و یاسای بنەڕەتیی سویسراو ڕێسای زۆر کۆنی "ئازادی گوندەکان"دا کە لە زۆر شوێنی ئەوروپای خۆراوادا فەرمانڕەوایی کردوە هەبوە، بێجگە لە هەموو ئەمانە دەبێت ئەوە لە یاد نەکەین کە لە سەدەکانی ناوەڕاستا دێهات و بلۆکەکان لەسەر بنەمای هاوکاریی پیشەیی لە باج بەخشینی ناوچەکانیان، یەکیەتیان پێك دەهێناو لەو هاوکاری و کۆمەك بەیەککردنەدا مەبەستی ئابووری سیاسیان هەبوە و هەندێك جار لەگەڵ پاشا یان کڵێسادا تێکەوتوون. چینی بۆرژوای شارنشین کە لە پێگەیشتنابوو بە پاڵپشتیان دەژمێردرا. هەندێ جاریش رووی دەدا کە دەزگاکانی دەسەڵات بۆ بەگژاچوونی فیوداڵەکان لە یەکگرتوویی بلۆك و دێهاتەکان کەڵکی وەردەگرت و ئەمەیش دەبوە هۆی زووتر پێگەیشتنی چینی بورژوای بازرگان.

لە ڕاستیا زۆربەی زۆری ڕژێمە سیاسیەکانی مێژوو، جۆرە ڕژێمێکی **تێکەڵن**. **فرانسوا پیرو**[٨] دەنووسێت: "هەموو دیموکراسیە کۆنەکان جۆرە فەرمانڕەوایەتیەکی خانەدانەکان، یان باشتری بڵێین ئەسڵ سەڵتەنەتەکان، بە راستیی یان بە کردەیی بەڕێوەیان بردووە[٩]".

لەلای ئەرستۆ، ئەو دەستوورەی **سولون**[١٠] نووسیویەتی، بەو ئیعتیبارەی کە حکوومەت بداتە دەست کۆمەڵێکی هەڵبژاردە، ئەو جۆرە حکوومەتە ئولیگاریە[١١]. بەو ئیعتبارەیش کە پایە بڵندەکان بە شێوەی هەڵبژاردن دابنرێن، حکوومەتێکی خانەدانی (ئەریستۆکراتی)یە، بەو حسابەیش کە دادگا دادەنێت، دیموکراسیە. لە دیدی ئەرستۆوە ئەو دەستوورەی سولون دایناوە تایبەتمەندییەتی هەموو جۆرە ڕژێمە سیاسیەکانی تیایە، لەم زەمینەیەدا، پولیپ، مێژوو نووسی ڕۆمی چەند بۆچونێکی هەیە، دەڵێت: حکوومەتی رۆمای کۆن بە حسابی ئەو دەسەڵاتەی کونسوڵەکان هەیانبوو حکومەتێکی هەڵبژێراو بوو، بە حسابی ئەو بڕیارانەی ئەنجوومەنی شورا هەیانبوو، حکوومەتی خانەدان بوو، بە حسابی ئەو مافانەی خەڵکی هەیانبوو،

دیموکراسی بوو. سیسرون له کتێبی جەماوەردا هەر ئەوانە دەڵێتەوە. حکوومەتی سەڵتەنەتی دژی دیموکراسی نیە و ڕژێمە پادشاییە مەشروتە و پارلەمانیەکانی ئەم سەردەمەمان ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت. لە ساڵی ١٧٨٩ دا فەرەنسا حکوومەتی سەڵتەنەتی هەبوو، هەر ئەو حکوومەتە بوو کە داوای لە هەموو چینەکانی کۆمەڵگا کرد لە دەوری یەکدی کۆببنەوە و ئەنجومەن پێك بێنن. پاپای دوانزەیەم دەڵێت: "ئەگەر تەماشای دیموکراسی بەمانا فراوانەکەی بکەین، دەبینین بەشێوەی جۆراوجۆر هاتۆتە گۆڕێ و هەم لە حکومەتی سەڵتەنەتی و هەم لە حکوومەتی کۆماریدا دێتە دی".

دەبێت ئەوەیش بڵێین کە تاقیکردنەوەی سەردەمی تازە ئەوەمان نیشان دەدات کە هەم ڕژێمە لێکچووەکان دەتوانن لە زۆر بواری کۆمەڵگای زۆر جیاوازدا سەقامگیر بن و هەم ڕژێمە جیاوازەکان دەتوانن لە کۆمەڵگای وەك یەکدا کارابن (کۆمەڵگای ڕۆژئاوای ئێستامان ساختمانێکی زۆر گونجاوو کۆکی هەیە و لە یەکتر دەچن، بەڵام لە بنەما و دەستورەکانیاندا هەندێك جار زۆر لە یەکدی جیاوازن).

ئێستا ئەگەر بمانەوێ مانای دیموکراسی لێکبدەینەوە دەست بۆ کارێکی دژوار دەکێشین، شەن و کەوکردنی وشەکە بێ سوودە، مانای ڕاستیی وشەکە نەك مەجازیەکەی "دەسەڵاتی خەڵك"ە. بەڵام ئەم چەمکی "دەسەڵاتی خەڵك"ە دەشێت بەشێوەی جیاواز مانا بکرێ، ماقووڵترین شێواز ئەوەیە کە لە باری مێژوییەوە دیموکراسی لێك بدەینەوە، ئەم ڕەوشە وای دەوێت کە بڵێین دیموکراسی ڕاستەقینە پێش هەر شتێك سستمێکی سیاسی بووە لە یونان و ڕۆمای کۆندا هاتۆتە دی و هەر ئەوانیش بوون کە هەم واژەی دیموکراسی و هەم ماناکەیان، واتا ناوو و ناوەرۆکەکەیان داهێناوە.

بەڵام چەمکی دیموکراسی، لە بیری سیاسی تازەدا، تا پێش کۆتایی هاتنی سەدەی هەڤدە دەرناکەوێت، لە سەدەی هەڤدەهەمیشدا بە جۆرێکی کاڵ و نادیار لە دەقێکی تاڕادەیەك سوکایەتی پێکردندا بەکاربراوە. تا پێش شۆڕشی گەورەی فەرەنسا، پێشکەوتووترین فەیلەسوفان لە دنیای خەیاڵدا خەویان بە ڕژێمێکی تێکەڵەوە بینیوە کە تایبەتمەندیەتی حکوومەتێکی سەڵتەنەتی "ڕوشن بین" لەگەڵ تایبەتمەندیەتی ڕژێمێکی پارلەمانیدا بەیەکەوە گرێ بدات. مونتسکیو مافی ئەوە بە خەڵکی دەدات کە چاودێربن، بەڵام پێیان ڕەوا نابینێت کاروباری کۆمەڵگا بەڕێوەبەرن. هیچ دەستورێکی شۆڕشگێر نیە ئیلهامی لە بنەمای دیموکراتی وەرگرتبێت. روبسپیر یەکێك لە کەسە ناوازەکانی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسیە کە لە کۆتایی فەرمانڕوایی خۆیدا بە ڕاشکاوی لایەنگریی لە دیموکراسی دەکرد. بەڵام ئەم کارە لە ساڵانی دواییدا خۆشەویستیەکی وای لەناو خەڵکیدا بۆ پەیدا نەکرد. روبسپیر پێناسەی ڕژێمی دیموکراسی وا دەکات کە خەڵکی نوێنەرانی خۆیانی تیا هەڵدەبژێرن. دەڵێت دیموکراسی "هەلومەرجێکە خەڵکی لەسەر بنەمای ئەو یاسایانەی خۆیان دایان ناوە، ئەوەی بتوانن بەدیبهێنن ئەنجامی دەدەن، ئەوەیش کە نەتوانن خۆیان ئەنجامی بدەن بە هۆی ئەوانەوە کە هەڵیانبژاردوون بەدیدەهێنن (گوتاری پێنجی فوریە ١٧٩٤).

لە ئەمریکا، لە سەرەتای سەدەی ڕابووردودا، بە دەرکەوتنی دیموکراسی جاکسون و دامەزرانی حیزبی دیموکرات. وشەی دیموکراسی کەوتە سەر زمانی خەڵکی. لە کاتێکدا کە لە سەرەتادا ئەم

وشەیە وەك چەمكێكی پێچەوانەی "كۆماری" بەكاریان دێنا. لە دووتوێی ئەو وتووێژانەدا كە لەسەرجەم نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەدا لە ئەوروپا لەبارەی دەستوورەوە لە ئارادا بوو، زاراوەی دیموكراسی لە ئۆقیانوسی ئەتڵەس پەڕیەوە و دووبارە گەڕایەوە بۆ ئەوروپا و ئەو كتێبەی كە توكڤیل لە ژێر ناوی "دیموكراسی لە ئەمریكا"دا نووسی، سەركەوتنێكی گەورەی بەدەست هێناو ئەم وشەیەی كردە وێردی سەر زمانی خەڵكی.

ئەگەرچی فەیلەسوف و سیاسەتمەدارانی سەدەی هەژدە لە گفتوگۆ و نووسراویاندا زۆر پشت بە بەرهەمی فەیلەسوفانی یۆنان دەبەستن. بەڵام كاریگەریی یۆنان و ڕۆم وەك نموونەیەكی بەڕاستیی سیاسی زۆر لاواز بوە. دانایانی ئەم قۆناغە زیاتر بایەخیان بە ئەسپارست داوە نەك بە ئەسینا. لەو دانوستانە سیاسیانەدا كە لە ژێر ناوی "ئەسپارت یان ئەسینا" بەڕێوە دەچوو، پێش داوەری و نەزانین ڕۆڵی گرنگی هەبوو، زۆرجار دەبوە هۆی ئەوەی كە لایەنگرانی "دەسەڵات بەكارهێنان بۆ سەقامگیركردنی یەكسانی" لەگەڵ لایەنگرانی "لیبرالیزمی میانڕەو" بكەونە گیانی یەكتر. بۆ نموونە، ڕۆسۆ ڕقی لە ئەسینا بوو و زۆر بە توندی هەستی خۆشەویستی خۆی بۆ ئەسپارتی دەردەبڕێت. بەڕای ئەو ئەسپارت بە پلەی یەكەم وڵاتی پیاوانی یەكسانە، بە پێچەوانەی ئەوەوە **كامیل دیسمولیسن**(١٢) دەوروژێ و لە دژی ئەو یەكسان ویستیە توندڕەوو باوەی ئەسپارت دەنگی ناڕەزایی هەڵدەبڕێتو ، تاوانی بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە بیرانە لە ئەستۆی **بریسوی** ڕابەری حیزبی **گیروندن** دەنێت. ئامانجی ئەم حیزبە، كۆماری خوازی و لایەنگری گەڕانەوە بوو بۆ ڕای گشتی و پاراستنی یاسا و ئازادیی ئابووری، لە ڕاستیدا وەرگێڕی بیروڕای بۆرژوازیی ڕۆشن بینی سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنسای دەكرد. كامیل دیمسولیسن دەیوت: ئەم پیاوە (واتا بریسو) "هاووڵاتیەكانی ئەوی وەك یەك داناوە، وەك چۆن زریانێكی سەخت كەشتی شكاوەكان وەك یەك لێدەكات"

بەهەرحاڵ، چەند و چوونی ئەم دوو گروپە كەم و زۆر ڕووكەش دەمێنێتەوە و بیرهێنانەوە بۆ پێویستی گەڕانەوە بۆ یۆنانی كۆن و ڕێزلێنانی زیاتر زارەكیە تا واقعیی. بەجۆرێك سانژوست، كە یەكێكە لە ناودارەكانی شۆڕشی فەرەنسا، كاتێك بەرانبەر كنوانسیەكان (ئەنجومەنی دامەزرێنەرانی شۆڕش) قسە دەكات، لە دیموكراسی یۆنان و ڕۆمی كۆن وەك خوازەیەك بۆ نوێ كردنەوەی هێزی دیموكراسی لە فەرەنسەدا باس دەكات و دەڵێت: "لە سەردەمی ڕۆمەكان بەدواوە دنیاخاڵیە، بیری ئەمان جیهان پڕ دەكات و موژدەی سەقامگیریی ئازادی دەگەیەنێ".

كەواتە ئەگەر بمانەوێت باس لە دیموكراسی ڕاستەقینە بكەین دەبێت ڕوو لە دیموكراسیەتی یۆنان بكەین نەك لەم ڕژێمانەی ئەمڕۆی جیهان كە ئەو ناوەیان لە خۆیان ناوە. بەراوردكردنی دیموكراسیەكانی جیهانی كۆن لەگەڵ دیموكراسیە تازەكاندا وەك ئەوە وایە مەشق لەسەر خەتێكی ئاسان و زۆر بەكارهاتوو بكەیت. مەسەلەی سەرەكی بەراوردەكە ئەوەیە كە دیموكراسیی سەردەمی كۆن دیموكراسی ڕاستەوخۆ بوە.

بەڵام ئەم دیموكراسیە تازانە (بە هۆی پان و بەرینی سەرزەوی و زۆریی خەڵك)ەوە دیموكراسیەتێكە پشت بەستوو بە هەڵبژاردنی وەكیل. هەروەها ئاشكرایە كە كۆیلەكان لە دیموكراسیەتی ئەسینادا جێگایەكیان نەبوەو ئەمەیش ئەوە دەرئەخات كە دیموكراسیەتی ئەسینا

هێند دیموکراسی نەبوە، هەقیقەتیش ئەوەیە کە ئەم دووباری سەرنجە کەمێك پەلەیان پێوە دیارە.

گۆڕانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاین و ئەو چاکەکاریانەی لە یاساکانی **سولون** کەوتنەوە، زەمینەیەکی وای بۆ دیموکراسی ئەسینا ڕەخساند تا **ئالکمیونیدکیتسن** کە ساڵی ٥٠٨ لە تاراوگە گەڕایەوە ڕیفۆڕمە بنەڕەتیەکانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. ئەو دیموکراسیە چاك کراوە دوای ٤٦٠ هێند بە توکمەیی دامەزرا کە سەدە و نیوێك دەوامی کرد. پریکلس کە لە ٤٦١ دا لە جێگای ئەفیالتس دانیشت، بوو بە هۆی ئەوەی یۆنان ناوبانگێکی زۆرمەزن دەربکات، بەڵام ناوبانگ دەرکردن بۆ دیموکراسی ڕێگای لەوە نەگرت کە پریکلس زیاد لە سی ساڵ فەرمانڕەوایی بکات و وەك پاشایەك توانا و دەسەڵاتی خۆی لە وڵاتەکەدا پیادە بکات[١٣].

لە دیدی یۆنانیەکانەوە دەبێت دیموکراسی لە چوارچێوەی بەراوردکردنی لەگەڵ دوو سستەمی تردا پێناسە بکرێت، واتا حکوومەتی دیسپۆتیزمی و حکوومەتی خانەدانەکان. دیموکراسی سێ مەرجی هەیە: **یەکسانی بەرانبەر بە یاسا** (**ئیزونومی**)، **مافی یەکسان بۆ گەیشتن بە هەموو پلە و پایەیەك** (**ئیزوتیمی**) **و ئازادیی ڕا دەربڕین** (**ئیزوگوری**). دیموکراسی ئەسینا، دیموکراسیەکی ڕاستەوخۆیە، واتا هەموو هاووڵاتیەك دەتوانێت لە وتووێژی ئەنجومەنی نوێنەراندا بەشداری بکات، لە ئەنجومەنێکدا بە ناوی **بوله** (*boule*) یان شورا ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە دەکرێت. بەڵام ئەوەی بڕیار ئەدات ئەنجومەنی خەڵکە. ئەم ئەنجومەنە سەفیر دەنێرێت، بڕیار لەسەر شەڕ و ئاشتی ئەدات، لەشکرکێشی و داوای سوپا دەکات و سەرپەرشتی کاری کارمەندان دەکات، فەرمان دەرئەکا و بڕیار لەسەر یاساکان دەدات، هاووڵاتی نوێ قبووڵ دەکا و داوەری لەسەر ئەو مەسەلانە دەکات کە پەیوەندیان بە ئاسایشی گشتیەوە هەیە. بە کورتی "**خەڵکیی لە بری ئەوەی کە تەنیا فەرمانڕەواکانی خۆیان هەڵبژێرن، خۆیان فەرمانڕەواییان دەکرد**" **جاکلین دورومی** دەقی سوێندنامەی ئەسینیەکان بەم جۆرە باس دەکات:

"من بە زمانی خۆم، بە کردەوەی خۆم و بە دەربڕینی خۆم و ئەگەر بتوانم بە دەستی خۆم ئەو کەسەی بیەوێ دیموکراسی ئاوەژو بکات دەکوژم (...) و ئەگەر کەسێکی تر ئاوەژوکەری دیموکراسی لەناوبەرێت من بەرانبەر بەوە لای خوا وەك مرۆڤێکی چاکەکەر و پاکداوێن کە دوژمنی خەڵکی کوشتوە، ستایشی دەکەم".

بەم شێوەیە، دیموکراسی ئەسینا بە پلەی یەکەم موڵکی هاووڵاتیانە، واتا موڵکی خەڵکی ئەسینایە کە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا یان **ئیکلیزیا** پێکەوە کۆدەبوونەوە. هاووڵاتیان بەو پێیەی کە پەیوەندیان بە دموس (*Demos*) ێکەوە هەیە، کە چەمکێکە هەم زەمینی و هەم بەڕێوەبەری و هەم کۆمەڵایەتییە، پۆل بەندی دەکران. وشەی دموس (*Demos*) لە زمانە دیالێکتە یونانیەکاندا لە **دورید** باو بوە کە یەکێکە لە ویلایەتە مەرکەزیەکانی یۆنانی کۆن، ئەم وشەیە هەم بە مانای ئەو خەڵکانە دێت کە دانیشتووی سەرزەمینێکن هەم بە مانای خودی سەر زەمینەکەو ئەو دوو چەمکە لەگەڵ یەکتردا پەیوەندیەکی دانەبڕاویان هەیە[١٤].

ئەوە چۆنایەتی سەرزەمینە کە هەلومەرجی تایبەتی دانیشتووی ئەو ناوچەیە دیاری دەکات. تا رادەیەك مانای **دموس و ئینوس** (واتا ئەو کەسانەی لەیەك نەژادن) وەك یەك وان، دیموکراسی لەسەر حسابی بوونی تاك بنیات نەنراوە، دیموکراسی بە ئیعتباری بوونی پولیس[١٥] واتا شارێك کە

کۆمەڵێکی پێکەوە بەسراوی ڕێکخراو لەوێدا دەژی، دامەزراوە. ئەگەر کۆیلەکان لە ڕادەربڕین مەحرومن، لەبەر ئەوە نیە کە کۆیلەن. بەڵکو لەبەرئەوەیە کە هاووڵاتی نین. کام دیموکراسی هەیە ڕێگای ڕادەربڕین بەدەر لە هاووڵاتی خۆی بدات[١٦]؟چەمکەکانی هاولاّتی و ئازادی و یەکسانی و مافی سیاسی و حوکمرانی خەڵکی،چەمك گەلێکن لەگەڵ یەکتردا پەیوەستییەکی تەواویان هەیە. لەبارەی هاولاّتیەوە، بنەمای سەرەکی شوێنی لەدایك بوون و رەگ و ڕیشەیە، واتا لەکوێوە دێت و رەگەزت دەچێتەوە سەر کێ: پریکلس "کوڕی ئیگزانتیپە و لەناوچەی کولار کوسەوە هاتووە". لە ٤٥١ بەدواوە یەکێك لە مەرجی بوونە هاووڵاتی ئەوەبوو دەبوو دایك و باوکی کەسەکە یۆنانی بێت، مانای هاووڵاتی (پۆلیس) چونکە رەچەڵەك و نەژاد دەگرێتەوە بەرانبەر بە چەمکی ناهاووڵاتی (ئیدیوتس)ە، ئەم مانایەی دوایی زۆر زوو ڕەنگی سووکایەتی لە خۆ دەگرێ (بەجۆرێك کە ئیدیوتس کە لە سەرەتادا بە مانای مرۆڤی بێ رەچەڵەك و نەژاد بوو، پاشان مانای "گەلحۆ"ی لە خۆگرت) بەم جۆرە، دەبینین کە رۆڵی هاووڵاتی لە پێگەی هاووڵاتیەوە ڕیشە دەگرێ کە ئەویش خۆی بە تەواوی لقێکی شوێن لەدایك بوونی هاووڵاتیە. بەجۆرێکی دی بڵێین، هاووڵاتی بوون بە مانای دەربەست بوونە بە وڵاتێکەوە کە هەم سەرزەمینێکە و هەم مێژوویەکی هەیە، خەڵکان ئەسینا دەبێتە زادگایان، بەڵام نابنە ئەسینایی (مەگەر بە هەڵاوێردکردن و دەگمەن) بائەوەیش بڵێین کە لە نەریتی ئەسینادا هاوسەریەتی لەگەڵ بێگانەدا کارێکی ناپەسەندە، ئەم یەکسانیە سیاسیە کە یاسا سەپاندویەتی، لە زادگای هاوبەشەوە سەرچاوەی گرتوە. زادگا (شوێن لەدایك بوون)ی هاوبەش، یەکسانی سیاسی بەوانە دەدات کە لە شوێنێکدا لەدایك بوون، ئەوە شوێنی لەدایکبوونە، مافی هاووڵاتیەتی تاقەکەس بە تاکەکان دەبەخشێت. ڕەگی دیموکراسی ئەسینا لە چەمکی شوێنی لەدایکبوونی هاووڵاتیەوە دەست پێ دەکات. پرۆسەی دیموکراسی لەگەڵ ڕەگ و ڕیشەی کارمەندانی دیموکراسیدا پەیوەستە. خەڵکی ئەسینا لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا لە ستایش کردنی خۆیاندا هەمیشە دەیانوت، (خەڵکی خۆماڵی ئەسینا، بەناوبانگن) یونانیەکان دیموکراسی خۆیان هەر لە سەر ئەفسانەی شوێنی لەدایك بوون بنیات نابوو.

لە زمانەکانی یونانی و لاتینیدا، وشەی ئازادییش هەر لە واژەی شوێنی پێگەیشتن و لەدایك بوونەوە سەرچاوەی گرتووە. مرۆڤی ئازاد (*Eleutheros*) بە پلەی یەکەم کەسێکە "ڕەگ و ڕیشە"ی هەبێت (بە لاتینی وشەی لیبری — کە لیبرتە = بە فەرەنسی واتا ئازادی لەوێوە هاتوە — بە مانای "منداڵان"ی دایك و باوکە) **ئمیل بنڤ نیست** دەنووسێت، لە "ڕەچەڵەکی خانەدان بوون و ئازاد بوون لە راستیدا یەك شتە" بەم جۆرە، لە زمانی کۆنی ئەڵمانیدا خزمایەتی واژەی فرای (ئازاد) و فرویند — *Freund*. (هاوڕێ)ئەوە دەرئەخات کە لە بناغەدا چەمکی ئازادی پەیوەستە لەگەڵ مانای ئازادی و ئاشنایەتیدا. ڕیشەی هیندو ئەوروپایی لود (*leudh*) کە زمانی لاتینی لیبر و یونانی ئەلوتروس لەوێوە وەرگیراون، سەرئەنجام مانای "کەسانێکی" پەیدا کرد کە سەر بە خەڵکێکی دیاریکراون، (بەراوردی بکەن لەگەڵ لیودو لە زمانی سلاڤی کۆن بە مانای خەڵك و ئەڵمانی لویتە بە مانای "کەسەکان، تێکڕا ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە وەرگیراون کە بە مانای "نەش و نوماکردن و فراوان بوون"ە.

بەم شێوەیە، مانای ڕەسەنی "ئازادی" بە هیچ شێوەیەك بە مانای "ئازادكردن"، واتە رزگاربوون لە كۆت و بەندی پەیوەستبوون بە كۆمەڵێكی تایبەتەوە نیە، بە پێچەوانەوە، ئازادی جەخت لەسەر پەیوەندی تاك بە كۆمەڵی شارو هاووڵاتیانەوە دەكات، خودی ئەم پەیوەندیەیش مرۆڤ بە سیفەتی ئازاد وەسفدەكات. هەر ئەمەیشە كاتێك یونانیەكان لەسەر ئازادی دەدوێن بە هیچ جۆرێك مەبەستیان لە مافی رزگاری نیە لە ئەندامێتی "دەوڵەتی شار" و ڕاكردن نیە لەو كۆتانەی كە هاووڵاتی پێوە بەستراوەتەوە. یونانیەكان مەبەستیان لە ئازادی، دەستەبەركردنی ماف و توانای سیاسیە بەهۆی یاساوە كە هاووڵاتی لە كاروباری دەوڵەتدا بەشداری بكات. لە ئەنجومەنەكاندا ڕای خۆی دەربڕێ و كارمەندان هەڵبژێرێ، ئازادی، ناكۆكی و ناتەبایی لەبەرناگرێت و پێچەوانەكانی بەڕاست دەزانێت. واتا ئەو پەیوەندییەی كە خەڵكی دەبەستێتەوە بە "دەوڵەتی شارەوە" دەبێتە مایەی ئازادی هاووڵاتی. ئازادی لە ڕوانینی یونانی كۆنەوە بە مانای خودموختاری نییە، ئازادی یونانی لەسەر بنەمای هاوبەشی (یان بە هاوبەش پێكردن)ە، ئەم ئازادیە لە چوارچێوەی دەوڵەتی شار "سیتە"[١٧]دا جێبەجێ دەكرێ و وابەستەی كۆمەڵێكی دیاریكراوە.

ئازادی واتا پەیوەست بوون، "ئازادی" تاكە كەسی كە پەیوەست بوونی تیا نەبێت و لە ناوخەڵكیدا جێی خۆی نەكردبێتەوە تەواو بێ مانایە. یەعنی هەرچەندە ئەوە ڕاستە كە ئازادیی پەیوەندیەكی راستەوخۆی بە چەمكی دیموكراسیەوە هەیە، بەڵام دەبێت ئەوەیشی لەگەڵدا بێت كە ئازادیی پێش هەر شتێك ئازادیی خەڵكی، واتا ئازادیی هەموانە و ئازادیی هاووڵاتیش لەوێوە سەرچاوەدەگرێت. ئازادیی خەڵكی یان بە وتەیەكی دی ئازادیی دەوڵەت شاری "سیتە" بنەمای یەكسانی مافی سیاسی تاكەكانە، یەعنی ئەو مافانەی وەك هاووڵاتی دەدرێتە تاكەكان. ئەوەی پەیوەستە بە ئازادیەوە و یەكەم مەرجیەتی سەربەخۆیی (یان نەبوونی پاشكۆیەتی)یە. بەڵام مرۆڤ لەناو كۆمەڵگادا دەژی، بۆیە بەبێ ئازادیی هەموان ئازادیی تاك هەرگیز نایەتەدی، لە یونانی كۆندا تاكەكان تا ئەو شوێنە ئازادیان بڕی دەكرد كە دەوڵەتی شاریان ئازادبوایە.

كاتێك ئەرەستۆ مرۆڤ وەك "حەیوانی سیاسی" و بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتی پێناسە دەكات و، كاتێك دەوڵەتی شار لەسەرووی تاكەوە دادەنێت و دەڵێت دەبێت تاك توانای خۆی لەناو كۆمەڵگادا بەگەڕبخات، مەبەستی لەو قسانە ئەوەیە كە ناتوانیت مرۆڤ لە هاووڵاتی جیابكەیتەوە و ناتوانیت مرۆڤ لە چوارچێوەی كۆمەڵێكی پێكهاتو (بەوتەی یونانیەكان پولیس و بەوتەی رۆمیەكان سیڤیتاس – *Civitas*) بكەیتە دەرێ، هەر لەبەر ئەمەیشە دەبینین ئەرەستو پێش سەرهەڵدانی ئەو فەلسەفە لیبرالیزمە نوێیەی تاك پێش كۆمەڵگا دەخات و مرۆڤ وەك تاكێكی لەناوخۆیدا و زیاد لە هاووڵاتیەك دەداتە قەڵەم، ئەم فەلسەفەیەی بەراست نەزانیوە.

بەرئەنجام وا دەشكێتەوە كە (لە كۆمەڵێكدا كە لە خەڵكانی ئازاد پێك هاتبێت) بەرژەوەندی تاكەكەسی ناتوانێت بەرژەوەندی گشتی لەژێر پێ بنێت. هەروەها ئەرەستۆ دەڵێ "ئەگەر عەدالەتی ڕەها بكەینە پێوانەی بڕیارەكان هەموو دەستورەكان كە بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاو ئەگرن تەواو راستن، بەڵام ئەو دەستورانەی كە بەرژەوەندی شەخسی فەرمانڕەواكان لەبەرچاو دەگرن خەوشدار و ناتەواون، بە پێچەوانەی ئەوەوە كە بۆ نموونە لە بەرهەمەكانی یۆرپیدسدا هەیە. لە نووسینەكانی

ئەشیل (ئیسخیلوس) دا دەوڵەتی شار وەك پێکهاتەیەکی تەواو ڕێك و پێك دێتە بەرچاو، فینلی دەنووسێت "ئەم هەموو بایەخدانە بە چەمکی کۆمەڵ کە ئاینی قبووڵکراوی دەوڵەت و ئەفسانە و نەریتە باوەکانیش سەرقاڵی بوون و بەهێزیان کردوە، بنەمای سەرەکی سەرکەوتنی دیموکراسیەت بوە لە ئەسینادا" فینلی لە شوێنێکی تردا دەنووسێت، لە یوناندا "ئازادیی بە مانای حکومەتی یاسا و هاوبەشی کردنە لە بڕیاردانا نەك خاوەندارێتی کۆمەڵێ ماف کە قابیلی سەندنەوە نین"، مێژوو نووسێکی تر بە ناوی پالاڤین دەنووسێت: "گوێڕایەڵی لە یاسا واتا پەیڕەوی کردن و تێکۆشانە لە ڕێی بەدیهێنانی ئیرادەی خەڵکیدا" ئەوە ئازادیە کە قانوون دروست دەکات، سیسرون دەیوت: "ئێمە بۆ ئەوەی ئازادبین خزمەتکاری یاساین".

ئەرەستۆ هەر لەوکاتەدا کە ئازادی بە بنەمای سەرەکی دیموکراسی دادەنێت، جەخت لەسەر ئەوەیش دەکات کە یەکسانی بنەمای سەرەکی دیموکراسی نیە، بەلای یونانیەکانەوە یەکسانی هۆکارێکە لە خزمەتی دیموکراسیا، نەك هۆی بەوجودهێنانی. یەکسانی سیاسی، کە لە هاووڵاتیەوە سەرچاوەی گرتوە، یەعنی پەیوەست بوون بە خەڵکی دەوڵەتێکەوە. یەکسانی لەو ڕاستیەوە دەست پێدەکات کە تاکەکانی کۆمەڵێك (واتا تاکەکانی دەوڵەت شارێك) چەند لە یەکدی جیاوازبن بەلایەنی کەمەوە لەوەدا هاوبەش بن کە هەموو هاووڵاتین و هەموویان بە ڕێگایەك هاووڵاتین. بەم شێوەیە، یەکسانی لە مافدا بە هیچ جۆرێك بەمانای یەکسانی بوونی سروشتی نیە، ئەم مافی یەکسانە کە بۆ خەڵکی دانراوە بۆ ئەوەیە بتوانن بەشداری ئەنجومەن بکەن نەك بەو مانایەی کە مرۆڤەکان هەموو وەك یەك وان (نەك ئەوەیش کە وەك یەك بوون باش بێت) مەبەست ئەوەیە کە خەڵکیی لە ڕەوشێکی چونیەکدا پەیوەستن بە شاری خۆیانەوە و لەبەر ئەوە ئیمتیازاتی وەك یەکیان هەیە بۆ ئەوەی لە مافی هەڵبژاردندا کە تایبەتە بە هاووڵاتیانەوە، بەهرەگیربن. سیاسەت تەکنیك یان هونەرێکە و یەکسانی کەسەکان شێوازێکە لە دەستی سیاسەتدا. چەمکی یەکسانی چەمکێکی دەرەکیە بەنیسبەت مرۆڤەوە، واتا ناوەکیی مرۆڤ نیە. هۆیەکە بۆ فەرمانڕەوایی کردنی هاووڵاتی. یەکسانی بەرئەنجامێکی لۆژێکی پەیوەستی هاوبەشی خەڵکیە بە یەکترەوە و لە هەمان کاتدا بەمەرجی یەکەمی بەشداریکردنی گشتی دەدرێتە قەڵەم، بە بۆچوونی یونانیەکان ڕاست ئەوەیە هەموو هاووڵاتیان بەشداربن لە کاری سیاسەتدا، نەك بەو حسابەی کە مرۆڤ خۆی لە خۆیدا لە هەر شوێنێکی دنیادا بێت مافی خۆی هەیە، تاکەکان بە پێی هاووڵاتی بوونیان، لە سیاسەت گوزاریدا بەشدارن، بە کورتی بنەمای بەشداری کردن لە سیاسەتی یونانی کۆندا هاووڵاتی بوونە نەك یەکسانی تاکەکان، دیموکراسیەتی یونان وێنە یان شێوازی ڕژێمێکی سیاسیە کە ئازادیی تیایدا لەسەر بنەمای یەکسانی هەموو هاووڵاتیان لە کەڵك وەرگرتن لە مافی مەدەنی و سیاسیدا، دامەزراوە.

ئەو زانیاریانەی لەبارەی دیموکراسی کۆنی یونان و ڕۆمەوە توێژینەوەیان کردوە، زۆر بیروباوەڕی جیاوازیان هەیە. هەندێك لەو بیرمەندانە دیموکراسی ئەسینا، بە نموونەیەکی چاکی نیشتمان پەرستی و فەزیلەتی مەدەنی پێویستی بۆ هاووڵاتی و لە پێش دانانی بەرژەوەندی گشتیی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیدا، دادەنێن. (فرانچسکونیتی) لە دیدی هەندێکی ترەوە، یونانی کۆن بارەگای ئەو پارتە سیاسیانەیە کە دەیانەوێت

خەڵکی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە مەسەلەکاندا بکەن. (پاڵڤن) لای هەندێکی دی دیموکراسیەتی یونان تەواو "توتالیتار"ە (جوان سارتوری). بە گشتی هەموو توێژەرەوەکان لەسەر ئەوڕایەن کە جیاوازی نێوان دیموکراسیەتی کۆن و دیموکراسیەتی تازە زۆرە. بەڵام سەیر لەوەدایە کە بۆ نرخاندنی هەمەلایەنەی دیموکراسی کۆن، توێژەرەوان دیموکراسیە تازەکان دەکەنە پێوانە و شوێنی بڕیار، ئەم جۆرە بەڵگاندنە سەرسوڕهێنەرە، چونکە وەك بینیمان "دیموکراسی" بەو شێوەو مانایەی کە لە ڕژێمە سیاسیەکانی ئەمڕۆدا بەکاردێت، دیاردەیەکی تازەیە. لە قۆناغی دوەمی لێکۆڵینەوەکەدا، توێژەرەوەکان لە بارەی دیموکراسی کۆنەوە سەرنجی ئەوەیان داوە کە ئەو دیموکراسیانە لەگەڵ دیموکراسی نوێدا جیاوازیان هەیە و، گەیشتوونەتە ئەو ڕاستیەی کە دیموکراسی کۆن لە دیموکراسیەکانی ئێستای ئێمە "کەمتر دیموکراتین" هەقیقەت ئەوەیە کە دەبێت بەڵگاندنێکی پێچەوانە بکەیت و بڵێیت: دیموکراسی لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیحدا، لە یونان دروست بوە، بۆیە دیموکراسی "ڕاستەقینە" دیموکراسیی لەدایك بووی یونانە. ئێستا داوەریی لەو بارەیەوە چۆنە با وابێت. ئەگەر ڕژێمە "دیموکراتیەکان"ی ئەم سەردەمەی ئێمە جیاوازیی لەگەڵ دیموکراسیی ئەسینادا هەبێت، مانای وایە دیموکراسیی ئەمڕۆ لە بناغەوە لەگەڵ مانا ڕاستەقینەکەی دیموکراسی جیاوازیی پەیداکردوە. ئێستا بە چاکی دەردەکەوێت کە گرفتاری و خاڵی لاوازی هاوسەردەمەکانی ئێمە لە چیدایە. ئەمڕۆ هەموو کەسێك بڕوای وایە کە دیموکراتە و زۆر دیموکراتیشە، لەبەر ئەوەیش کە دیموکراسیی یونان تەواو لەگەڵ دیموکراسیی ئێستادا بە گونجاو نابینێت، بۆیە یونانیەکان کەمتر لە خۆی بە دیموکرات دەزانێت. بەمجۆرە دەگەینە ئەو وتە نامەنتیقیەی لەبەرئەوەی کە دیموکراسیی کۆن لەگەڵ دیموکراسیە تازەکاندا ناگونجێ ناتوانین پێی بڵێین دیموکراسی ڕاستەقینە. لەگەڵ ئەمەیشدا، لە دیموکراسیی کۆندا خەڵکی ڕاستەوخۆ بەشداری لە دەسەڵاتدا دەکرد، کەچی لە چاکترین حاڵەتی دیموکراسی تازەدا، خەڵکی بە شێوازێکی زۆر ناڕاستەوخۆ سەرپەرشتی بەڕێوەبردن دەکەن.

گومان لەوەدانیە کە دیموکراسی کۆن و دیموکراسی تازە دوو سستمی تەواو جیاوازن، تەنانەت بەراوردکردنیشیان بەیەکتری نادروستە. ئەو دوو دیموکراسیە تەنیا لەناودا وەك یەك وان. ئەگینا گۆڕانە مێژوییەکان کە ئەوانی دروست کردوە تەواو جیاوازن.

بەڵام بابزانین جیاوازیی لە چیدایە؟ ئەگەر دیموکراسی یونان وا وێنا بکەین کە دیموکراسیەکی ڕاستەوخۆیە و لە دیموکراسی ئێستادا بڕیار بە ناڕاستەوخۆ دەدرێت و جیاوازیەکە لەمەدایە، ئەوا ئێمە هەڵەین. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە دیموکراسیە لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە جیاوازیی لە بیروباوەڕدایە دەربارەی مرۆڤ و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و وێنای تایبەتیی لەسەر دنیا، واتا ئەو دنیابینیە تایبەتیەی کە هەیە. دیموکراسی یونان و ڕۆم تەماشای "گشت"ی دەکرد و کۆمەڵی بە هەند وەردەگرت، دیموکراسی نوێ پێش هەرشتێك رووی لە "تاك"ە و سوودی تاك لێك دەداتەوە و تاکگەرە. لە کاتێکدا کە دیموکراسی کۆن چەمکی هاووڵاتیەتی لەسەر بنەمای زادگای هاووڵاتی دادەمەزرێنێت و پاشان هاووڵاتیان لە کاروباری دەوڵەتیدا بەشداری پێ دەکات. دیموکراسی مودێرن، هاووڵاتیان بەچاوی تاك تەماشا دەکات و پێش هەرشتێك لە دیدی یەکسانیەوە کە چەمکێکی ڕووت (مجرد)ە

لێیان دەڕوانێت، بناغەی دیموکراسی کۆن لەسەر پێکەوە ژیانی "ئۆرگانیك"ی و وەك یەکی ئەندامەکان دامەزراوە، بەڵام لە دیموکراسی نوێدا کە میراتگری ئاینی مەسیح و فەلسەفەی ڕۆشنگەریی سەدەی هەژدەیە بە تەواویی رووی لە تاکە. بۆیە لە هەڵسەنگاندنی ئەم دوو جۆرە دیموکراسیەدا وشەگەلی "دەوڵەتی شار" و "خەڵك" و "میللەت" و "ئازادی" مانای تەواو جیاواز لە خۆ دەگرن.

لەم زەمینەیەدا، باسکردنی ئەوەی کە دیموکراسی یونان لەبەرئەوە دیموکراسیەکی راستەوخۆ بوە چونکە کۆمەڵێکی دیاریکراوی هاووڵاتیان بەشداریان تیا دەکرد، مەبەستەکە تەواو ناپێکێت ئەمە وانیە کە دیموکراسی ڕاستەوخۆ تەنیا تایبەت بێت بە کۆمەڵێکی دیاریکراوی خەڵکەوە. دیموکراسی یونان بە تایبەتی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە یونانیەکان خەڵکانێکی تاڕادەیەك هاوجۆر و گونجاو بوون و بەو هاوجۆریەش کە بنەمای دیموکراسی ئەوان بوو هوشیار بوون. هۆی هەرە سەرەکی دیموکراسی یونان و دیموکراسی ئایسلەند بە پلەی یەکەم لەوەوە هاتوە کە خەڵکی ئەو ناوچانە، کلتورێکی هاوشێوەو بەیەکتری پەیوەست و یەك دەستیان هەبوەو زۆر ڕووناکبیرانە هەستیان بەوە دەکرد کە هەموو پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. ئەندامانی کۆمەڵێك چەند لە یەکەوە نزیکترن، زیاتر هەست بە یەکدی دەکەن و زیاتر بڕوایان بە یەك سیستەمی بەها و نرخ دەبێت، زیاتر وەك یەك تەماشای دنیا دەکەن و زیاتریش تێگەیشتنیان بۆ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان وەك یەك دەبێت، لەم لایەنەوە بۆیان ئاسانترە بڕیار لەسەر دابین کردنی چاکە گشتیەکان بدەن، بێئەوەی پێویستییان بە ناوبژیوانێکی وەك پارێزەر و نوێنەر و دەزگا و شتی تر هەبێت. بە پێچەوانەی یونانەوە، لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆی ئێمەدا، ناوبژیوان زۆرن، چونکە ئیدی لەم کۆمەڵگایانەدا هەستی پەیوەستی بە کۆمەڵ و هاوکاری نەماوە. ئارەزووی خەڵکانی ئەم کۆمەڵگایانە لە سستم گەلێکەوە هاتوە کە بەهاکانیان دژبەیەکە و ناتوانن لەسەر ئەو بنەمایانەوە بڕیاری هاوبەش بدەن. لەو کاتەوە کە بنجامین کونستانت کتێبێکی لە بارەی ئازادیەوە نووسی، بە ئاشکرا ئەوە دەرئەکەوێت کە چەمکی ئازادی تا چەند لە ژێر کاریگەریی قوتابخانە فیکریەکانی تاکگەرایی یەکسان ویستیدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. گەڕانەوە بۆ دیموکراسی "یونانی" تەنیا ئەو خەسڵەتەی نیە کە خەڵك لە یەکدی "نزیك" بکاتەوە. گەڕانەوە بۆ دیموکراسی یونانی و بەرقەراربوونی لە جیهانی ئەمڕۆدا، گەڕانەوەیە بۆ جۆرێك تێگەیشتن لە خەڵك و کۆمەڵ کە دوو هەزار ساڵ یەکسان ویستی و عەقڵ گەری و ستایش کردنی کەسانی بێ ڕەگ و ڕیشە، ئەو وێنا درەوشاوەیەیان تیرەوتار کردوە.

## پەراوێز

١–جۆرج بوردو دەڵێت: ئەگەر تەنیا لە ڕووی دەرەوەی مەسەلەکە بڕوانین، دەبینین بنەمای سیاسی شورەوی لە بارەی تەشکیلات و ڕێکخراوەییەوە زۆر لە سروشتی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و لە باری سستمی دەوڵەتیشەوە زۆر لە سروشتی ئینگلتەرە دەچێت.

٢–*pepin lebref* پاشای فەرەنسا لە ٧٥١ تا ٧٦٧ ز.

٣–*Hugues capet* پاشای فەرەنسا لە ٩٨٧ تا ٩٩٦ ز.

٤–ئیمپراتۆری پیرۆزی رومان – ئەڵمانی ناوی رەسمی ئیمپراتۆریەکە کە ئوتون (*otton*)ی یەکەم کە بە ئوتونی گەورە ناوی دەرکردوە لە ساڵی ٩٦٢ ز دروست کردوە. ئەم ئیمپراتۆریەتە بە هۆی ئەوەوە کە فرانسوای دوەم چاوی لە تاج و تەخت پۆشی، لە ١٨٠٦ دا نەما.

٥–*Grand Electeur* له ئه‌ڵمانیا به‌و شازادانه‌یان ده‌وت که له هه‌ڵبژاردنی ئیمپراتۆردا مافی ڕادانیان هه‌بوو.

٦–وشه‌ی تینگ به مانای پارله‌مان له واژه‌یه‌کی جه‌رمه‌نی وه‌رگیراوه که مانا کۆنه‌که‌ی "کۆکه‌ره‌وه" بووه، هه‌ر ئه‌و وشه‌یه‌یه که له ئینگلیزیدا بوه "تینگ *Thing*" و به ئه‌ڵمانی "دینگ *ding*"ه، پێده‌چێت له سه‌ره‌تادا به‌مانای ئه‌نجومه‌نێك بووبێت که باسی کاروباری گشتی تیا کرابێت و پاشان باسی هه‌موو شتێك و دواتر له مه‌سه‌له هه‌ره تایبه‌تیه‌کان.

٧–*Marsil de padooue* نووسه‌رێکی ئیتالیه، له نێوان ساڵانی ١٢٧٥ و ١٢٨٠ له شاری پادوا له‌دایك بوه‌و ساڵی ١٣٤٣ له مونیخ مردوه. له ململانێیه‌کی نێوان پاپا (جانی بیست و دووه‌م) و لویسی چواره‌م له ویلایه‌تی پاڤاری ئه‌ڵمانیا ڕوویدا، حه‌کیمی ئیلاهی لایه‌نی ئیمپراتۆری گرت و نامه‌یه‌کی به ناوی به‌رگریکه‌ری ئاشتی بڵاوکرده‌وه. به کافریان دایه قه‌ڵه‌م و ونیان کرد.

٨–*Francois perroux* زانایه‌کی فه‌ره‌نسی پسپۆری زانستی ئابووری.

٩–زوربه‌ی ئه‌وانه‌ی لێکۆڵینه‌وه‌یان له‌سه‌ر دیموکراتیه‌تی یونان و ڕۆم کردوه هه‌مان ڕایان هه‌یه، بۆ نموونه ڤیگتور ئه‌هرنبرگ ده‌ڵێت، دیموکراسی یونان "جۆره حکوومه‌تێکی خانه‌دانه‌کان بوو" به‌ڵام کراوه، واتا ئه‌و حکوومه‌ته که‌مه داخراوانه‌ی که هه‌بوون خانه‌دان نه‌بوون.

١٠–*solon* سیاسه‌تمه‌داری یۆنانی کۆن (٦٤٠–٥٥٨ پ.ز)

١١–*oligarchie* فه‌رمانڕه‌وایی کردنی ژماره‌یه‌کی که‌مه به‌سه‌ر ده‌وڵه‌تدا بێ ئاگاداری زوربه.

١٢–*camille desmoulins* ڕۆژنامه‌نووس و سیاسه‌تمه‌داری شۆڕشی فه‌ره‌نسا (١٧٦٠–١٧٩٤) که له‌گه‌ڵ لایه‌نگرانی دانتوندا تیرباران کرا.

١٣–توسیدید له‌م باره‌یه‌وه ده‌ڵێت: "که‌سایه‌تی و جیهان بینی قووڵ و بێ مه‌به‌ستی پریکلس وای کردبوو که له ئه‌سینادا فه‌رمانڕه‌وایه‌کی بێ مانه‌ندبێت (...) ڕاستیی پریکلس له‌وه‌دا بوو که بۆ گه‌یشتن به ئامانج په‌نای بۆ هه‌ر هۆیه‌ك نه‌ده‌برد، هه‌میشه مه‌زنیی ڕه‌وشتی له‌به‌رچاوده‌گرت و پێویستی به‌وه نه‌بوو مه‌یلی ڕه‌شه خه‌ڵك بجوڵێنێ و ڕوپاماییان بکات (...) به کورتی دیموکراسی به‌شێوه‌یه‌کی ڕووکه‌ش هه‌بوو، له ڕاستیا، پریکلس یه‌که‌مین هاووڵاتی حکوومه‌تی ئه‌سینا بوو.

١٤–ئه‌نجومه‌نی نوێنه‌ران (ئه‌لکزیا) و شورا (بوله) دوو بنه‌مای سه‌ره‌کیی حکوومه‌تی میللی ئه‌سینان، ئه‌نجوومه‌نی نوێنه‌ران بریتی بوو له هه‌موو نوێنه‌رانی گه‌ل، به‌ڵام شورا ته‌نیا پێنج سه‌د ئه‌ندامی هه‌بوو، کاره‌که‌یشی بریتی بوو له ئاماده‌کردنی هه‌واڵه‌کان و سه‌ره‌تای وتووێژه‌کانی ئه‌نجومه‌ن (ئه‌رستۆ، سیاسه‌ت، وه‌رگێرانی د. حمید عنایه‌ت. تاران ١٣٤٩ ل ١٣١).

١٥–*polis* = کۆمه‌ڵگای سیاسی

١٦–له‌م لایه‌نه‌وه وشه‌ی دموس به‌رانبه‌ر وشه‌ی لاوس (*laos*) دانراوه، ئه‌م واژه‌یه به مانای خه‌ڵك به‌کارده‌هات. به‌ڵام مه‌به‌ست له وشه‌که زیاتر "خه‌ڵکانی سوپایی و شه‌ڕکه‌ر"ه‌کان بوه.

١٧–ده‌وڵه‌تی شار له یونانی کۆندا بریتییه له یه‌که‌یه‌کی زه‌مینی و سیاسی که هه‌موو شار و ده‌وروبه‌ری ده‌گرێته‌وه. یونانی ده‌وڵه‌تی شار پولیسه و به لاتینی "سیته"یه.

## سه‌رچاوه

کتێبی: تامل درمبانی دموکراسی – ل ١٩–٣٧،
نوسینی: ئالن دوبنوا، گۆڕینی بۆ فارسی: بزرگ نادرزاد،
تاران: ١٣٧٨.

# مارکس و دیموکراسی

بابەکی ئەحمەدی

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

دیموکراسی واتە حکومەتی خەڵکی یان بەمانایەکی رونتر حکومەتی زۆرینەی خەڵکی. بۆ ئێمە کە لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا و پاش چەند دەیەیەك لە پەرەسەندنی سیستەمی سیاسی دیموکراتی (بە مانا نوێ لیبرالیەکەی) لە پانتای جیهاندا، دەژین (روسیا، وڵاتانی ئەوروپای شەرقی، وڵاتانی ئاسیای شەرقی و ئەمەریکای لاتین ئەم سیستەمەیان قبوڵکردووە)، مانای حکومەتی زۆرینەش خەسڵەتێکی وردتری وەرگرتووە: نەك تەنها دەوڵەتی پشتئەستور بە نوێنەرایەتی و قەتعیەتی رای هەمووان لەپیاوان و ژنان و قەتعیەتی بە رەسمی ناسینی کۆی مافە سیاسیەکانی کەمایەتی و قبوڵکردنی مافە یەکسانەکانی ژنان و پیاوان و مافی تەواوی کەمایەتیە رەگەزی و نەتەوەیی و جنسیەکان و ئەوانی تر، بەڵکو پەیدابوونی «دەوڵەتی لایەنی کەم» واتە بچوکبونەوەی سنوری چالاکی دەوڵەت و چاودێری کۆمەڵگای مەدەنی بەسەریانەوە و پەرەسەندنی دەزگا خودموختارەکانی ئەم کۆمەڵگایە گەشەسەندنی فەزا یان بواری گشتی کە سەربەخۆن لە دەوڵەت پەیدابوونی دەزگاکانی راگەیاندن، هەواڵنێرە سەربەخۆکان لە دەوڵەت و دەزگاکانی پەروەردە و دەزگا کلتوریە سەربەخۆکان، جوڵە بەرەو بڕیاردانی راستەوخۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگا و کارانەی کە نوێنەرایەتی سنوردار دەکەن بە کۆمەڵیٚ خواستی راشکاوی دیاریکراو و رونی تاکەکان، رونبونەوەی و تەنکبونی سەرچاوەکانی داهاتی بەشی دەوڵەتی و بەرپرسیارێتی تەواوی ئەم بەشە و سەربەخۆی تەواوی هێزی دادوەری و ..هەموو ئەمانە بەشێکن لە تەسەوری دەوڵەتی دیموکراتی کە ئیدی بۆ ئێمە ئاشنایە. تەنانەت ئەگەر لە دەوڵەتێکیشدا بژین کە هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەوەی دان بە هەموو ئەم مافانەدا بنێت، بەڵام هەر ئەم تەسەورە بۆ دیموکراسی بۆ مارکس موکین نەبوو. مارکس تەنانەت لەبارەی مەسەلەگەلێکەوە کە بۆ ئێمە چارەسەر کراوە، بۆ نمونە رای گشتی، قبوڵی نەبوو

کە دەکرێت ئەمانە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی و سیستەمی سەرمایەداریدا بەدەست بێت. ئەو بڕوای وابوو کە تەنانەت سادەترین مافی مرۆڤ هەرکاتێك بەشێوەیەکی جدی بخرێتە بەرنامەی کارەوە و خەبات بۆ بەدیهاتنیان دەست پێبکرێ، سنورەکانی کۆمەڵگای هەبوو، وە سیستەمی سەرمایەداری بەجێدەهێڵرێ. هەر لەبەرئەمەش (ئەم هەوڵە) روبەروی بەرگری سەرمایەداران و دەوڵەتەکەیان دەبێتەوە. چ بگات بە مافە دیموکراتیە ئاڵۆزەکانی کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئابوری سەرمایەداراندا لەناکۆکیدان، لە حاڵەتێکی وادا ململانێ بۆ ئەم مافانە، چوارچێوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی لەناو دەبات. مارکس تەنانەت باوەڕهێنان بە کارایی سیستەمی پەرلەمانی، بە «نەخۆشی و حەماقەت» ناودەبا. جێگەی پرسیارە کە تەسەوری خودی مارکس بۆ دیموکراسی چی بوو؟

مارکسیش قبوڵی بوو کە دیموکراسی واتە حکومەتی خەڵکی. ئەوەشی بە رازیبوونی تەواوە قبوڵدەکرد کە مانا وردەکەی بریتیە لە حکومەتی زۆرینەی خەڵکی. بەڵام تەنها تا ئێرە لەگەڵ مانای هەنوکەی دیموکراسیدا (کە لە قوڵایی خۆیدا چەمکێکی نوێ لیبراڵیە، بەڵام چینە کۆمەڵایەتیەکان لەپێناویدا خەباتیان دەکرد، بەتایبەتی چینی کرێکار لە پەیدابوویندا دەوری هەبووە) رێکدەکەوت. لێرە بەدواوە ئەو باسێکی دی دەهێنایە پێشێ. .حکومەتی زۆرینە بە بڕوای ئەو واتە حکومەتی پرۆلیتاریایی پیشەسازی کە لە لوتکەی بزوتنەوەی ستەملێکراوان و زەحمەتکێشانی کۆمەڵگادا راوەستاوە و سەرەتا لەگەڵ ئەواندا کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات. ئەو وەڵامی ئەو پرسیارەی (کە زۆرینە لەبنەڕەتدا چ پێویستیەکی بە حکومەت و حکومەتکردن هەیە؟) بەمشێوەیە دەدایەوە کە لە قۆناغی گواستنەوەدا، زۆرینە دەبێت پاشماوەی کۆمەڵگای چینایەتی لەناوببات و لە دەرئەنجامدا دەستبکات بە سەرکوتکردنی ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی خوازیاری گەڕانەوەی سیستەمی چەوساندنەوەی چینایەتین (ئەمەش بناغەی تیورەکەیەتی لەبارەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریاوە) و لە دەرئەنجامدا دەبێت دەوڵەتی لەدەستدا بێت. بەڵام پاش ئەم قۆناغە چیدی پێویست بە حکومەت بەمانای ناسراوی وشە ناکات. هێزەکانی بەرهەمهێنان ئەوەندە پەرەیان سەندووە کە کەمێتی مادی لەناوبچێت چینە بەرخۆرە کۆنەکانیش سەرکوتکراوون و لێرەوە لەبری حکومەتی سیاسی، هونەری ئیدارەی کاروبارەکان دێتە پێشێ. لەو روەوە کە پرۆلیتاریا لە شۆڕشێکی جیهانی و بەردەوامدا دەسەڵاتی بەدەستهێناوە، لەبەرئەوە مەترسی جەنگی دەرەکی و مەسەلەی بەرگریکردن لە وڵات و نەتەوەش نامێنێ (لەراستیدا خودی ئەمانەش لەناوچوون یان لە حاڵەتی لەناوچوندان). لە کۆمەڵگای ئایندەدا حکومەت بێ مانا دەبێت. بەڵام تا ئەوکاتە، واتە تا گەیشتن بەو بەهەشتە خەیاڵیە قۆناغێکی گواستنەوە دەبێت کە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگا تیایدا چەکدارن و پێویستیەك بە هێزێکی نییزامی وەك پەیکەرێکی جیا و سەربەخۆ لەخەڵك نیە و ئەمەش خۆی جیاوازی هەستپێکراوی دەوڵەتی پرۆلیتاریا و دەوڵەتە لە کۆمەڵگای چینایەتیدا.

هەنوکە گەر واز لە گەمەی خەیاڵ لەبارەی ئەم کۆمەڵگایەی ئایندەوە بهێنین، دیسان ئەم مەسەلەیە دێتە پێشەوە کە لە روانگەی مارکسەوە تەنانەت لەم قۆناغی گواستەوەیەشدا، دیموکراسی وەك سیستەمێکی سیاسی تایبەت لەئارادا نیە، بەڵکو بە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی دەگوترێت. لەم

هەلومەرجەدا ئێمە هێشتا روبەروی سەرکوتی چینایەتی، توندوتیژی و شێوازە بەزۆر سەپێنراوەکانین و ئەمجارە زۆرینەی کۆمەڵگا بەناوی بەرژەوەندیەکانی خۆیەوە کاردەکات، واتە "دیکتاتۆری خۆی دەکات بە شتێکی پراکتیکی". جێی پرسیارە ئایا ئەم زۆرینەیە دەتوانێت تەحەمولی هێزە سیاسیە نەیارەکان بکات؟ ئایا هێزە نەیارەکان کە لە کەمایەتیشدان و دەسەڵاتی سیاسی و زۆرێك شتی دیان لەدەستداوە، دەتوانن حیزب دروستبکەن و چالاکی سیاسی بکەن؟ ئایا لەم کۆمەڵگایەدا کە شۆڕشگێڕان، واتە زۆرینە دەسەڵاتدارن، هیچ کەس مافی ئەوەی هەیە کە ئارەزووی سیستەمی کۆن بکات، یان بەشێوەی سیاسی بیهێنێتە پێشێ؟ پێدەچێت وەڵامی مارکس یەك «نە»ی گەورە و بڕاوە بێت. دیکتاتۆری پرۆلیتاریا، واتە ئەوەی کەسێك نەتوانێت ئارەزووی گەڕانەوە دەرببڕێ چ بگات بەوەی بیەوێت چالاکی سیاسی بۆ بخاتەگەڕ. ئێمە ئەم دەربڕینەمان بەشێوەی جیاواز لە زمانی لینین، ستالین، ماو، ئەنوەر خواجە، کیم ئیل سونگ چاوچیسکۆ و پۆلپۆتیشەوە، بیستووە. خاڵێکی ئاشکرا هەیە: مارکس هیچ تەسەورێکی بۆ دیموکراسی بەمانای ئەمڕۆیی نەبوو، وە هەرکاتێکیش لایەنێکی دەهێنرایە پێشێ، بەتوندی دژی دەوەستا و بە راشکاوی دەیگوت کە دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی، ناکۆکیەکی بەرجەستە و ئاشکرایە.

تەسەور و تێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی کۆمەڵایەتی بوو، نەك سیاسی. کاتێك موڵکایەتی تایبەتی بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێناندا لەناو بچێ، ململانێ نەمێنێ، بەرهەمهێنان لەسەر بناغەی هاوکاری خۆبەخشانەی بەرهەمهێنەرانی پێکەوە گرێدراو ریکبخرێ کار چیدی هێزێکی بێگانە لە مرۆڤ نەبێت، کار بگۆڕێت بۆ لەزەت، بەرهەمە مادیە زیادەکان لە دەرەوەی رێساکانی بازاڕی ئازاد و لەسەر بناغەی بەرنامەرێژی عەقڵانیانە دابەشبکرێ و... (ئەوکاتە) دیموکراسی دێتە پێشێ. گەر واش نەبێت ئەوا لە کۆمەڵگای چینایەتیدا، هەموو باسکردنێکی دیموکراسی «هەڵخەڵەتاندن» و لەباشترین حاڵەتدا خۆهەڵخەڵاتاندنە. هەر باسێکیش کە دیموکراسی کورتبکاتەوە بۆ شێوەیەکی تایبەتی ژیانی سیاسی، ئایدۆلۆژیانەیە. واتە هەڵگێڕانەوەیە، هەڵگێڕانەوەی سەرەکی واقعیەتە. ئایا ئەم تێگەیشتنە ناڕونەی مارکس، تەنها زادەی رۆژگارێك بوو کە تیایدا دەژیا؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ناتوانێ پۆزەتیڤ بێت. ئەگەر ئەو راستیە لەبەرچاوبگرین کە لەهەمان ئەو قۆناغەدا کە مارکس کارە فکری و تیوریەکانی خۆی دەبردە پێشێ، بیریارانێك بوون کە دیموکراسیان لە گەلێك رووی زۆرەوە بەمانای ئەمڕۆیی دەهێنایە پێشێ (تامس جفرسۆن، جیمیز مدیسۆن، جرمی بنتام، جیمز میل، جان ستیوارت میل، تامس پین، ئەلکسی دی تۆکڤیل..و)سەرنجمان بۆ ئەوە دەچێ کە تیوریزەنانی لیبڕاڵی نوێ، ناویان ناوە «کەموکوڕی دیدی سیاسی مارکس». ئایا تێگەیشتنی کەموکوڕی مارکس بۆ دیموکراسی، رەنگدانەوەی خەباتی هێشتا دواکەوتووی سەدەی نوزدەهەم بوو؟ دەکرێ بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە. ئەزمونی چینی کرێکار لە رۆژگاری مارکسدا، تێڕوانینێکی پێشکەوتووی بۆ دیموکراسی پێویست نەکردبوو. بەڵام لەهەمانکاتدا تیۆرەکانی مارکس لەبارەی دیموکراسیەوە جۆرێك ناوردبینی بوو لە ئاستێکی فراواندا بۆ بەزموکاری سیاسی پێشکەوتووی ژیانی کۆمەڵایەتی. ئەوەندە بەس بوو مارکس لەو سنورانەی کە خۆی بۆ خۆی دروستیکرد بوو، واتە

بوو کە لەئارادا بوون. لەراستیدا نەبوونی نمونەیەکی واقعی ناتوانیٚ بەهانەیەکی باش بۆ تیوریزەنیٚك بیٚت کە بەر لەهەر بیریاریٚکی تری سەدەی نۆزدە پیٚشبینی کردبوو. هەر ئەو جەختەی مارکس دەیکردە سەر خەباتی دیموکراتی، دەریدەخات کە چینی کریٚکار سەبارەت بە مەسەلە پراکتیکیەکانی دیموکراسی تاچ ئەندازەیەك هەستیار بوو، وە نەیدەتوانی بەرامبەر بە ستەمیٚك کە بەرامبەری دەکریٚت، بیٚهودە بمیٚنیٚتەوە. گرنگی دەوڵەتی دیموکراتی کە تەنانەت تارادەیەك وەڵامدەرەوەی کۆمەڵگا بیٚت، لەسەر بناغەی ماڤی مرۆڤ یان تەنانەت لەسەر بناغەی ئەو دیدانەی کە زۆریش کاملٚ نین لەبارەی ئازادی مرۆییەوە دامەزرابیٚت، ئەوکاتە دەرك دەکریٚت کە زەحمەتکیٚشان روبەرووی دەوڵەتیٚکی ستەمکاری پشتئەستور بە یاساکانی پیٚش سەرمایەداری، یان روبەرووی دیکتاتۆری سەربازی، دەوڵەتی پۆپۆلیستی یان دەوڵەتی فاشیستی ببنەوە. بەڵام مارکس بە پیٚشکەشکردنی دیدیٚکی توندڕەوی دیموکراسی وەك تەڵەکەبازی و هەڵخەڵەتیٚنەر، جیاوازی نیٚوان دوو بونیادی سیاسی راستەوخۆ جیاواز لەیەکی یەکیٚکیان دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی و ئەوی دیان دەوڵەتی ستەمکاری، لەبەرچاو نەگرت. مارکس تەنانەت باسکردنی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی بە بیٚ سود ناودەنا، بەڵام لەسەردەمیٚکی نەئەوەندە دور لە مارکسدا، ئەم باسە بەشیٚوەیەکی جدی لەنیٚوان چالاکانی ئەنتەرناسیۆنالی دوهەمدا، دەستی پیٚکرد.

## خەباتی دیموکراتی

مارکس سەرەڕای کەموکوڕیە تیوریەکانی سەبارەت بە دیموکراسی بۆرژوازی، تا ئەو شویٚنەی کە مەسەلەی خەباتی رۆژانەی چینی کریٚکار دەهاتە پیٚشیٚ، تیٚگەیشتنیٚکی تەواو دروستی بۆ پیٚویستی بەرگریکردنی بیٚ قەید و شەرتی کریٚکاران لە ماڤی چارەخۆنوسینی زەحمەتکیٚشان و خەباتەکەیاندا هەبوو. بەبڕوای ئەو کریٚکاران ناتوانن بەئازادی خۆیان بگەن، مەگەر ئەو کاتەی لەریزی پیٚشەوەی بەرگریکردن لە ئازادی چین و گروپە ستەملیٚکراوەکانی تردا، رابوەستن. ئەمەش مومکین نیە مەگەر چینی کریٚکار بزوتنەوەی سەربەخۆی چینایەتی خۆی ریٚکبخات. مەبەستی مارکس لەم سەربەخۆییە تەنها جەختکردن لەسەر رەهەندی ئاشکرای پیٚویستی سەربەخۆی لە دروشم و ریٚنماییەکانی بۆرژوازی نەبوو، بەڵکو رەدکردنەوەی چونە ژیٚر کاریگەری چینەکانی دیشی دەگرتەوە. مارکس بڕوای وابوو هەموو زەحمەتکیٚشان دەبیٚ پەیڕەوی بەرنامەی سیاسی و دروشمەکانی چینی کریٚکار بن و لەپشت ریزەکانی بزوتنەوەی کریٚکاریەوە رابوەستن. لیٚرەشدا روانگەی مارکس لەبارەی خەباتی چین دژی چین، خۆی پیشاندەدات. ئەو بەرلەوەی گرنگی بە دیموکراتیزەبوونی دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگا بدات، مەسەلەکەی زۆر بەئاسانی بریتی بوو لە دینامیکیەتی خودی خەباتی دیموکراتی کە بەبڕاوی ئەو دەبوو ببیٚتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی شۆڕشگیٚرانەی کریٚکاری.

مارکس چالاکی خۆی وەك دیموکراتیٚکی شۆڕشگیٚڕ دەست پیٚکردبوو، سەبارەت بە خەباتی دیموکراتی هەستیار بوو، بەڵام تیورەکەی لەبارەی خەباتی چین دژی چین ریٚگەی نەدەدا لە دینامیکیەتی دەرونی هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی کە بە ئاراستەی دیموکراتیزەبوونی دەزگا کۆمەڵایەتیەکانە، ورد بیٚتەوە. لە نوسینە سەرەتاییەکانیدا لەبارەی ئازادی رادەربڕین و

بڵاوکراوەکاندا، ئەڵبەتە هێشتا ئەو دیدە چینایەتیە باڵادەست نەبوو بوو، ئەو بۆ بەرگریکردن لە ئازادی رادەربڕین، ریفۆرمە پێشنیارکراوەکانی رژێمی فردریکی ویلهلامی چوارەمی بە کۆنەپەرستانە هەڵدەسەنگاند و بە تایبەتی رەخنەی لەو لیستی ریفۆرمانە دەگرت کە جەختی لە سانسۆری ئەو بابەتانە دەکرد کە لەگەڵ تەفسیری رەسمی دیندا ناکۆکن و ئەوەی بە بیر دەهێنایەوە کە بەمشێوەیە نوسینەکانی سپینۆزا، کانت و فیختە دەبێ سانسۆر بکرێن چونکە لەسەر بناغەی جۆرێك ئازادی بیر لەبواری گوتاری دینیدا نوسراوون کە لەگەڵ تەفسیری رەسمیدا، ناگونجێن. لە دیدی مارکسی لاودا ئەم نوسینانە جەخت لە سەربەخۆی مرۆیی دەکەن، لەکاتێکدا پشتی بە ملکەچی مرۆڤ بۆ خوداوەند بەستووە (م ـ ١١٩١:١ـ١١٨). ئازادی دین دروشم و خواستی دروستکراوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی نەبوو. پێشڕەوترین رۆشنگەران ئەم مەسەلەیەیان هێنابووە پێشێ و هەموشیان بە ناچار ماتریالیست و دژی دین نەبوون. رۆسۆ لە دوا فەسڵی «پەیمانی کۆمەڵایەتی»دا دینی وەك پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا، لە دینی کۆمەڵایەتی یان دینی قەشەکان، جیا کردبۆوە. ئازادی دین لە شۆڕشی فەرەنسادا درەنگ و بەگران هاتە پێشێ، کاتێك کە تیرۆری یاکۆبینەکان بەسەرچوو، وە سەرکوتکردنی خوێناوی کەنیسە تەواو بوو. شۆڕشی فەرەنسا لەگەڵ خۆیدا چەمکی جیابونەوەی دینی و دەوڵەتی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لە ئەڵمانیادا ئەم خاڵە لە باسەکانی برۆنۆ بائیر لەبارەی یەهودیەکانەوە و بەتایبەتی لە وەڵامی مارکسدا بۆ برۆنۆ بائیر، هاتە پێشەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە مارکس گرنگی بۆ ئازادی دین دادەنا، بەڵام ئەم خاڵە لە مانیفێستدا وەك یەکێك لە بابەتەکانی بەرنامەی بەناوبانگی «دە مادەکە» نەهات. لەم تێکستەدا مارکس و ئەنگڵز هۆکانی نەیارێتی خۆیان بۆ دین رونکردەوە و لە هەمانکاتدا نوسیان ئەو تۆمەتانەی بۆ سۆشیالیستەکان لەبارەی دینەوە دەکرێت بایەخی ئەوەیان نیە وەڵام بدرێنەوە« (م ـ ١ ٣٠٥:٦). بەڵام چەندان ساڵ دوای ئەوە لە «رەخنەی بەرنامەی گۆتا»دا مارکس گەڕایەوە بۆ مەسەلەی ئازادی دین. لەم تێکستەشدا ئەو هەر وەك مارکسی لاوی بێ خوا، هەڵوێستێکی دژ بە دینی هەبوو، بە توندیش رەخنەی لەو خاڵە دەگرت کە لە بەرنامەی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیادا هاتبوو «ئازادی هوشیاری و لە ئەنجامدا ئازادی دین» مارکس نوسیبووی کە بەرنامەیەکی کرێکاری دەبێ بە راشکاوی رایگەیەنێت کە هەوڵدەدات هوشیاری لە دین ئازاد بکات، بەڵام پێدەچێ بەرنامەکە بیەوێت لەم خاڵەشدا هەنگاوێك نەچێتە ئەودیو سنورەکانی جێی قبوڵی بۆرژوازیەوە(ب ١ـ٢٩:٣)».

مارکس لە دیدی تیوریەوە بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە هیچ یەك لە مافە دیموکراتیەکان ناتونن ناکۆك بن لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی چینی کرێکاردا، لێرەوە جەختی لە سەربەخۆیی بزوتنەوەی کرێکاری لە خەباتی دیموکراتیدا دەکرد، ئەوەش لەهەر هەلومەرجێکدا، خەبات لەپێناوی بەدیهاتنی کام لەو مافە دیموکراتیانە دەتوانێت، بەقازانجی کرێکاران تەواو بێت، خاڵێکی زۆر گرنگ بوو بەلای مارکسەوە. ئەو بەرلەوەی لە دادپەروەری کۆمەڵایەتی و خەباتی بەردەوام دژی ستەمدا، بیر لە لایەنگرانی بەزەبری کرێکاران بکاتەوە، لەبیری پێشکەوتنی خودی بزوتنەوەی کرێکاریدا بوو. دەبێ لەم روانگەیەوە تەماشای سەرنجی ئەو بۆ مەسەلەی ژنان بکەین. ئەو هیچ بڕوای بە بزوتنەوەی سەربەخۆیی ژنان دژی ستەم لە کۆمەڵگای

باوکسالاریدا، نەبوو. مەسەلەکەی ئەو ئەوەبوو کە ژنان ڕێگەی رزگاری خۆیان لە بەرنامەی کرێکاریدا بدۆزنەوە و «لەپشت کرێکارانەوە رابوەستن» ژنی خەباتگێر لای مارکس ژنێك بوو کە لە حیزبە کرێکاریەکاندا، سەرەتا بۆ رزگاری چینی کرێکار و پاشان بۆ رزگاری خۆی خەبات دەکات. وەك چۆن کچەکەی ئەلئۆنور جارێك گوتبووی «ئێمە نەك وەك ژن، بەڵکو وەك پرۆلیتار ڕێکدەخرێین ...بۆئێمە هیچ شتێك جگە لە بزوتنەوەی چینی کرێکار، بوونی نیە». ئەبۆت و ڤالاس نوسیویانە «مارکس بایەخی بە هەلومەرجی ژنان لە کۆمەڵگەی باوکسالاریدا نەدەدا. مارکس بیروڕای پەیوەندیدار بە ئەخلاق، دادپەروەری و مافی یەکسانی، بەناوی بیروڕای بۆرژوازیەوە، رەد دەکردەوە. مەسەلەی جێی بایەخی ئەو بریتی بوو لە دۆزینەوەی رونکردنەوەیەك بۆ وەبەرهێنانی چینی کرێکار لە سەرمایەداریدا بەمەبەستی روخاندنی ئەم سیستەمە، نەك ریفۆرمی ئەم هەلومەرجە. ئەو چەمکانەی مارکس بەکاری دەهێنێت، بێلایەن دێنە بەرچاو بەڵام لەراستیدا کوێر جنسن ».

ئایا دەکرێ لێرەشدا هۆی دیدی دواکەوتوانەی مارکس بگەڕێنینەوە بۆ نەبوونی بزوتنەوەی سەربەخۆی ژنان لە زوربەی ساڵەکانی ژیانیدا؟ تەنها لە دواساتەکانی ژیانی مارکسدا بوو کە ئەم بزوتنەوەیە سەرەتاترین ئاماژەکانی پەیدابوونی خۆی دەرخست و مارکسیش بەتەواوی هیچ گوێی پێنەدەدا. بەرلەوەی مارکس کارە فکریەکانی دەست پێبکات، لە هەرەوەزیەکانی ئۆیندا، مەسەلەی ژنان هاتبووە پێشێ چالاکەکانی ئەم هەرەوەرزیانە باسی رزگاری ژنانیان لەکاری ماڵەوە دەکرد. ئەوان چەندان ساڵ دوای ئەوە رەخنەیان لەچارتیستەکان هەبوو کە لە خەباتدا بۆ مافی رای گشتی ، هەروا ژنانیان فەرامۆش کردووە. لە دەیەی ١٨٣٠ ژنانی زۆرێك لە گروپەکانی خوارەوەی چینەکانی ناوەڕاست و کرێکار، بەرەو روی بیروڕاکانی ئۆین رۆیشتن. لە فەرەنساشدا فۆرێیە مەسەلەی رزگاری ژنانی هێنابووە پێشێ. فۆرێیە لەم مەسەلەیەدا ئەوەندە چووە پێشێ کە بە جورئەت دەتوانرێ بگوترێ کە لەهەموو سەدەی نۆزدەهەمدا بزوتنەوەی سۆسیالیستی، شتێکی بۆ وتەکانی ئەو زیاد نەکرد. تەنانەت ئەمڕۆش خوێنەری کتێبی «چوار جوڵە» شوباتی (١٨٠٨) لە تازەیی بابەتەکانی کتێبەکە لەبارەی دەوری کۆمەڵایەتی ژنان، سەری دەسوڕمێ. فۆریە ژنانی رەها لە مەسەلەی کار و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، بەڵکو وەك جنسێك کە ستەمی لێدەکرێ و مافە سەرەتاییەکانیشی لێ زەوتکراوە، دەهێنایە پێشێ. مەسەلەکەی ئەو جیاوازی بوو، نەك چینایەتی. ئەو دەیگوت: «گۆڕانکاریەکان لە قۆناغێکی مێژوویدا بەردەوام بەهۆی بزوتنەوەی ژنان بەرەو ئازادی دەستنیشاندەکرێت و نهێنی لەناوچوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە شکستی بزوتنەوەی ئازادی ژناندا، شاراوەیە...پەرەسەندنی ئیمتیازەکانی ژنان، بنەمای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیە». فۆریە لە کۆتای تەمەنیدا جەختی لە هەلومەرجی ژێردەستی ئابوری ژنان دەکرد و پەیوەندی ئەم ژێردەستەیە ئابوریەی بە ستەمکاری جنسیەوە، دەهێنایە پێشێ.

مارکس لە «مەسەلەی یەهودا» باسی کڕین و فرۆشی لە سەرمایەداریدا دەکرد(م ا ١٧٢:٣). لە «دەستنوسەکانی ١٨٤٤»دا لەئاماژەیەکی کورتدا، رزگاری ژنانی بەستەوە بە پەرەسەندنی مێژووی کۆمەڵگاوە و نوسی کە لە کۆمەڵگای مۆدێرندا «ژن وەك بوونی سەربەخۆ و مرۆیی لەئارادا نیە، بەڵکو وەك غەنیمەت و کەنیزە بۆ پیاو لەئارادایە» (د

ف١٦٧، م ا.٢٩٥:٣). مارکس لە خێزانی پیرۆزدا، لە باسکردنی رۆمانی رازەکانی پاریسی ئێژن سۆدا کە بە ستون لە بڵاوکراوەکاندا بڵاودەکرایەوە پیشانیدەدا کە لە سەرمایەداریدا پەیوەندی پیاو بەژنەوە پەیوەندی سوبژێکتی دانا و ئەندیشمەندە لەگەڵ ئوبژێکتی بەشتبوودا و هەلومەرجی ژیانی ژن «هەلومەرجی هەبوو، بەڵام نامرۆڤانەیە» (ا . ١٩٥:٤). هەلومەرجی ژیانی سۆزانی لەڕاستیدا هەلومەرجی گشتی ژیان و رێزی ژنانە. لە مانیفێستدا تێروانینی بورژوازی بۆ ژن وەك ئوبژێکتێکی جنسی و وەك سۆزانی بوو، لە بەندێکی بەناوبانگدا مارکس لە تۆمەتی بورژوازیەکاندا بۆ کۆمۆنیستەکان کە دەیانەوێت هاوسەرێتی نەمێنێت و ژنان سۆشیالیست بکەن نوسی: «بورژوا وەك ئامێرێکی سادەی بەرهەمهێنان تەماشای ژن دەکات. ئەو گوێی لێدەبێت کە دەبێت ئامێرەکانی بەرهەمهێنان سودی بۆ هەمووان بێت، سروشتیە کە ناتوانێ بەو دەرئەنجامە زیاتر بگات کە ژنانیش چارەنوسێکی وایان دەبێت...بەڵام هاوبەشی ژنان بەگشتی هەمیشە هەبووە، هاوسەرێتی بورژوازی هەمان هاوبەشی ژنانە» (م . ١٠٢١:٥:٦) پاشان مارکس رەخنەیەکی توندی دژی ئەخلاقیاتی بورژوازی کە لەپشت پەردەی عیفەتی ژن و پیرۆزی خێزانەوە، لە پراکتیکدا بۆتە هۆی هاوبەشی ژنان، هێنایە پێشێ. مانیفێست لەبارەی هەلومەرجی ژنانەوە لە کۆمەڵگای ئایندەدا بێدەنگ بوو و تەنها بەو حوکمە وازیهێنا کە «بە لەناوچوونی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی هەنوکە، خۆ بە خۆ ئیشتراکی ژنان کە دەرئەنجامی ئەم پەیوەندیانەیە، لەناودەچێ». بەڵام ئەوەی کە چ شتێك دەبێتە جێگری، ئەوا بەبێدەنگی مایەوە. وتوێژە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی پاش مارکسیش هیچ شتێکیان بۆئەم خاڵە زیاد نەکرد.

بەڵام باسە ئابوریەکانی زەمینەیەکی باشیان لەبارەی پەیوەندی کاری ماڵەوەی ژنان (کاری بێ دەستمایەی ژنان کە دەبێتە هۆی بەهای مەسرەف و بەهای ئاڵوگۆڕ دروست ناکات، و لەئەنجامدا بە کاری بەرهەمهێنان ناژمێرێت) لەگەڵ چەمکی هەمەکی ستەم لێکردنیاندا و لەئەنجامدا خەباتیاندا، دەهێنێتە پێشێ. ئەنگڵز لە نامەیەکدا بۆ گرترۆد گیوم شك (٥ ژوینی ١٨٨٥) نوسی «بەبڕوای من یەکسانی تەواوی ژن و پیاو کاتێك دەبێت بە واقع کە وەبەرهێنانی هەریەکێکیان بەهۆی سەرمایەوە لەناوبچێت و کاری ماڵەوەش ببێت بە کارێکی گشتی»(م . ب ٣٦٤ـ٣٦٣). هەمان چیرۆکی کۆن دوبارە دەبێتەوە. ئازادی لەم کۆمەڵگایەدا بەدەست نایەت ژن و پیاو دەبێت بۆئەم گۆڕانکاریەی کۆمەڵگا بجەنگن و لەوێشد هەردوکیان ئازاد دەبن و لەگەڵ یەکدا مافی یەکسانیان دەبێت. بزوتنەوەی سەربەخۆی ژنان بێ سودە گۆڕانکاری ئەم کۆمەڵگایە، کاری چینی کرێکارە و بەس. ئامارژەکردن بۆ «کاری ماڵەوەی لەناوچوو»ش لە ستایشی کۆمەڵگای ئایندەدا، هاتووە.

زوربەی ئەندامانی ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم و هەموو رابەرەکانی پیاو بوون. ئاراستەکانی لایەنگری پرۆدۆن بەتوندی دژی هێنانە پێشێی مەسەلەی ژن بوون بە «باسێکی لادەرانەیان» ناودەبرد. تەنانەت ناوی ئەنتەرناسیۆنالیسمیش پیاوانە بوو: *Internationail Workingmens Association.* بەڵام پاش کۆمۆنەی پاریس، مەسەلەکە کەمێك گۆڕا. لەبەر دەوری بەرچاوی ژنان لە بەڕێوەبردنی کۆمۆنەدا، لەناو ناوەندە کرێکاریەکاندا، بایەخێکی تازە بە بزوتنەوەی ژنان دروستبوو. لەناو ئەنتەرناسیۆنالیزمیشدا، یەکەم بەشی ژنان لە ئاڤریلی ١٨٧١دا، قبوڵکرا. هەروەها

ڤیکتۆریا ودهاڵ و تێنسی کلافلین بەشی ژنانی سەر بە ئەنتەرناسیۆنالیزمیان، لە نیویۆرك دروستکرد. مارکس لە ئەنجامی راوەرگرتنندا لەبارەی ئەم بەشەوە لەگەڵ ئەم هەنگاوەدا بوو، بەمەرجێك «لە ناکۆکیدا نەبێت لەگەڵ ئەو بەشانەدا کە لە هەردوو رەگەزەکە پێکهاتوون». بەئاشکرا دیارە ژنانێکی سادە کە لە موسیبەتی ژن بوون تێگەیشتبوون، لە بەناوبانگترین پیاوی تیوریزەنی بزوتنەوەی کرێکاری پێشکەوتوتر بوون. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئیدی ژنانێکی زۆر لە حیزبە کرێکاریەکاندا چالاکیان دەکرد. ئێمە ئاشنای هەندێك ناوی چالاکی ژنان و ئۆرگانە رابەریەکانیانین لە ئەنتەرناسیۆنالیزمی دوهەمدا: رۆزا لۆکسمبۆرگ، کلارا زتکین، ئەلەکساندرا کۆلۆنتای،مینا گائۆتسکی و زۆرێکی تر. لەلایەکی دیەوە بزوتنەوەی ژنانیش چالاك بوون و نەدەکرا لەبەرچاو نەگیرێن.

## خەباتی دیموکراتی لە بواری یاسای بۆرژوازیدا

یەکەم تێکست کە مارکس بڵاویکردەوە، نوسینێکی سیاسی بوو لە بەرگریکردن لە ئازادی رادەربڕین و مافی بڵاوکردنەوە. مارکسی لاو رۆژنامەنوسی سیاسی بەکاری سەرەکی و پیشەی خۆی دەزانی. لە نوسینە شۆڕشگێرانەکان و لیبڕاڵیەکانیدا، توندڕەوێکە کە ئازادی رادەربڕین بەمەرجی سەلماندنی ئازادی و ئازادیش بەمەرجی سروشتی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆیی دادەنێ. کەسێك کە بەپێی نەریتی رۆشنگەری رەوایەتی یاساکان تا جێگەیەك دەزانێ کە هەبونێتی ئازادی نەخاتە مەترسیەوە و دەڵێت «یاسا دەبێت لەگەڵ یاسا دەرونی چالاك و زیندووی مرۆڤەکاندا بگونجێت، واتە رەنگدانەوەی واقعیەتی ژیانی مرۆیی بێت» (م . ا ١:١٢١ـ١٢٠).هەوڵدان بە ئاراستەی گۆڕینی یاساکان، لەهەر رێگەیەکی یاساییەوە گەر بکرێت، ئەم دروشمە لە یەکەم نوسینە سیاسیەکانی مارکسدا بوو. لە ساڵەکانی دواییدا مارکس لە سنوری هەڵبژاردن لەنێوان گروپە دەسیسەچی و بێ باوەڕەکان بە خەباتی جەماوەری، ئەو گروپانەی کە بەهەرحاڵ رادیکال و شۆڕشگێڕ بوون و کۆمەڵگای باڵادەست و حکومەتی بۆرژوازیان، بەتەواوی رەد دەکردەوە (وەك لایەنگرانی بلانکی و یەکەم خانەی ئەنارشیستەکان) و حیزبە کرێکاریەکاندا کە تاڕادەیەك ریفۆرمخواز بوون و گۆڕانکاری کۆمەڵگای باڵادەستیان دەبەستەوە بە کاری سیاسی دورودرێژ و خەباتی دیموکراتیەوە (چارتیستەکان لە ئینگلتەرا، لایەنگرانی ریفۆرمەکانی زەوی و زار لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا)دا، راوەستا. بەئاشکرا هەڵبژاردن بۆ ئەو زۆر گران بوو چونکە هەستی بە نزیکایەتی لەگەڵ رادیکالیەتی گروپە دەسیسەچیەکاندا دەکرد، لە هەمانکاتدا لەگەڵ شێوازەکانی ئەواندا کە دابڕاوبوو لە جەماوەر، ناکۆك بوو. لەلایەکی دیەوە شێوازی چارتیستەکانی کە رووی لەجەماوەر بوو پەسەند دەکرد و بەڵام ریفۆرمخوازیانی بەڕاست نەدەزانی. ئەو حیزبەی خودی مارکس تیایدا چالاك و بە یەکێك لە رابەرەکانی دەزانرا، واتە یانەی کۆمۆنیستەکان، زیاد لەوە بچوك و لەئاستی خەباتکردندا (بەتایبەتی لە گەرماوگەرمی شۆڕشی ١٨٤٨دا ناگرنگ بوو کە بتوانرێ بە نمونەیەك بژمێرێت. ئاشکرایە کە مارکس لەو حیزبەدا هەوڵیدەدا لەنێوان رادیکالیزم و کاری پڕوپاگەندەدا بە سەودای بەشداری چالاکی جەماوەر لە خەباتی کۆمەڵایەتیدا، هاوئاهەنگی دورستبکات، لەئەنجامدا لەهەردوو لاوە رەخنە دەکرا و تەنانەت هێرشی توندی دەکرایە سەر. رادیکالە ئەوروپیەکان، بلانکیەکان و خانە سەرەتاییەکانی گروپە

ئەنارشیستیەکان، یانەی کۆمۆنیستەکان و بڵاوکراوەکەیان بە ریفۆرمخواز ناودەنا و بە تانە و تەشەرەوە گاڵتەیان بە وتارە توندڕەوەکانی دەکرد کە لەم حاڵەتانەدا قەڵەم لەدەست ئیرادەی نوسەرانی دەچووە دەرەوە ، و لەلایەن حیزبە کرێکاریە گەورەترەکانی دیشەوە، لە بنەرەتدا یانەیان هێندە بەجدی وەرنەدەگرت، ئەگەرچی مانیفێست لەناو چارتیستەکاندا، تاڕادەیەك بەناوبانگ بووبوو.

ئەم کێشە تیوری و پراکتیکیە لە کاری مارکسدا، لە دەیەکانی پاش شکستی شۆڕشی ١٨٤٨دا مایەوە، بەڵام قورسایی کاری درێژخایەنی سیاسی، بەردەوام سەنگینتر دەبوو. دیارە کێشەی سەرەکی هەر مایەوە چونکە مارکس هەرگیز تێڕوانینی سەرەکی خۆی لەبارەی خەباتی چین دژی چین و رادیکالیزمی شۆڕشگێڕانەی، نەخستە لاوە، بەڵکو بە تێپەڕینی رۆژەکان، باوەڕەکانی ساڵانی لاوی تیایدا، بەهێزتر بوون. کۆمۆنەی پاریس لە ڕوانگەی مارکسەوە زیندووکەرەوەی هەموو ئەو یادەوەری و باوەڕانەی ١٨٤٨بوو.شکستی کۆمۆنەشی بەردەوام بە شکستی ١٨٤٨ بەراورد دەکرد. بەڵام لە هەمانکاتدا دەیبینی کە لەپێشچاویدا واقعیەت و دەرکێکی تازە بۆ سیاسەت و رێکخستنی سیاسی پرۆلیتاریا، لەحاڵەتی دروستبوندایە. تەنانەت دەکرێ رەگوریشەی ئەم گۆڕانکاریە لە تێڕوانینەکانی مارکسدا بۆ پێش کۆمۆنیش بگەڕێنرێتەوە. دەیە دورودرێژەکانی دەسەڵاتدارێتی کۆنەپەرستی لە ئەوروپادا، ئەویشی بزواندبوو. لەخۆی دەپرسی ئایا بێ توانایی پرۆلیتاریا لە راکێشانی هاوپەیمانانیدا لەکاتی شۆڕشدا، ناگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕیەك لە سیاسەتی شۆڕشگێڕانەیدا؟ بەهەرحاڵ ئەو پاش شکستی تراژیدیانەی کۆمۆنە، بەشێوەیەکی جدی بڕوای بە خەباتی سیاسی درێژخایەنی کرێکاران لە ئاستی کۆمەڵگادا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی شێوەیەك لە حکومەتی بۆرژوازی کە ململانێ لەگەڵیدا ئاسانتر بێت، دەوڵەتێکی زۆرتر پابەند بە یاساکانی خۆیەوە کە پێویستی بەهێزکردنی پایەکانی رەوایەتی خۆی، رێگرە لە توندوتیژی و سەرکوتی بەربڵاو، هێنا. دیارە لەم ناوەدا پەیدابوونی نەوەیەکی نوێ لە چالاکانی بزوتنەوەی کرێکاری کە هیچ ئەزمونێکی راستەوخۆیان لە شۆڕشی١٨٤٨ نەبوو، وە شکستی کۆمۆنەش کاریگەرییەکی زۆری کردبونە سەر، بێ کاریگەری نەبوو.

ئاماژەکانی مارکس بۆ خەباتی یاسایی پرۆلیتاریا، بۆ ئەو نەوەیە ئەوەندە رێگەچارە نەبوو. هەر لەبەرئەمە ئاراستەی لایەنگرانی مارکس لە حیزبە کرێکاریەکانی ئەڵمانیا و فەڕانسادا، لە کەمایەتیدا بوون. مارکس لەژێر فشاری روداوەکاندا، ملی بۆ خەباتی دورودرێژی سیاسی دابوو، بەڵام هێشتا دروشمەکانی شۆڕشی لەدڵدا بەزیندووی هێشتبۆوە. ئەو خاوەن تیورەیەکی ورد نەبوو لەبارەی دیموکراسی بۆرژوازیەوە، ئەم کەموکوڕیانەش لەو هەلومەرجەدا کە خەباتی دیموکراتی روو لە پەرەسەندن بوو، شتێکی بەرچاوبوو. بۆ نەوەی تازەی چالاکانی کرێکاری، خەبات بۆ بەدەستهێنانی شێوە دیموکراتیەکانی دەوڵەتی بۆرژوازی گرنگیەکی زۆری پەیدا کردبوو. ئەوان بەشێوەیەکی تایبەت خوازیاری دروستبوونی کۆماری لە ئینگلتەرا، ئەڵمانیا و ئیتاڵیادا بوون. بەرهەمە کۆنەکانی مارکس هیچ وەڵامێکی سودبەخشی بۆ ئەوان پێنەبوو. لە هەژدەهەمی برۆمێردا مارکس نوسیبووی کە بەهۆی شکستی راپەڕینی ژوێنی کرێکارانەوە و هەنگاوە کونەپەرستانەی کۆماری بۆرژوازیەوە، ئاشکرا بوو

کە: «کۆماری بۆرژوازی تەنها بەمانای ستەمکاری رەهای چینێکە بەسەر چینێکی دیەوە و ئاشکرای کرد کە لەو وڵاتانەدا کە خاوەن ژیارێکی کۆنن و پێکهاتەیەکی چینایەتی زۆر پەرەسەندویان هەیە، خاوەن هەلومەرجی مۆدێرنی «بەرهەمهێنانن»، و بەهرەمەندن لە هوشیاریەکی مەعنەوەی کە ئەندێشە کلاسیکیەکانی بەهۆی هەوڵ و تەقەلایەکی چەند سەدەیەوە، لەناو خۆیدا توانۆتەوە، کۆمار بەشێوەیەکی گشتی تەنها قاڵبی گۆڕانکاری سیاسی کۆمەڵگای بۆرژوازیە، نەك قاڵبی پاراستنی هەلومەرجی هەبوو، وەکو بۆنمونە لە ویلایەتە یەککگرتووەکاندا دەیبینین. لەوێ چینەکانی تا هەنوکە دروستبوو لە کۆمەڵگادا، کە هێشتا بەشێوەیەکی تەواو سەقامگیر نەبوون، بەپێچەوانەی کۆمەڵگای کۆنەوە، بەردەوام خەریکی گۆڕانی رەگەزە دروستکەرەکانی خۆیان و خەریکی جێگۆڕکێ پێکردنیانن لەگەڵ رەگەزە تازەکاندا. ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی «مۆدێرن» لەبری ئەوەی دەرگیری مەسەلەی زیادبوونی سەرژمێری راوەستاو بن، زۆرتر جوبرانکەری کەمێتی سەرژمێرن و لەئەنجامدا جوڵەی لاو و پڕ جۆش و خرۆشی بەرهەمهێنانی مادی، کە جیهانێکی تەڕ و تازەی لە بەرامبەر خۆیدا هەیە کە دەبێ بەسەریدا زاڵ بێت، زەمان و هەلی پێویستی نەدۆزیوەتەوە بۆئەوەی جیهانی مەعنەوی کۆن لەناوبەرێت» (ه ب٢٥.٢٦، ب ا ١:٤٠).

بەسەرنجدان لەو دەقەی سەرەوە روون دەبێتەوە کە مارکس لەسەرەتای ١٨٥٢دا کاتێك هەژدەهەمی برۆمێری دەنووسی، (حکومەتی) کۆماری لە ئەوروپادا بە شێوەی گواستنەوەی دەوڵەتی بۆرژوازی دەبینی، و پەیدابوونی بۆ کاتێك دەگەڕانەوە کە چینی سەرمایەدار لاواز بووە و لەبەر توندبوونی خەباتی چینایەتی، هێزی خۆی لەدەستدابێت. کۆماریخوازی کۆن (واتە مارکس) لەو دەقەدا بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە مەسەلەی گرنگتر لە مەسەلەی کۆماری یان سەڵتەنەت هەن. ئەو شێوەی کۆماری بۆ بۆرژوازی لاو و روو لە پەرەسەندنی وەك بۆژوازی ویلایەتە یەککگرتووەکان بە دروست دەزانی و بڕوای وابوو لە ئەوروپای کۆماریشدا، سەرکوتکەرە و یاساگەلێك دەسەلمێنێ کە راستەوخۆ دژی کرێکارن. زیاد لە بیست ساڵ دوای ئەوە ئەنگلز بێ سەرنجدان لەم خاڵە لە دەقەکەی مارکسدا، لە نامیلکەی «باکونینەکان لە پراکتیکدا» (١٨٧٣) لەبارەی ئیسپانیاوە نوسی: «(حکومەتی) کۆماری ئەگەرێك فەراهەم دەکات کە ئەم وڵاتە بتوانێ قۆناغە سەرەتاییەکانی پەرەسەندن خێراتر تێپەڕێنێ، و رێگرێکی زۆر بخاتە پشت سەری خۆیەوە، بەڵام ئەم ئەگەرە تەنها بە بەشداری سیاسی و چالاکی چینی کرێکار، مومکین دەبێت» (ا ا:١٣٠.١٢٩). جارێکی دی ئەو خاڵە قبوڵکرابوو کە لە ئەوروپای کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، وەك ئەوروپای سەرەتای ئەو سەدەیە، دەبێ خەبات بۆ (حکومەتی) کۆماری بکرێت. جیاوازی هەلومەرجی تازە ئەوەبوو ئیدی جەخت لەسەر بەشداری کرێکاران لە خەباتی دیموکراتیدا، نەك هەر تەنها وەك شتێکی مومکین، بەڵکو وەك شتێکی پێویست و چارەنوسساز، دەکرا.

مارکس و ئەنگلز پاش شکستی کۆمۆنە، بە هێزێکی زیاترەوە باسی گرنگی خەباتی یاساییانەی کرێکاران، و پێویستی سود وەرگرتن لەدەزگا رەسمی و یاساییەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازیان، وەك ئەنجومەنە نەتەوەییەکان، لە رەوتی پێشکەوتنی چینی کرێکاردا دەکرد. بەر لەوان پرۆدۆن لە دوا بەرهەمی خۆیدا بەناوی «لەبارەی توانای سیاسی چینی کرێکارەوە» (١٨٦٥) گرنگی خەباتی یاسایی

«وەك تەواوكەری خەباتە سەرتاسەریەكانی چینی كرێكار»ی دابوو بەگوێدا بەڵام ئەم باسەی پرۆدۆن لەبەر بوونی دیسپۆتیزمی بۆناپارتیستی لە فەرەنسادا، هیچ دەرئەنجامێكی ئەوتۆی نەدەبوو. لە دەیەی ١٨٧٠دا لە فەرانسا و ئەڵمانیادا چینی كرێكار هەم لە روانگەی ژمارەوە بەخێرایی گەشەیكرد، هەم خەباتی سیاسی بردە پێشەوە و حیزبە كرێكاریەكان بوون بە هێزی سیاسی جدی لەئاستی نەتەوەییدا و سروشتیە كە باسی خەباتی یاسایی كرێكاران گرنگی پەیدا كرد. ماركسیش لە نامەیەكدا بۆ كۆمیتەی برۆنشویك لەیەكەمی سپتامبری ١٨٧٠دا نوسی بووی كە لە ئەنجامی شەڕی فەرانسا و پرۆسەوە، مێژوو چوّتە قۆناغێكی تازەوە و یەكێك لە خەسڵەتە دیارەكانی ئەم قۆناغە تازەیە گۆڕانی شێوەی خەباتی سیاسی كرێكارانە (ب ن:١٧٨ ـ ١٧٩). بەڵام هێشتا بەڕاشكاوی پرۆدۆن رونی نەكردبۆوە كە ئەم شێوە تازەیە تەنانەت لەمەش زیاتر ئەو (واتە ماركس) بیری لە خەباتی یاسایی و دەسبەسەراگرتنی یاسایی دەسەڵاتی دەوڵەت، دەكردەوە.

ماركس لە ١٨٨٠دا لە «پێشەكیەك بۆ بەرنامەی سیاسی حیزبی كرێكاری فەرەنسا» نوسی: «تایبەتیكردنی گشتی (ئامێرەكانی بەرهەمهێنان) بۆ پرۆلیتاریا دەبێ بە هۆی كۆی ئەو ئامرازانە ئەنجامبدرێ كە لەبەردەستیدایە. لەم ئامرازانە، مافی رای گشتیە كە دەبێ بەو شێوەیەی كە تائێستا هەیبووە و ئامرازی تەڵەكەبازی چینی باڵادەست بووە، بچێتە دەرێ و ببێت بەئامرازی رزگاربوونی چینی كرێكار» (ب ن ٣٧٧ـ ٣٧٦). لێرە بە دواوە ماركس ئەو رێكخراوە سیاسیانەی بە بەهانەی جیاوازەوە بەشداریان لە خەباتی یاساییدا نەدەكرد، رەخنە دەكرد و ئەوانەی بە «پەیڕوانی سیاسەتی راكردن لە شانۆی جەنگ یان غەیبەتخوازی» ناودەهێنا. ئەنگڵزیش لەوتارێكدا «لەبارەی كاری سیاسی چینی كرێكارەوە» لە ٢١ سپتامبری ١٨٧١دا نوسی كە غەیبەتخوازانێك كە سودوەرگرتن لە ئامرازی پەرلەمانی و دەزگا بۆرژوازیە دیموكراتیەكان و خەباتی سیاسی، مەحكومدەكەن: »ئەوە لەبیر دەبەنەوە كە شۆڕش خۆی كردارێكی مەزنی سیاسیە« (ب ا :٢ـ٢٤٦ـ ٢٤٥). ماركس و ئەنگلز پێشنیاریان بۆ رابەرانی سۆسیال دیموكراتی ئەڵمانیا دەكرد كە روداوی خەباتی هەڵبژاردنی ئەنجومەن و لە حاڵەتی سەركەوتنیاندا خودی دەزگای ئەنجومەن، بگۆڕن بە مێزی وتاربێژی خەباتی چینایەتی و پڕوپاگەندەی كرێكاری. ویلهلایم لیكنشت و ئۆگست بیل لە خەباتی هەڵبژاردنی خۆیاندا پڕوپاگەندەی كاریگەریان دژی لكاندنی ئەلزاس و لۆراین بە ئەڵمانیاوە ئەنجامدا كە لەلایەن ماركسەوە دەسەلمێنرا. نمونەیەكی تر چەندان ساڵ دوای مردنی ماركس، بە ئامادەبوونی كارل لیبكنشت لە ئەنجومەنی ئەڵمانیادا و نەیارێتی ئەو لەگەڵ جەنگی١٩١٤دا، لە درەوشاوەترین ساتەوەختەكانی مێژووی سۆشیالیزمە.

ماركس كە سەرەتا گومانی لە خەباتی یاسایی پرۆلیتاریا بوو، بەخێرایی بە جێگەیەك گەیشت كە رایگەیاند لە دیدی تیوریەوە ئەگەری گەیشتن بە سۆشیالیزم بە سودوەرگرتن لە ئامرازی یاسایی و ئاشتیخوازانە، رەد ناكرێتەوە. ئەو لەوتارەكەی خۆیدا لە ئەنتەرناسیۆنالی یەكەم لە سپتامبەری ١٨٧٢دا لە ئەمستردام رایگەیاند كە: «ئێمە دەزانین دەبێت بایەخێكی زۆر بە دەزگاكان، داب و نەریتەكانی وڵاتە جیاوازەكان بدەین. ئەو خاڵەش نكوڵی لێناكەین كە لەوڵاتانی وەك ئەمەریكا، ئەنگلتەرا (ئەگەر ئاشنای دەزگاكانی هوڵەنداش

بومایــە، رەنگــە نــاوی ئەویشــم بخســتایە ســەر) کرێکــاران دەتــوانن بــە ئــامرازی ئاشــتیخوازانە بــە ئامــانجی خۆیــان بگــەن» (ب ن:٣٢٤). شــتێکی وەك ئەمەشی لە نامەیەکدا بۆ هێنری مایر هیندمەن لە ٨ دیسامبەری ١٨٨٠دا لە بارەی ئینگلتەراوە دوبارە کردۆتەوە: «ئەگەر ئێوە بڵێن لەگەڵ رای حیزبەکەی مندا لەبارەی ئینگلتەراوە نین، من تەنها دەتوانم وا وەلام بدەمەوە کە ئەو حیزبە شۆڕشێکی ئینگلیزی بەشتێکی پێویست نازانێت، بەڵکو بەپێی پێشینە مێژووییەکان بەرو داوێکی مومکینی دەزانێت. ئەگەر پەرەسەندنی ناچاری لە ئینگلتەرادا ببێ بە شۆڕش، ئــەم رو داوە تــەنها دەرئــەنجامی هەڵــەی چــینە باڵادەستەکان نیە، بەڵکو هەڵەی چینی کرێکاریش دەبێت» (م ب:٣١٤). مەبەستەکەم ئەو خوێنەرەی تا ئێرە لەگەڵ ئەم کتێبەدا بووە، بەتەواوی سەری سورمابێت. ئایا نوسەری ئەم قسانە هەر هەمان مارکسی شۆڕشگێڕە؟ هەمان قسەکەری پڕ جۆش و خرۆشــی خــەباتی چــینایەتی و پروپاگەندەکــەری ماندوونەناســی سیاســەتە شۆڕشــگێڕانەکانە کــە دەنوســێت «هەڵــەی» روودانــی شــۆڕش دەکەوێتــە ئەستۆی چینی کرێکاری ئینگلتەراش؟ ئایا تیورەی شۆڕشی مارکس گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە؟ چۆن دەکرێ پەرەســەندنی ناچاری سۆشیالیزم نەبێتــە هۆی شۆڕش. هەنوکە دەبێ بپرسین ئایا لە تیورەی شۆڕشــی مارکســـدا، ئەگــەری پەرەســـەندنی ئاشــتیخوازانە بــۆ سۆشــیالیزم وەك ئاورتەیــەك دەردەکەوێت، خاڵی سەرەکیش بەردەوام پێویستی کرداری شۆڕشگێڕانەیە یان نا؟ مارکس مەرجەکەی بــە ســەرنجدان لــە دەزگــا سیاسیەکان داناوە. ئایا پاش چەند دەیەیەك لە سوکایەتی پێکردنی عەقڵ و زیهنی سیاسی، دواجار بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کــە دەزگــا سیاســیەکانی کۆمــەڵگا، دیاریکــەری ستراتیژی شۆڕشگێڕانە دەبن؟ ئەڵبەتە دەبێت ئەوە بڵــێین مــارکس لــە وتارەکــەی ئەمســتردامدا ئــەوەی گوتــووە کــە لــە زۆربــەی وڵاتــە ئەوروپیەکانــدا، بــەکارهێنانی زۆر ناچــاریە، لەنامەکــەی بــۆ مایــەر هیندمەنیشــدا نمونــەی ئینگلتــەرای یەکســەر لــە بەرامبــەر ئــەڵمانیادا دانــاوە کــە «لــەوێ ســتەمکاری نیزامــی، شۆڕشــی کــردووە بەشــتێکی پێویســت» پێدەچــێت لــە روانگــەی مارکســی پــیرەوە بــوونی دەزگایەکی بیرۆکراتی، سوپایی، کەمێتی نەریتەکان و دەزگا مەدەنیەکان، ئادابی دیموکراتی و یاسایی، لــە گــرنگترین هۆکارەکــانن بــۆ رودانــی ناچــارانەی شــۆڕش، بــە پێچــەوانەوە بــوونی دەوڵــەت و دەزگــا دیموکراتیــەکان، دەتــوانێ پێویســـتی شـــۆڕش بسرێتەوە.

رەنگــە پێویســتی شــۆڕش بســرێتەوە، بــەلام پێویستی تێکشکانی دەزگای دەوڵەتی بۆرژوازی، قــابیلی ســڕینەوە نیــە. لــە هــەر رێگەیەکــەوە کــە کرێکــاران بەدەســەلات بگــەن، دەبێــت گۆڕانکــاری بنەڕەتی لە ژیانی ئابوری و بەدوای ئەودا لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیدا، دروستبکەن. مارکس لە نامەیەکــدا بــۆ کۆگلمــان (١٢ ئــاڤریلی١٨٧١) بەراشکاوی جەختی لەم خاڵە کرد (م ب :٢٤٧). لەلایەکی دیەوە گەرچی ئەو بیری لە خەباتی یاسایی دەکردەوە، بەلام ئاگاداری دەکردەوە کە کرێکاران دەبێت ئاگاداربن و نەکەونە داوی چونیەك بینیەوە *(conformism)* ئــەوان دەبێــت بــەدوای سیاســەتی ســەربەخۆی چــینایەتی خۆیانــدا بــڕۆن و نــەبن بــە هاودەنگ یان پەیرەوی بۆرژوازی. لە ١٩٣٩دا ڤاڵتەر بنیامین لە یانزەهەمین تێزی «چەند تێزێك لەبارەی فەلســەفەی مێــژووەوە» نوســی «چــونیەکبینی کــە لەســەرەتای پەیــدابوونی سۆســیال دیموکراســیەوە بەش و پارچەیەك لە بنەماکانی بوو، نەك هەر تێکەڵ

بە تاکتیکە سیاسیەکانی بوو بوو، بەڵکو تێکەڵ بە دیدە ئابوریەکانیشی بوو بوو. ئەم چونیەکبینینە یەکێك لە هۆکانی تێکشکانی دوایشی بوو. هیچ شتێك هێندەی ئەم تێڕوانینە لە شکستی چینی کرێکاری ئەڵمانیادا دەوری نەبوو کە خەریکە لەگەڵ روداوەکاندا دەڕواتە پێشێ. ئەم تێڕوانینە تەماشای پەرەسەندنی تەکنەلۆژیای وەك روداوێکی پێشکەوتوو دەکرد و وایدەزانی کە خۆشی لەگەڵیدا دەجولێت. لێرەوە تەنها هەنگاوێك مابوو تا ئەو تێڕوانینەی کە پێیوایە کاری پیشەسازی کە گوایە پەیوەندی بە گەشەکردنی تەکنەلۆژیاوە هەیە، دروستکەری دەستکەوتێکی سیاسیە. ئەخلاقی کاری کۆنی پرۆتستانتی، لەنێوان کرێکارە ئەڵمانیاکاندا لەشێوەیەکی زەمینیدا، دوبارە دەژیایەوە. بەرنامەی گۆتاش ئەم ئاڵۆزیەی پتر کردبوو و کاری وەك «سەرچاوەی هەموو سامانەکان و کلتورەکان» پێناس کردبوو. مارکس هەستی بە مەترسیەکە کردبوو و نەیارێتی خۆی راگەیاندبوو: «مرۆڤ کە موڵکداری هیچ شتێك نییە جگە لە کاری خۆی» بەشێوەیەکی ناچاری دەبێ بە «کۆیلەی کەسانێکی دی کە خۆیان کردووە بە موڵکدار». بەڵام ئاڵۆزیەکە تازە دروستبوو بوو، وە کەمێك دواتر جۆزف دیتزگن رایگەیاند «رزگارکەری جیهانی مۆدێرن ناوی کارە...ریفۆرمی کار دروستکەری سامانە و ئیتر توانای ئەوەی هەیە بەو ئامانجە بگات کە هیچ رزگارکەرێك پێشتر توانای گەیشتن پێی نەبووە» ئەم چەمکە موبتەزەلە مارکسیە بۆ ماهیەتی کار، ئەو مەسەلەیەی بەبێ چارەسەر دەخستە پشت خۆیەوە کە چۆن بەرهەمی کار دەتوانێ بە قازانجی کرێکارانێك بێت کە هێشتا خاوەنی نین. پێشکەوتنی تەنها لە دەسەلاتگرتن بەسەر سروشتدا دەزانی و چاوی لە دواکەوتن و گەڕانەوە بۆ دواوەی کۆمەڵگا دادەخست. هەر لە سەرەتاوە بوو بوو بە قسەکەری سروشتە تەکنەلۆژیەکان کە دواتر کەوتە ژێردەست فاشیسزم». ناوکی سەرەکی تێڕوانینی مارکس لە «پێشەکیەك بۆ رەخنەی فەلسەفەی هەقی هیگڵ پێشەکی» ئەوە بوو کە کرێکاران لە پەرەسەندنی کۆمەڵگای سەرمایەداری و ئیمتیازە مادی و مەعنەویەکانی مەحرومن، لەگەڵیدا ناگونجێن. ئەوان لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا دەژین، بەڵام مولکی کۆمەڵگای مەدەنی نین. شێوازی ئەوان بۆ سودوەرگرتن لە ئامرازە یاساییەکان نابێت ببێتە هۆی ئەو هەڵە تێگەیشتنەی کە بەبڕوای ئەوانە روداوی پەرەسەندنی کۆمەڵگای بۆرژوازی شەڕە چونکە خەریکە بەدەسەلاتیان دەگەێنێت، تەواو بەپێچەوانەوە، ئەرکی ئەوانە بەردەوام پیشانی بدەن کە رێگەیەك جگە لە وێرانکردنی ئەم کۆمەڵگایە لەئارادا نیە. بەمشێوەیە وێرانی، ئەم ناوەڕۆکەی ئەندێشەی بنیامین، سەرچاوەی سەرەکی خۆی لە نوسینەکانی مارکسدا دەدۆزێتەوە.

چونیەك بینی ترسناکترین دەرئەنجامی یاساگەری و خەباتی یاساییە. کاتێك ئەنگلز لە پێشەکی بۆ «خەباتی چینایەتی لە فەڕانسادا» (١٨٩٥) دەینوسی: «بەڵام هەرچیەك کە لە وڵاتەکانی دیدا روودەدات سۆسیال دیموکراسی لە ئەڵمانیادا هەلومەرجێکی تایبەتی هەیەو پێ بەپێی ئەوەش لایەنیکەم لە ئایندەی نزیکدا، ئەرکێکی تایبەتی هەیە. دوو ملیۆن دەنگ کە رەوانەی سنوقەکانی دەنگدانی دەکات، لەگەڵ ئەو ژنان و پیاوە لاوانەی کە لەپشتیانەوە راوەستاون، بەڵام ماف بەشداریکردن لە هەڵبژاردنیان بەدەستنەهێناوە، بە بەرزترین ژمارە و چڕترین جەماوەر و هێزێکی چارەنوسسازی لەشکری پرۆلیتاریای نێودەوڵەتی دەژمێرێن...ئەگەر هەلومەرجەکان بەمشێوەیە بڕۆنە پێشەوە، تا کۆتایی

ئەم سەدەیە، ئێمە گروپگەلێکی مەزنی ناوەڕاستی کۆمەڵگا، وردە بۆرژوازی و جوتیارانی بچوك بەلای خۆماندا رادەکێشین و دەبین بە هێزێکی چارەنوسساز کە لەبەرامبەرماندا هەموو هێزەکانی دی، ناچارن کڕنوش بەرن»(ب ا ١:٢٠١)، خراپترین شێوەکانی چونیەك بینی لەناو دەقی نوسینەکەیدا، خۆی حەشاردابوو. مەسەلەکە ئەوە نیە کە ئایا ئەنگڵز خەباتی یاسایی بە تاکتیك ناو دەبرد(کە هەر لەم پێشەکیەدا وای ناوناوە) یان مەبەست ستراتیژی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات بووە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە ئەنگڵز جەختی لەسەر نەك جیابونەوەی کرێکاران لە کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو لەسەر چونیەکیان لەگەڵ هێزەکانی دیدا، کردووە. ئەو رەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگای بەو هۆیەی کە بەبڕوای ئەو چینی کرێکار بە دەسەڵات دەگەیێنێت، قبوڵکردووە. تیورەیەك کە کەمێك دواتر برنشتاین پێشکەشی کرد و سەرەڕای ئەو هەموو ناڕازیبونانەی سەرەتا، لە دەرئەنجامدا لەلایەن رابەرانی ئەنتەرناسیۆنالیزمی دووهەمەوە قبوڵکرا، بەناونیشانی «ستراتیژی بڵاوبونەوە» لە ساڵی ١٩١١دا لەلایەن کاوتسکیەوە راگەیەنرا، بەڕاستی کە هیچ ناکۆك نەبوو لەگەڵ رۆحی چونیەك بینی باسەکەی ئەنگڵزدا. لۆچۆ کوڵتی بەدروستی نوسیویێتی: «سۆسیال دیموکراسی ئەڵمانیا لە ئرفۆرت «ڕێگەی پەرلەمانی» هەڵبژارد، نەك لەبەرئەوەی کە وازی لە چەمکی چینایەتی دەوڵەت هێنابوو، بەڵکو لەبەرئەوەی کە بڕوای دیترمنیستی و بڕاوەی بە پێشکەوتنی میکانیکی پەرەسەندنی ئابوری، دڵنیایی دەکرد کە بەدەستهێنانی دەسەڵات لە ڕێگەیەکی خۆبەخۆی سەقامگیر و ناچاری، ڕێگەیەکی ئارام، وەك پرۆسەی پەرەسەندنی سروشت، نزیکە». ئەم باسە بە ئاماژەکردن بۆ دەقێك کە چەند دەیەیەك پێش کوڵتی هەمان خاڵی هێنابووە پێشێ، کۆتایی پێدێنم. ڤاڵتەر بنیامین لە «چەند تێزێك لەبارەی فەلسەفەی مێژووەوە» کە پێشتریش چەند رستەیەکم لێهێنایەوە، نوسیبووی کە تیورەی سۆسیال دیموکراسی و تەنانەت کردارەکانی، بە چەمکێکی پێشکەوتن دروستبوو بوو کە پێشکەوتنی بەناچاری پێناس دەکرد، شتێك کە خۆ بەخۆ لەراستەهێڵێکدا، بەرەو پێشەوە دەڕوات. بنیامین گوتبووی کە ئەم پێشنیارانە راستەوخۆ کێشەئامێزن و قابیلی رەخنەگرتنن، لەهەموو ئەمانەش گرنگتر »رەخنەگرتن لەم تێگەیشتنانە بۆ پەرەسەندن، دەبێ بناغەی هەموو رەخنەیەك لە خودی پەرەسەندن پێکبهێنن.»

## ئامانجی کرداری سیاسی

مارکس لە نامەیەکدا بۆ فردریش بلْت لە ٢٣ نۆڤمبەری١٨٧١ نوسی» ئامانجی کۆتایی (*Endyweck*) بزوتنەوەی سیاسی چینی کرێکار، ئەڵبەتە بریتیە لە دەسبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی لەلایەن ئەم چینەوە. ئەمەش بەشێوەیەکی سروشتی پێویستی بەوەیە کە رێکخستنی سیاسی چینی کرێکار، رێکخستنێك کە لەناو دەرونی خەباتی ئابوریەوە هەڵساوە، دەبێ پێشتر بە ئاستێك لە کامڵبوون گەیشتبێت« (م ب٢٥٤). هەنوکە با ببینین کە «ئامانجی کۆتای» لەو رستانەی پێشەوەدا بە چ مانایەکە. مارکس و ئەنگڵز چەندانجار دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بەهۆی چینی کرێکارەوە و تێکشکانی دەوڵەتی بۆرژوازیان بە پێشمەرجی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵگا و تەنانەت بە «یەکەم هەنگاوی» ناودەهێنا بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیزم. چۆن مارکس توانیبووی شتێك کە خۆی وەك پێشمەرج و یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بە ئامانجی گرنگتر پێناسیکردبوو، لەجێگەیەکی دیدا

بە «ئامانجی کۆتایی» ناودەهێنیٚ؟ لەنێوان تەفسیرکەرانی ئەندێشەکانی مارکس و هەموو پەیڕەوانیشیدا، کەسێك لەگەلٚ ئەو حوکمەدا ناکۆك نیە کە ئامانجی سەرەکی و کۆتایی بزوتنەوەی پرۆلیتاری لەناوبردنی دابەشکردنی کاری کۆمەلاٚیەتی، موٚلکایەتی تایبەتی چینەکان و درزی چینایەتی کۆمەلٚگایە، کە (هەموو ئەمانەش) بەمانای دروستکردنی کۆمەلٚگایەکە پشئەستور بە کاری بەرهەمهێنەرانی پێکەوەگرێدراو. دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚتی سیاسی تەنها بە سەرنجدان لەم ئامانجە، مانای هەیە. بە دەربڕینێکی باشتر دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚتی سیاسی بە ئامانجی کۆتایی بزوتنەوەکە ناناسرێت. کەوابوو مەبەستی مارکس لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە چی بوو؟

ئەنگلٚز لە «مەسەلەی مەسکەن»دا نوسیوێتی «هەر حیزبێکی واقعی چینی کرێکار، لە چارتیستە ئینگلیزەکانەوە بەدواوە، سیاسەتی چینایەتی گرتوٚتە پێش، واتە رێکخستنی پرۆلیتاریا وەك حیزبێکی سەربەخوٚی سیاسی وەك مەرجی پێشەکی خەبات و دیکتاتۆری پرۆلیتاریا، وەك ئامانجێکی خێرای ئەم خەباتە»(ب ا.٢:٣٥٦) پێدەچیٚ ئەم وتەیە (ئێستا بەدەر لەوەی مانای دیکتاتۆری پرۆلیتاریا چییە) دەربڕینێکی باشتری تێڕوانینی مارکس بێت. لێرەدا ئامانجی دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚت لەڕاستیدا، بەئامانجی خێرا ناوبراوە، نەك بەئامانجی کۆتایی پێدەچێت ئەمەش لەچوارچێوەی تیورەکانی مارکسدا دەربڕینێکی ورد بێت. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقی نامەکەی مارکس و لە رستەی «ئامانجی کۆتایی *(Endyweck)* بزوتنەوەی سیاسی چینی کرێکار، ئەلٚبەتە دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚتی سیاسیە بەهۆی ئەم چینەوە» وردبینەوە، رەنگە بتوانین بلٚێین کە مەبەستی مارکس بە سەرنجدان لە وشەی «ئەلٚبەتە» باشتر دەزانرێت: ئامانجی بزوتنەوەی سیاسی پرۆلیتاریا دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚتە و ئامانجی بزوتنەوە کۆمەلاٚیەتیەکەشی، بونیادنانی کۆموٚنیزم. بزوتنەوە سیاسیەکە بە دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚت تەواو دەبێت، بەلاٚم هێشتا دەبیٚ زەمینەی گواستنەوە بوٚ کۆموٚنیزم، فەراهەمبکات. ئەم تەفسیرە بەشێوەیەك دروستە کە بتوانین بزوتنەوەی سیاسیی لە بزوتنەوەی کۆمەلاٚیەتی و ئابوری جیابکەینەوە. لەلایەکی دیەوە ئەگەر بزوتنەوەی سیاسی بە دەستبەسەراگرتنی دەسەلاٚت کۆتایی پێبێت، دیکتاتۆری پرۆلیتاریا چوٚن دروستدەبێت؟ دەولٚەتی گواستنەوەی کرێکاران کام شکلٚی سیاسی وەردەگرێت؟

بگەڕێینەوە بوٚ نوسینەکانی مارکس. ئەو لە وتارێکدا کە لەبارەی یاسا دژی دزینی دار لە ئۆکتۆبری ١٨٤٢دا نوسی بووی، رەخنەی لە دیدێکی حقوقی گرت کە هەر بابەتێکی تایبەتی کۆمەلاٚیەتی، بەهوٚی خودی ئەو بابەتەوە تاوتوێدەکات و ناتوانیٚ بیبەستیٚ بە بابەتی سیاسیەوە. مارکس نوسی «دەبێت هەر مەسەلەیەکی تایبەتی مادی لە ڕێگەی سیاسی واتە لە ڕێگەی پەیوەندیکردنی بە کوٚی عەقلاٚنیەتی دەولٚەت و ئەخلاقی دەولٚەتەوە، حەل و فەسلٚ بکریٚ» (م ا ١:٢٦٢ پەرەسەندنی ئەم تێڕوانینە لە نوسینەکانی دووسالٚ دوای مارکسدا، بەو دەرئەنجامە گەیشت کە بۆ چارسەرکردنی کێشەکانی ژیان کۆمەلاٚیەتی، دەبیٚ بونیادی سیاسی هەبوو، تێك بشکێنریٚ. لە وتارێکدا کە مارکس لەسالٚی ١٨٤٤دا لە وتوێژێکدا دژ بە روٚگە بەناوی «شای پروٚس و ریفوٚرمی کۆمەلاٚیەتی» نوسی، جەختیکرد کە «هەر شۆڕشێك کۆمەلٚگای کوٚن دەسڕێتەوە، تا ئەو ئاستە شۆڕشێکی کۆمەلاٚیەتیە، هەر شۆڕشێکیش هێزە کوٚنەکان دەروخێنیٚ و تا ئەم ئاستەش سیاسیە... شۆڕش بەگشتی روخانی دەسەلاٚتە کوٚنەکان و لەناوبردنی پەیوەندیە کوٚنەکان، کردارێکی سیاسیە. بەلاٚم سوٚشیالیزم ناتوانیٚ بیٚ

شۆڕش بەدی بێت. پێویستی بەم کرداره سیاسیه هەیە، تا ئەو جێگەیەی کە پێویستی بە وێرانی و لەناوبردنە. بەڵام کاتێک چالاکیە ڕێکخراوەکانی دەستپێکرد، کاتێك کە بابەتی سەرەکی، رۆحەکەی، بێتە ئاراوە، سۆشیالیزم بەرگە سیاسیەکەی دادەکەنێ» (م ا ٢٠٦:٣،٢٠٥). ئاشکرایە کە مارکس هەر لەهەمان سەرەتای کارەوە، دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بە پێشمەرجی پەیدابوونی کۆمۆنیزم دەزانی. لە رستەکانی سەرەوەدا خاڵێکی گرنگ هەیە کە هاوکاریمان دەکات بۆئەوەی تەفسیری ئەو رستانە بکەین کە لە نامەکەی مارکسدا بۆ بڵێت هاتووە: بەرگی سیاسی پاش دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات، کاتێك گەوهەری سۆسیالیزم دێتە پێشێ، واتە خەسڵەتی کۆمەڵایەتیەکەی دێتە ئاراوە و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان دێنە ناو بەرنامەی کارەوە، دەخرێتە لاوە. واتە ئامانجی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بۆ بزوتنەوەی سیاسی کرێکاری کۆتاییە، بەڵام پاش دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات چیدی بزوتنەوەی سیاسی بوونی نابێت. ئەوکاتە ئامانجی سەرەکی، یان رۆحی سۆسیالیزم، دێتە ئاراوە. چەندان ساڵ پێشتر لە «مەسەلەی یەهود»دا مارکس رزگاری سیاسی بە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە دانابوو کە «دوا شکڵی رزگاری مرۆڤ لە چوارچێوەی سیستەمی هەبوودا، بەڵام دوا شکڵی رزگاری مرۆڤ نیە» (م ا ١٥٥:٣) بە بڕوای مارکس رزگاری لەبواری سیاسیدا بەدەست نایەت، هەرچەند لەوێدا دەست پێدەکات. بۆ رزگاری مرۆڤ دەبێت سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوری بەشێوەیەکی کامڵ بگۆڕێت و بە وتەی برنشتاین دەبێ سەرتاپای کۆمەڵگا نوێ بێتەوە. ئەم کارە موکین نیە، مەگەر پێشتر دەسەڵاتی سیاسی لەدەست کرێکاراندا بێت. مارکس لە «رێنمایی بۆ نوێنەران (ی ئەنتەرناسیۆنالیزم) لە کۆنگرەی ژنێڤ» لە سپتامبەری ١٨٦٦دا رایگەیانبوو کە بۆ گۆڕانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی بۆ سیستەمێکی فراوانتر و هاوئاهەنگتری کاری ئازاد و پێکەوەگرێدراو گۆڕانکاری گشتی کۆمەڵایەتی پێویستن و ئەم گۆڕانکاریانەش لە هەلومەرجی گشتی کۆمەڵگادا روونادەن، مەگەر ئەوەی هێزە رێکخراوەکانی کۆمەڵگا، واتە هێزی دەوڵەتی لە دەستی سەرمایەداران و موڵکدارە گەورەکان بستێنرێت و بگوێزرێتەوە بۆ خودی بەرهەمهێنەران» (ب ن ٩٤ــ٨٥) پێشتریش مارکس لە «پەیام بۆ ئەنتەرناسیۆنال»دا لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ سەرکەوتنی خەبات بۆ دە سەعات کاری رۆژانەی چینی کرێکاری ئینگلتەرا، باسی سەرکەوتنە مەزنەکانی ئایندەی کردبوو، لە هەمانکاتیشدا جەختی لەوە کردبوو کە دەستکەوتە ئابوریەکان بەس نین. ئەو گوتبووی لەو روەوە کە خاوەنانی زەوی و سەرمایە ئیمتیازەکانی خۆیان بۆ بەرگریکردن لە پاوانکردنە ئابوریەکانی خۆیان و پاراستنی ئەم پاوانکردنانە بەکاردەهێنن »دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی، ئەرکی مەزنی چینی کرێکارە« (ب ن:٨٠).

## سەرچاوە

وەرگێرانی بەشێکە لە فەسڵی حەوتەمی ئەم کتێبەی خوارەوە:

بابك احمدی: مارکس و سیاست مدرن. چاپ سوم ١٣٨١. تهران نشر مرکز.

# جیهانی ئیسلامی و پرۆسەی دیموکراسی

## "فەرید زەکەریا / نوح فیلْدمان"

ڕەزا هیلال

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ئەم وتارە هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەی هەردوو کتێبی (داهاتوی ئازادی – فەرید زەکەریا) و (پاش جیهاد–ی نوح فیلْدمان) کە بەم دواییانە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چاپکراون.

نوسەرانی ئەو دوو کتێبە باس لە کێشەی دیموکراسی دەکەن لە جیهانی ئیسلامی و وڵاتانی تازە پێگەیشتودا.. شایەنی باسە کتێبەکەی "فەرید زەکەریا" بە یەکێك لە پرفرۆشترین کتێبەکانی پارساڵی ئەمریکا دادەنرێت و مایەی مشتومڕ و قسە لەسەرکردنێکی زۆریش بووە لە نێوەندە ڕۆشنبیری و سیاسی و فیکریەکانی ئەو وڵاتەدا.

لێرەدا هەوڵدەدەین کەم تا کورتێك جومگە سەرەکیەکانی ئەو دوو کتێبە بخەینە ڕوو.

**یەکەم/**

**داهاتوی ئازادی: دیموکراسی لەو وڵاتانەی لیبرالی نین.**

ئەم کتێبە لەگەڵ بڵاوبونەوەیدا هەڵلایەکی گەورەی نایەوە. "هینری کیسنجەر"ی وەزیری دەرەوەی پێشوتری ئەمریکا بە کتێبێکی سەیر و ناوازە وەسفی کرد "سامۆئیل هنتگتۆن"یش وەك یەکێك لە گرنگترین ئەو کتێبانەی لە دە ساڵی ڕابردوودا دەرچون ناونوسی کرد.

شایەنی وتنە بیرۆکەی سەرەکی ئەم کتێبە پێشتر وەك وتارێك ساڵی ١٩٩٧ لە گۆڤاری "فۆرین ئەفێرز"دا و لە ژێر سەردێڕی (دیموکراسی نالیبرالی) بڵاوکراوەتەوە.

گریمانەی سەرەکی ئەم کتێبەش بریتییە لە جیاوازیکردن لە نێوان دووجۆر دیموکراسی: دیموکراسی لیبرالی و دیموکراسی نا–لیبرالی.

دیموکراسی لیبرالی هەر بە تەنها هەڵبژاردنی ئازاد و بێ غەلوغەش نییە، بەڵکو لە بنەڕەتدا پشت بە پرانسیپەکانی لیبرالیزمی دەستوری دەبەستێت کە بریتین لە: حوکمی یاسا و جیاکردنەوەی

دەسەڵات و دەستەبەرکردنی ئازادی بیروڕا و..هتد. لە خۆرئاوا دیموکراسی واتە دیموکراسی لیبرالی، چونکە چەمکی دیموکراسی لە خۆرئاوا بەشێوەیەك گرێدراوی چەمکی لیبرالیزمە کە جیاکردنەوەیان ئێجگار ئەستەمە.

هەرچی دیموکراسی نا–لیبرالیشە، دیموکراسیەتێکە بەر لە ئایدیا و بەهای لیبرالیزم ئەولەویەت دەداتە هەڵبژاردن. دیموکراسی نا–لیبرالی بریتییە لە حوکمڕانی خۆسەپێنەر و پۆپۆلیستانە، چونکە لە غیابی لیبرالیزمدا هێزی نا–دیموکراسی بەناوی دیموکراسیەوە دەگەنە دەسەڵات و ئەمەش یەکەمین ناهەقیە دەرهەق بە دیموکراسی. هەروەها لە غیابی لیبرالیزمدا دەکەوینە بەر زوڵم و زۆری زۆرینەی نا–دیموکراسی، لەبەرئەوەی بنەمای دیموکراسی بریتییە لەوەی دەسەڵات بۆ زۆرینەیە و ئەمەش دووەمین ناهەقیە کە دەرهەق بە دیموکراسی دەکرێت.

لەم حاڵەتەشدا دەشێت دیموکراسی ببێتە دەسوێژێك بۆ توندڕەوی و فاشیزم و تەنانەت خۆکوژیش.

پیاوێکی وەك "ئەدۆڵف هتلەر" لە ڕێی هەڵبژاردنی دیموکراسیەوە گەیشتە دەسەڵات.. "هتلەر" لە وتارەکانیدا چەند پەڕگیرتر بوایە، جەماوەر زیاتر لە دەوری خڕدەبوونەوە. دیموکراسی لە ئەڵەمانیادا بە سەرکەوتنی نازیزم کۆتایی هات، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە لیبراڵییزم لە کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا سەوز نەبووبوو. پاش ئەوەی ئەڵمانیا لە جەنگدا شکستی خواردو دابەشکراو لە دەرەوەڕا سستمێکی نوێیان بەسەریدا سەپاند، دەست بە ڕیشە کێشکردنی فاشیزم کراو لە جێی ئەویش ڕەواج بە لیبرالیزم درا، تا ئەڵەمانیا بوو بە دەوڵەتێکی دیموکراسی – لیبرالی، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەڵەمانەکان و هەروەها ئەوروپیەکانیش باجێکی زۆر و زەوەندیان دا.

لە ئەزمونی وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەڵاتیشەوە، "فەرید زەکەریا" دەگاتە ئەوەی بڵێت: (گۆڕان بەرەو دیموکراسی ئەو ساتە تەواو دەبێت کە ژینگەی کۆمەڵایەتی ببێتە ژینگەیەکی لیبرالی). بۆ ئەمەش "فەرید زەکەریا" نمونە بە سەرکەوتویی پرۆسەی دیموکراسی لە وڵاتانی هیندستاندا دێنێتەوە. ئەم وڵاتە ئەگەرچی وڵاتێکی خۆرئاوایش نییە، بەڵام لەبەرئەوەی (پارتی کۆنگرە) هەر لە سەرەتای دەسپێکی ئەزمونی دیموکراسی لە هندستاندا، حیزبێکی لیبرالی بووە و پابەندبووە بە بونیادنانی کلتورێکی ڕاستەقینەی حوکمڕانی دەستوری، توانیویەتی ئەزمونێکی دیموکراسی سەرکەوتوو نیشانی جیهان بدات. سەبارەت بە جیهانی ئیسلامی "فەرید زەکەریا" باس لە حەقیقەتێك دەکات و دەڵێت: (سەرەڕای ئەوەی فەرمانڕەوایانی عەرەب کەسانێکی ستەمکار و گەندەڵن، بەڵام زۆر لە ئیسلامگەرا و ناسیۆنالستەکان لیبرالیترن.. ئیسلامی و ناسیۆنالستەکان باس لە هەڵبژاردنی دیموکراسی دەکەن، بەڵام بە چاوێکی سوك دەڕواننە لیبرالیزم و بەشێوازێکی حوکمڕانی خۆرئاوایی دەدەنە قەڵەم).

هەر لە درێژەی قسەکانیدا سەبارەت بەم مەسەلەیە "زەکەریا" دەنوسێت و دەڵێت: (ئەوانەی داوای دیموکراتیزەکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکەن، شوێن وەهم و سەراب کەوتون. ئەو ناوچەیە سیخناخە بە تیۆریای پلانگێڕی. تۆ بڕوانە کەناڵی تەلەفزیۆنی جەزیرە چ سیمایەکی مۆدێرنی هەیە، بەڵام پەخشی بەرنامەکانی لێوان لێوە لە پەیامی ناسیۆنالستی و توندوتیژی ئایینی و دژایەتی کردنی ئەمریکا و سامیەت).

نوسەر لەم کتێبەیدا دەستنیشانی قەیرانی جیهانی عەرەبی دەکات کە لە نێوان سستمێکی خۆسەپێنەر بەڵام کراوە و کۆمەڵگاگەلێکی نالیبرالیدا دەگوزەرێنێ، ئەم قەیرانەش بۆتە مایەی دروستبونی دیاردەی تیرۆر.

"فەرید زەکەریا" بە حوکمی ئەوەی ئەمریکیەکی موسڵمانی بە ڕەچەڵەك هندیە، بە ئینسافەوە بێگوناهی ئیسلام لە خولقاندنی ئەو قەیرانەدا ڕادەگەیەنێت و سەرچاوەی کێشەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ فیقهی ئیسلامی کە لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمدا پەرەیسەند و شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە کە پەیوەندی بە دیموکراسی ئەمڕۆوە هەبێت..

سەبارەت بە ئاوێتەکردنی دەسەڵاتی ئایینیش بە دەسەڵاتی دنیای، ئەوا پاپاکان بۆ ماوەی چەند سەدەیەك ئەو دوو دەسەڵاتەیان پێکەوە گرێدابوو، بەشێوەیەك کە مرۆڤی موسڵمان مەزەندەی نەدەکرد. کەواتە کێشەکە لە ئایینی ئیسلامدا نییە، بەڵکو لە ئەقڵی عەرەبیدایە.. ئەوەتا وەکو "فەرید زەکەریا" دەڵێت: (زۆربەی زۆری نوسەرانی عەرەب سەرقاڵی داکۆکی کردنن لە کەرامەتی نەتەوەیی زیاد لەوەی هەوڵی ئەوە بدەن لە قەیرانی جیهانی عەرەبی تێبگەن.. پاش جەنگی جیهانی یەکەم بیروبۆچونی لیبرالی لە بواری سیاسی و کۆمەڵگەی عەرەبیدا بڵاوبووەوە، بەڵام زۆری نەبرد لەگەڵ پادشا و چینە ئۆرستۆکراتەکاندا بیریارە لیبرالیەکانیش پاکتاوکران و ئەوەشی جێگای گرتنەوە، ئایدیۆلۆژیاگەلی کۆماری سەربازی و سوسیالیزمی دەوڵەتی و عەرەبچێتی بوو، بەمجۆرە جیهانی عەرەبی بووە لابوری ئایدیۆلۆژیا نابووتەکان و بەشێوەیەکی زۆر نابوتانەتریش کەوتنە پراکتیزەکردنی، سەرەنجامیش شکست هێنان بوو لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا. نارەزایەتی دەربڕینیش لە هەلومەرجێکی وا لەرێی دروشمە نەتەوەیی و ئایینی و تیرۆریستیەکانەوە بوو.

ئەم قەیرانە بەرادەیەك قوڵ دەبێتەوە کە جێی مەترسیە، مەترسیەکەش لەوەدایە گروپە نالیبرالییەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی ئەوانەن کە کۆمەڵگەی مەدەنی پێکدێنن، نمونەکانیان وەکو دەستەی ئەو ڕۆشنبیرانەی بانگەشە بۆ ئەلتەرناتیڤی ئیسلامی دەکەن و مژدە بە هاتنی حوکمڕانی ئایینی دەدەن و داوادەکەن جیهاد لە دژی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکرێت یاخود ئەوانەی لە بەجیهانیبون و کلتوری خۆرئاوا تۆقیون و باس لە شوناس و تایبەتمەندی دەکەن).

دەرەنجامێك "فەرید زەکەریا" لەم کتێبەیدا بەدەستی دێنێت، ئەوەیە کە گەربێتو لە مرۆدا هەڵبژاردنێکی ئازاد لە جیهانی عەرەبیدا ئەنجام بدرێت، ئەوا سستم گەلێکی وا دێنێتە سەر کورسی حوکمڕانی کە زۆر لە سستمی دەسەڵاتدارێتی ئێستا داخراوتر و کۆنەخوازتر دەبن و زیاتر دژایەتی خۆرئاوا دەکەن. لەم سەروبەندەدا نوسەر موجیاری ئەمریکاییەکان دەکات بەوەی نابێت وڵاتەکەیان لەژێر فشاری هەڵکشانی هێزی ئیسلامیەکاندا و بە ئومێدی خۆچاککردنی ئیسلامیەکان رۆژ لە دوای رۆژ، زۆر بۆ وڵاتانی وەکو سعودیە و میسر بهێنێت تا هەڵبژاردنی ئازاد ئەنجام بدەن، چونکە دەرەنجامی کارێکی وا خراپ دەکەوێتەوە. ئەو پێی وایە خۆرئاوا دەبێت لەوە تێبگات کە دیموکراتیزەکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کارێکی بێمانایە، گەر پێش ئەوە هەوڵ بۆ هێنانە ئارای لیبرالیەتێکی دەستوری نەدرێت. واتە پێویستە بەر لە هەر پرۆسەیەکی هەڵبژاردن قۆناغێکی گواستنەوە هەبێت بۆ ریفۆرمی سیاسی و گەشەپێدانی

دامودەزگاکان، چونکە دیموکراسی هەر بە تەنها هەڵبژاردنی ئازاد نییە.

هەر لە درێژەی قسەکانیدا "فەرید زەکەریا" دەڵێت: (گەر بمانەوێت شوێنێك دەستنیشان بکەین تا فشاری بۆ بهێنین لە پێناو ئەنجامدانی ڕیفۆرم و گۆڕانکاریدا، ئەوا دەبێت ئەو جێگایە وڵاتی میسر بێت.. ڕاستە لە ئوردن پادشایەکی پێشکەوتوخوازی لێیەو لە ڕوی بەرهەمی نەوتیشەوە سعودیە گرنگترین وڵاتە، بەڵام میسر ڕۆحی کلتوری جیهانی عەرەبیە و گەر لە باریدا بێت لە ڕووی سیاسی و ئابوریەوە بەرەو پێش بچێت، دەشێت بەشێوەیەکی بەهێزتر نیشانی بدات کە ئیسلام دەتوانێت خۆی لەگەڵ دیموکراسی و مۆدێرنەدا بگونجێنێت و عەرەبیش دەتوانن لە جیهانی ئەمڕۆدا سەرکەوتووبن. واتە سەرکەوتنی میسر وەکو سەرکەوتویی یابان دەبێتە مۆدێلێکی بەهێز و وڵاتانی دیکەی ناوچەکە چاوی لێدەکەن).

## دووەم/

### پاش جیهاد: دیموکراسی ئیسلامی

ئەگەر "فەرید زەکەریا" لە کتێبەکەی خۆیدا باسی لە مەترسی ئیسلامیەکان کردبێت، گەرهاتوو لە ڕێی پرۆسەی دیموکراسیەوە جڵەوی حوکمڕانیان لە وڵاتانی عەرەبیدا گرتەدەست، ئەوا "نوح فیلْدمان" لە کتێبی (پاش جیهاد: ئەمریکا و ململانێکردن لە پێناو دیموکراسی ئیسلامیدا) ئەگەری مەترسیەکی وەها ڕەتدەکاتەوە.

"نوح فیلْدمان" مامۆستای یاریدەدەری یاسایە لە زانکۆی نیویۆرك و ئیدارەکەی "جۆرج ۆکەر بۆش" بەرپرسیارێتی ئامادەکردنی دەستوری نوێی عێراقیان پێ سپاردووە. "فیلْدمان" خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە فیکری ئیسلامی لە زانکۆی ئۆکسفورد و لە تەمەنی پانزەساڵیەوە بە خوێندنی زمانی عەرەبیەوە خەریکە. دەستنیشانکردنی "فیلْدمان" بۆ ئامادەکردنی دەستوری عێراق هەڵلایەکی گەورەی نایەوە، بەو پێیەی ئەو کەسێکی یەهودیە و کەچی دەستور بۆ عەرەب و موسڵمانان دادەنێت. لەم بارەیەوە "ئێدوارد سەعید" دەڵێت: (ئەم کارە سوکایەتی پێکردنێکی ڕون و ئاشکرایە نەك تەنها بە عێراق، بەڵکو بە هەزاران یاساناسی عەرەب و موسڵمان).

"فیلْدمان" بە بڵاوکردنەوەی کتێبی (پاش جیهاد)یش هەڵلایەکی دیکەی نایەوە، چونکە جومگەی سەرەکی ئەو کتێبەی تەئکید دەکاتەوە لەوەی ئیسلام لەگەڵ دیموکراسیدا دەگونجێت، بە مانای ئەوەی ئیسلام و دیموکراسی پێك ناکۆك نین.

لەو گریمانەیەشیدا "فیلْدمان" دەگاتە ئەوەی بڵێت: (هەرگیز ئیسلامیەکان هەڕەشە و مەترسی نین لەسەر پرۆسەی دیموکراسی، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەوان چاکترین ئومێدێکن بۆ دەستەبەرکردنی دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. حیزبە ئیسلامیەکان گەر دەرفەتی ئەوەیان بۆ بڕەخسێت لە ڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە دەسەڵات بگرنە دەست، ئەوا ئەو دەوڵەتە زۆر لەو سستمی حوکمڕانیانەی ئەمڕۆ دیموکراسیتر دەبێت!!).

"فیلْدمان" ئەم گریمانەیەشی لەسەر ئەو تێزەیە بونیاد دەنێت کەوا جیهاد پاش دواهەمین شەڕی خۆی (کە هێرشە تیرۆرستیەکانی یانزەی سێپتەمبەری سەر ئەمریکا بوو) کۆتایی هات، چونکە ئەو کارە تیرۆرستیە دوا هەناسەی توندوتیژی ئیسلامی بوو. دوای ئەوە دەستبەرداری توندوتیژی دەبن بۆ خاتری جیهادێکی مەزنتر، ئەویش هەوڵدانە بۆ دیموکراسی.

"فیلْدمان" داوا له ولآته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات پشتیوانی ئیسلامیەکان بکات، بۆ ئەوەی له ڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە بگەنە کورسی حوکمڕانی. لەم بارەیەوە دەڵێت: (هەڵەیه پێمان وابێت ئیسلامیەکان به حەتمی دژایەتی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا دەکەن و لەگەڵیدا ناکۆکن. پێویسته ولآته یەکگرتووەکانی ئەمریکا هانی ئیسلامیه میانڕەوەکان بدات و ڕێگای حیزبه ئیسلامیەکانیش بدات تا هەڵبژاردنی ئازاد بکەن، به کورتیەکەی پێویسته دەرفەت به دیموکراسی ئیسلامی بدرێت.. ڕاستیەك که پێویسته بوترێت ئەوەیه ئیسلامیه دیموکراسیەکان باشترین ئومێدێکن بۆ ئایندەی جیهانی ئیسلامی و ئەوانەش شایەنی کۆمەك و یارمەتی ئێمەن).

ئەگەر دەسەڵات گرتنه دەستی ئیسلامیەکان له ڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا نەخاته مەترسیەوە وەکو "فیلْدمان" پێی وایه، کەواته –ئەمەشیان هەر بۆچونی فیلْدمانه– ئاشتی نێوان عەرەب و ئیسرائیلیەکانیش هەڕەشه و مەترسی ئیسلامیەکانی لەسەرنابێت، بەڵکو ئاشتیەکی میللی دەبێت و تەنانەت ئاسایکردنەوەی پەیوەندیەکان لەگەڵ ئیسرائیل و سەلماندنی شەرعیەتی ئەو قەوارەیه ئاسانتر دەکات.

بـەڵام "فیلْـدمان" دەرەنجـامی ئـەوەی هاتنـه سـەرکاری ئیسـلامیەکان بەرژەوەنـدی ئـەمریکا لـه ناوچـەکەدا ناخاتـه مەترسـیەوەو هەڕەشـەش لـه ئاشـتی نێـوان عـەرەب و ئیسـرائیل ناکـات، لـه کوێـوه هەڵـدەهێنجێت؟ ئەڵبەتـه ئـەم بۆچـونەی لەسـەر ئـەو گریمانەیـه بونیادنـاوه کـه دەڵێـت: (سسـتمه سـتەمکار و دیکتاتۆریـەکانی ناوچـەکه – بەتایبـەت ئەوانـەی لەلایـەن ئـەمریکاوه کۆمـەك دەکـرێن–بەرپرسـن لـەوەی کـه گـەلانی ئیسـلامی دژایـەتی هەریـەك لـه ئـەمریکا و ئیسرائیل بکات).

"فیلْـدمان" داوا لـه ولآتـه یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا دەکـات کـه بـه جۆرەهـا شـێواز زۆر بـۆ حوکمڕانـەکانی ولآتـانی ئیسـلامی بهێنێـت، لەوانـه ڕاگرتنـی ئـەو کۆمەکـه داراییانـەی پەیوەسـتن بـه ڕیفـۆرمی دیموکراسـیەوە، گـەر ئـەم شـێوازەش سـەرکەوتوو نـەبوو دەکرێـت ڕێگاچـارەی سـەربازی بگیرێتەبـەر و جـەنگ بـەرپا بکرێـت، چونکه شـەڕیش وەکـو "کلـۆز فـوتز" پێـی وایـه سیاسـەتکردنه، بـەڵام بەشێوازێکی دیکه.

شـایەنی باسـه "فیلْـدمان" لـه دیموکراسـی ئیسلامیدا، گروپه توندڕەوە ئیسـلامیەکان و مۆدێلی ئێران و تالْیبانی ئەفغانستان هەڵـدەبوێرێت.. لێـرەدا "فیلْـدمان" لـه موحافیزەکـاره نوێیـەکانی ئـەمریکا جیادەبێتـەوە، بـەوەی ئـەو پێـی وایـه ئیسـلام و دیموکراسـی پێـك نـاکۆك نـین، بـەڵام موحافیزکـاره نوێیەکان تەئکید لەوەدەکەنەوه که کلتوری ئیسلامی دژی دیموکراسیه. هەروەها لەو خاڵەشدا لێیـان جیا دەبێتەوه کـه جیـاوازی دەکـات لـه نێـوان تیرۆرسـت و ئیسـلامیه تونـدڕەوەکان لەگـەڵ میانڕەوەکانیانـدا. بـەڵام خـاڵی هاوبەشـی نێـوان "فیلْـدمان" و موحافیزکـاره نوێیـەکان لەوەدایـه کـه هـەردووکیان هـاوڕان لەسـەر ئـەوەی پێویسـته دیموکراسـی بسـەپێنن، تەنانـەت ئەگـەر دیموکراسـی ئیسـلامیش بێت و بەزەبری هێزی سەربازیش بێت.

بـەڵام خـاڵی لاوازی ئـەم کتێبـەی "فیلْـدمان" لەوەدایـه کـه پرۆسـەی دیموکراسـی کـورت دەکاتـەوه بۆ هەڵبـژاردنی ئـازاد، هـەروەها بێئاگاشـه لـەوەی کـه هیچ گرانتیـەك نییـه بـۆ ئـەوەی، کاتێك ئیسلامیەکان گەیشـتنه حـوکم کۆتـایی بـه پرۆسـەکه نـەهێنن و دیموکراسی زیندەبەچاڵ نەکەن.. یان کێ گرانتیمان

دەداتێ کاتێك ئەوانە بونە حوکمڕان، پیاو و ژن وەکو یەك سەیر بکەن؟ یان گرانتی چیە کە ئەوانە وەکو یەك سەیری موسڵمان و غەیرە موسڵمان دەکەن؟ یاخود کێ کەفیلی ئەوە دەکات کە ئەوانە ئازادی بیروڕا و مافی جیاوازی دەپارێزن و خەڵکانی پێ تەکفیر ناکەن؟ بێگومان تا هەنوکە بۆ هیچ یەك لەمانە گرانتی نییە.. تەنانەت هەندێك لەو ئیسلامیە میانڕەوانەی نوسەر لە کتێبەکەیدا ناوی هێناون، فتوای تەکفیرکردن و کوشتنی ئەو کەسانەیان داوە کە نەیارن بەوان و وەکو ئەوان بیرناکەنەوە، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ئەوانەی موسڵمان نین (ذمي)ن و پێویستە لەسەریان جزیە بدەن، هاوکات پێیان وایە هەموو بیانیەکی غەیرە موسڵمانیش کافرە.

هیچ گرانتیەك نیە تا موسڵمانانی لای ئێمە ببنە دیموکراسی یان کەسانی ئیسلامی دیموکراسی وەکو "ڕەجەب تەیب ئەردۆغان و عەبدوڵلا گوڵ" مان هەبێت لە تورکیا.

دواجار بەڵێ بۆ ئیسلامێك کە لەگەڵ دیموکراسیدا بگونجێت، بەڵام دیموکراسی ئیسلامی کاتێك بەرجەستە دەبێت کە ئێمە موسڵمانی دیموکراسی بین. جیهادی مەزنیش ئەمەیە..

بەڵام کاتێك دیموکراسی ببێتە ئەسپەکەی تەڕوادە و لێیەوە هێزی نادیموکراسی ئیسلامی و ناسیۆنالستی فاشیمان بۆ بێتەدەر، ئەوا ئەمە جگە لە کاری خۆکوژی شتێکی تر نییە.

دیموکراسی ڕاستەقینە دیموکراسی لیبرالییە، دیموکراسی لیبرالیش تەنها هەڵبژاردنی ئازاد و بێگەرد نییە کە هێزە نادیموکراسیەکان بگەیەنێتە کورسی حوکمڕانی!!

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الاهرام)، بەرواری ٢٠٠٣/٨/١٠.

## چەند برگەیەک لە:

# وتارە جەنازەییەکەی بێرکلیز لە پرسەی کوژراوەکانی ئەسینادا

ئەم وتارە لەساڵی یەکەمی جەنگی پیلۆپینیشیاندا لە ٤٣١-٤٣٠ پێش زاییندا خوێندراوەتەوە

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

"سیۆسیدیدێس نوسیوێتی لە ماوەی سەرکردایەتی پێریکلیزدا[١]، ئەسینا جمەی دەهات لە دانیشتوان و هەمووشیان هەستیان بە شانازیی و سەربڵندیی دەکرد، سەریان بە دەوڵەت شارەکەیان بەرز بوو، چونکە حکومەتەکەیان بە دادپەروەر ناسرابوو، شەقامەکان بە بیناو خانووبەرەی قەشەنگ و دڵگیری گشتی رازێنرابوونەوە، هونەرو دەستڕەنگینییەکی وەهایان تێدا بەکارهێنرابوون، کە ئەوانەی تا ئەمڕۆ ماونەتەوە، بەهای خۆیانیان پاراستووە. ساتێکی شادومان بوو لە مێژووی دێریندا، کاتێك پیاوە ئازادو سەرفرازەکان دەربارەی رەوشی مرۆڤ دەدوان، کە بەڕای من لەو کاتەوە تا ئێستا لەوە باشتر نەوتراوە.

لەوانەیە هیچ شارێك یان هیچ کەلتورێکی تر ماوەیەکی ئاوا بە پیت و پڕ لە بلیمەتی و پرشنگداریی لە چەندان رووی ئاوا جیاجیاوە بە خۆوە نەبینیبێت. ئەسینا لە فەلسەفەدا سۆکرات و ئاناکساگۆراس و ئەفلاتونی بەرهەم هێناوە، لە مێژوودا هیرۆدۆتۆس و سیۆسیدیدێس، لە ئەدەبدا، ئەسخیلیۆس و سۆفۆکلێس و یۆرپیدێسی بەرهەم هێناوە.

شێوازی حکومەتەکەی ئێمە پێی دەوترێت دیموکراسی، چونکە یاساکانمان لاساییکردنەوەی یاسای دراوسێکانمان نین[٢]. بە پێچەوانەوە، ئێمە مۆدێلێکین بۆ خەڵکی تر. شێوازی حکومەتەکەی ئێمە پێی دەوترێت دیموکراسی، چونکە

بەڕێوەبردنی لە دەستی کەمینەیەکدا نیە، بەڵکو لە دەستی تەواوی گەلدایە. لە چارەسەرکردنی کێشە تایبەتییەکاندا، هەموان لە بەردەمی یاسادا یەکسانن. هەڵبژاردن بۆ پۆستە گشتییەکان، لەسەر بناغەی لێوەشاوەیی و بە توانایییە، نەك بەپێی ئەندامبوون لە چینێکی دیاریکراودا. کەس لەبەر نەبوونی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و هەژاریی، لە ئۆفیسی گشتی وەدەرنانرێت، هەتا خۆی ئارەزووی بێت لە خزمەتی شاردا بێت، دەمێنێتەوە. ئێمە تەنیا لە ژیانی گشتیماندا ئازاد و کراوە نین، بەڵکو مانای ئازادیی ژیانی ڕۆژانەمان لەگەڵ یەکتریدا ڕێکدەخات. ئێمە لە دراوسێکانمان توورە نابین، ئەگەر ئەوەی پێیان خۆشە بیکەن. هەروەها بێدەنگیش نابین لە دەربڕینی نارەزایی لەو کردەوەیەی دەبێتە هۆی ئازاردانی ئەوانیتر، گەرچی ئەمە تاوانبارکردنێکی راستەقینە نییە. ئێمە لە کاروباری تایبەتیماندا، لێبوردەین و خۆمان لە ئیهانە بەخشینەوە دەپارێزین. بەڵام لە ژیانی گشتیماندا، بایەخێکی زۆر دەدەین بەوەی یاسا نەشکێنین، چونکە ئێمە ڕێزێکی قووڵمان بۆ یاساکان هەیە. ئێمە گوێرایەڵی ئەوانەین کە بۆ ماوەی یەك ساڵ سەرپەرشتی ئۆفیسە گشتییەکان دەکەن. هەروەها بایەخێکی تایبەتیش دەدەین بەو یاسایانەی بۆ پاراستنی چەوساوەکان دانراون، هەروەها هەموو ئەو یاسا نەنوسراوانەی سەرشۆڕیی بۆ پێشێلکەرانیان دەهێنن، ئەگەر بیانەوێت پێشێلیان بکەن.

با خاڵێکی تریشی بۆ زیاد بکەم. ئێمە دەمانەوێت دەرفەتی باشتر بدەین بە ڕۆحی خۆمان بۆ ئەوەی لە گەلانی تر زیاتر لە کاری گران و نارەحەت بحەوێینەوە. بە درێژایی ساڵ چەندەها فێستیڤاڵی دراماتیکییانە و چالاکانەی ئایینی ساز دەکرێن. لە ماڵەکانماندا چاکە و خۆشی دەدۆزینەوە، ئەو شاگەشکەیییەی ڕۆژانە دەیبینین بەسەرماندا دەڕژێت، هەموو ناخۆشییەکانمان رادەماڵێت. ئەمە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ مەزنیی شارەکەمان، لە سەرانسەری جیهانەوە هەموو جۆرە کەلوپەلێك دەڕژێتە ناو شارەکەمانەوە. ئەمە شتێکی زۆر سروشتییە بۆ ئێمە چێژ لە بەرهەمی چاکی میللەتانی تر وەربگرین، وەك چۆن ئەوان چێژ لەو شتانە وەردەگرن کە ئێمە بەرهەمیان دەهێنین.

شێوازی ژیانی ئێمە لە ڕوویەکی تریشەوە لە ژیانی دوژمنەکانمان جیاوازە. شارەکەی ئێمە بۆ هەموو جیهان کراوەیە. ئێمە هەرگیز هیچ یاسایەکی وەهامان نیە کە ڕێگە لە کەس بگرێت لەوەی چی دەوێت لێرە بەدوایدا بگەڕێت یان بیدۆزێتەوە، شارەکەشمان هیچ نهێنییەکی وەهای نیە تا دوژمنێك بەدوایدا بگەڕێت و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت. ئێمە بۆ ئاسایشی خۆمان هیچ ئامادەکارییەکی بەرگریکردن یان شتێکی شاراوەمان نییە، بەڵکو پشتیوانمان ئەو جوامێرییەیە کە لە ڕۆحەکانمانەوە هەڵدەقوڵێت، ئێمە کاتێك بانگەواز دەکرێین بۆ ڕاپەڕین، یان بۆ پەروەردە، دوژمنان هەر لە سەرەتای لەدایکبوونەوە، منداڵەکانیان دەخەنە ژێر مەشقێکی سەخت و گرانەوە، کە تاقەتی پیاو دەپڕوکێنن. ئێمە، بە شێوازە راشکاوەکەی ژیانمان، ڕێك وەکو ئەوان ئامادەین ڕووبەڕووی مەترسی ببینەوە. ئەمەش بەڵگەی قسەکانمە. سپارتە هەرگیز بە هێزەکانی خۆیان نەیانتوانیوە ئاتیکا(٣) داگیر بکەن، بەڵکو هەموو هاوپەیمانەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە. بەڵام کاتێك ئێمە هێرش دەکەینە سەر شارێکی دەوروبەر، بەشێوەیەکی ئاسایی هەمیشە هەر خۆمان بە تەنیا دەیبەینەوە، تەنانەت ئەگەر لەسەر خاکی دوژمنیش بجەنگین و

ڕووبەڕووی پیاوانێك ببینەوە كە داكۆكی لە ماڵەكانی خۆیان دەكەن. لە ڕاستیدا، هیچ دوژمنێك، دەرۆستی ئەو هێزە سەربازییەی ئێمە نەهاتووە، چونكە مەشقكردنی ئێمە تەرخانە بۆ پێداویستییەكانی كەشتیگەلەكەمان، وەك چۆن تەرخانیشە بۆ ناردنی هێزەكانمان بەرەو گەلێك خاكی تر. ئەگەر دوژمنەكانمان بەسەر یەكێك لە بەشەكانی هێزەكانماندا زاڵ بوون و بەزاندیان، ئەوا خۆیان بادەدەن و دەڵێن تەواوی دوژمنەكەمان بەزاندووە، بەڵام ئەگەر ببەزن، ئەوا دەڵێن، هەموو سوپاكەیان هاتبوو بۆیە خۆمان پێ ڕانەگیرا. بۆیە ئەوە دیسپلینێكی ژاناوی نییە كە وامان لێدەكات بچینە دەرەوە و ڕووبەڕووی مەترسی ببینەوە، بەڵكو متمانە و دڵنیایی خۆمانە كە هانمان دەدات. مێرخاسییە سروشتییەكەمان لە شێوازی ژیانمانەوە هەڵدەقوڵێت، نەك لە زۆرەملێیی یاساكانەوە. هەروەها ئێمە كاتی خۆمان لەوەدا سەرف ناكەین، كە چاوەڕێی ئەو ئەشكەنجانە بین كە هێشتا لە حوكمی داهاتوودان، كاتێك دەكەوینە بەردەمی تاقیكردنەوە، كەمتر ئازا نین لەوانەی بەردەوام خەریكی خۆئامادەكردنن بۆ شەڕو پێكداكێشان. لەبەر ئەم خەسڵەتانە و گەلێكی تریش، ئەسینا شایستەی پێسەرسامبوونە.

حەزكردنمان لە جوانی وامان لێناكات كەمتەرخەم بین، خۆشەویستیمان بۆ شتە عەقڵییەكان وامان لێناكات نەرم و شل بین. بەلای ئێمەوە سامان شتێكە بۆ ئەوەی بە باشی بەكاربهێنرێت، نەك شتێك كە خۆمانی پێوە بابدەین. پێویست ناكات كەس شەرم لە هەژاریی بكات، بەڵكو شەرمەزاریی ئەوەیە یەكێك ئەوپەڕی توانای خۆی بەكارنەهێنێت بۆ ئەوەی لە هەژاریی ڕزگاری ببێت. بایەخدانمان بە كاروباری تایبەتیمان، بە بایەخدانمان بە كاروباری شارەكە هاوسەنگ كراوەتەوە.

هەموو ئەو گەلانەی سەرقاڵی كاروباری خۆیانن، ئەوانە زۆر دەربارەی مەسەلە سیاسییەكان دەزانن. ئێمە بە سادەیی، پیاوێك كە بەشداریی ناكات لە ژیانی شاردا، بە كەسێك لە قەڵەم نادەین كە بە تەنیا هەر بە كاروباری خۆیەوە سەرقاڵە، بەڵكو وەكو كەسێك كە بە كەڵكی هیچ شتێك نایەت. ئێمە هەموومان دەربارەی كاروباری شار دەمەتەقێ دەكەین، بەقەدەر ئەوەی شایستەین، یاخود لانیكەم بەشداریی دەكەین لە بڕیاردانەكاندا. ئێمە پێمان وا نیە كە ئەو گفتوگۆیانە ڕێ لە كردەوە دەگرن. ئێمە بەڕاستی لەو باوەڕەداین كە ئەوەی وێرانكەرە ئەوەیە بەشێوەیەكی زۆر یەكلاییكەرەوانە كردەوەمان لێبوەشێتەوە، پێش ئەوەی لە ڕێگای مشتومڕەوە خەڵكی بە تەواویی زانیارییان وەرگرتبێت.

بەهێزترینیان ئەوانەن كە بەوپەڕی ڕوونی تێدەگەن كە لە ژیاندا چی ئەستەمە و چی خۆشە، پاشان بەوپەڕی ورەبەرزییەوە دەچنە دەرەوە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی مەترسی ببنەوە.

بەڵام ئەو كەسەی شتێك قەرزداری ئێمە بێت، زیاتر لەوە دەچێت باكی بە هاوڕێیەتی نەبێت، چونكە دەزانێت كاتێك چاكەكەمان دەداتەوە، بە چاكەیەك بۆی حیساب ناكرێت كە لێی وەشابێتەوە، بەڵكو وەكو قەرزێك دادەنرێت كە گەڕاندبێتییەوە.

دیسانەوە، ئێمە بە خانەدانیی ڕۆحمان لەوانیتر جیادەبینەوە، بەو ڕێگایەی كە لێوەی ئێمە خۆمان دەخەینە ڕوو بەرامبەری خەڵك. ئێمە هاوڕێیەتی دەبەستین، نەك بە وەرگرتنی چاكە لەوانیترەوە، بەڵكو بە پێشكەشكردنی چاكە بە خەڵكی تر. یاریدەدانی خەڵكی تر زیاتر وامان لێدەكات جێگای متمانەی ئەوان بین، چونكە كاتێك وا دەكەین، ئەوە

بۆ ئەوەیە ئەو ئیرادە چاکە لە دەست نەدەین کە خۆمان ئەفراندوومانە. ئەو شارەی هاوڕێیەتییەکانی خۆی لەسەر بناغەی بەدەستهێنانی یاریدەو هاوکاری دروست دەکات، مایەی متمانە پێکردن نییە. خۆ ئاوەلاکردنی بەرامبەری خەڵکانی تر، لەلایەنی ئیرادەی چاکەوە بەڕێوە ناچێت، بەڵکو بەهۆی مانای نابەدڵانەی ناچارییەوە. ئێمە تەنیا چاکە لەگەڵ ئەوانیتردا دەکەین، نەك لەبەرئەوەی ئێمە هەڵوەستەیەك دەکەین بۆ ئەوەی حیسابی ئەوە بکەین ئایا ئەو چاکەیە لە بەرژەوەندی خۆماندا دەبێت یان نا، بەڵکو بە رۆحی سەربەستییەوە ئەوە دەکەین، کە بزوێنەری ئێمەیە.

بەکورتی، من جەخت دەکەم لەسەر ئەوەی شاری ئەسینا، هەر هەمووی بەسەریەکەوە، مۆدێلێکە بۆ هەموو یۆنان، هەروەها ئەوەندەی من دەتوانم بیبینم، هەموو ئەسینایییەك، خۆی لە خۆیدا وەکو تاکێك ئیکتیفای بە خودی خۆی کردووە و وەکو کەسێکی فرەبەهرەی نائاسایی رەفتار دەکات بە فۆرمە جیاجیاکانی چالاکییەوە دەنازێت.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

١-پێرکلیس *Pericles (495? BC – 429? BC)* سیاسەتمەدارێکی ئەسینایی بوو، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر مێژووی ئەسینا جێهێشتووە، بەڕادەیەك ئەو سەردەمەی لە دەسەڵاتدا بووە، بە سەردەمی پێرکلیسی ناو دەبرێت. پێرکلیس کوڕی گزانتیپە کە سەرکردەی سوپا بووە و دوو مامۆستا کاریگەرییان لەسەری هەبووە: دیمۆنی ئەسینایی، کە سۆفیستێکی شارەزای مۆسیقا بووە، هەروەها ئەناکساگۆراسی فەیلەسوفی ئایۆنیی؟ بە درێژایی ژیانی پیاوێکی بە ویقار و دوورەپەرێز بووە لە رەشە خەڵك. پیاوێك زمانپاراوی سەرڕاستی زرنگ و نیشتمانپەروەر بوو، هاوشارییەکان خۆشیان دەویست. سۆفۆکلیسی درامانوس و هیرۆدۆتی مێژوونوس و فیدیاسی پەیکەرتاش و پرۆتاگۆراسی سۆفیست، هاوڕێی نزیکی بوون. پێرکلیس ئەسینایییەکانی هاندەدا کە پێویستە هەریەکەیان بەشدارییەکی لە فەرمانڕەواییدا هەبێت. کرێ و مووچەی داهێنا لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیدا. لە ماوەی سەرکردایەتییکردنی ئەم پیاوەدا ئەسینا بوو بە سەنتەرێکی گەورەی ئەدەب و هونەر. لە جەنگی پیلۆپۆنیشیاندا ساڵی ٤٣١ی پێش زایین، پێرکلیس خەڵکی ئەسینا و دەوروبەرەکەی لە دیوی ناوەوەی شوراکانی شاردا کۆکردەوە، بەمەش رێ بۆ دوژمنان خۆش بوو کە هەرێمەکانی دەرەوەی شار تالان بکەن. ساڵی دواتر نەهامەتییەکی گەورە بەسەر شاری قەرەباڵەغ و سیخناخی ئەسینادا هات، خەڵکی تووشی نەخۆشیی و لەناوچوون بوون و رقیان لە پێرکلیس هەستا. لەسەر کار لایاندا، بە تۆمەتی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات، دادگاییان کرد، بەڵام دواتر گەڕاندیانەوە شوێنی خۆی و زۆری پێنەچوو، بە کارەساتێکی ناخۆش مرد.

٢-لە ساڵی ٤٨٠ ی پ.ز، تیمیستۆکلیسی سەرکردەی یۆنانییەکان، بە خۆی و سوپاکەیەوە، لە جەنگی سالامیسدا فارسەکانیان بەزاندو شاری ئەسینایان لە ژێر دەستیان دەرهێنا. دەستیان کردەوە بە سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی شارە وێرانکراوەکە. دەستیان کرد بە بیناکردنی شورای بازنەیی بە دەوری ئەسینا و پیراوسدا. هەروەها دیوارێکیشیان دروست کرد بۆ ئەوەی ئەسینا و بەندەرەکە پێکەوە ببەستنەوە. لە ساڵی ٤٥٠ پ.ز دا، پێرکلیس کارەکەی تەواو کرد و ئەسینای کرد بە شارێکی مەزن. ئینجا پیتاکی میللی کۆکرایەوە بۆ دروستکردنی پەرستگای پارسینۆن، ئاگۆرا پێشخراو فراوانکرا، ئیتر لە هەموو لایەکەوە کەلوپەل رووی تێدەکرد. ئەسینا سەرۆکی هاوپەیمانێتی

دەوڵەتشارەكانی یۆنان بوو، دەسەڵاتێكی ئیمپراتۆرییەتانەی هەبوو. لە سەرانسەری ئاگیاوە، كێشە و مەسەلە یاساییەكان دەهێنرانە بەردەمی دادگای ئەسینا. كەلتور گەشەی سەند و تراجیدیا و كۆمیدیا سەریان هەڵداو لەسەر شانۆكەی دایۆنایسیس لە دامێنی ئاكرۆپۆلیسدا، نمایش دەكران. پێركلیس كۆڕی ڕۆشنبیران و بیریارانی سازدەكرد و سەركردەكانی كۆدەكردەوەو مەسەلەكانی شاریان تاوتوێ دەكرد. شارەكە دەستورێكی دیموكراسییانەی هەبوو، شێوازێكی پرشنگداری قوتابخانەی هێلاس بوو. لەو سەردەمەدا دانیشتوانی شارەكە گەیشتبووە ٢٠٠,٠٠٠ كەس، كە ٥٠,٠٠٠ یان نێرینەی خاوەن مافی هاوشارێتی بوون، باقییەكەشی ئافرەت، بیانی، كۆیلەكان بوون و مافی هاوشارێتییان نەبوو.

٣–ئاتیكا *Attica* هەرێمێكی یۆنانی دێرینە، نیمچە دورگەیەكە لە باشوری دەریای ئاگیدا. دابەشكرابوو بۆ ١٢ هەرێمی سەربەخۆ، كە دواتر سیسیۆسی پادشای ئەسینا یەكی خستوون. ئایۆنییەكان لەو ناوچەیەدا دەژیان، لە دەوروبەری ٧٠٠ی پ.ز دا چوونە ژێر سەركردایەتی ئەسیناوە. ناوچەیەكی كەلتوریی و سیاسیی بەهێز بووە، بۆیە زمانەكەی بووە بە زاری ستانداردی ئەدەب.

## سەرچاوە

www.rigib.com

# دیموکراسی

عبدالرحمن عالم
لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

دیموکراسی واژەیەکە لە دوو واژەی یونانی دیمۆس (*demos*) بە مانای خەڵك و کراسیا (*cratia*) یان (*krato*) بە مانای دەسەڵات وەرگیراوە. دیمۆس لە بەکارهێنانی ئەسینایی یان یۆنانیدا بە مانای جەماوەری گوندنشینان بووە و لەم رووەوە لە ئەسینا هەر گوندێکیان بە (*demoi*) و دانیشتوانی ئەو گوندەیان بە (*demotai*) ناو دەبرد. لە سەدەی پێنجی پێش زایندا گۆڕانێك لە مانای دیمۆسدا بەدی هات و ئەم واژەیە بە کۆبوونەوەی هەموو خەڵکی ئەسینا دەوترا کە بۆ جێبەجێ کردنی کارە حکومیەکان کۆدەبوونەوەو راوێژیان دەکرد. لەم مانایەدا دیمۆس گوندنشینان و شارنشینانی دەگرتەوە. لە ساڵی (٥٠٩)ی پ.زایندا لە ئەنجامی چاکسازییەکانی کلیستنی یاسادانەری ئەسیناییدا، بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای ئەسینا کەوتە دەستی گوندنشینەکان و لەوە بەدواوە حکومەتی ئەسینایان بە دیموکراسیا (*demokratia*) ناوبرد، واتە حکومەتی لادێییەکان. ئەم مانایە وردە وردە فراوان بوو تا ئەوەی دیموکراسی بوو بە ناوێکی گشتی بۆ ئەو حکومەتانەی کە بە دەستی هەموو خەڵك بەڕێوە دەبران بە کورتی، دیموکراسی مانای دەسەڵاتی خەڵکی وەرگرت بەڵام هەروەکو فینیر وتوویەتی (دیموکراسی مانای جۆراوجۆری وەرگرتووە، هەندێ لەو مانایانە زۆر لەیەك جیاوازن، ئەم واژەیە نابێ خراپ خەڵکی لێ حاڵی بکرێ و دەبێ لە مشت و مڕی بێهوودە بە دوور بگیرێ و بەپێی توانا لە ناکۆکی تەواو نادیار دوور بخرێتەوە و خودی ڕێوشوێنە جۆراوجۆرە بنچینەییەکانی ئاشکرا بکرێ، دەبێ بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوەی وردەوە)[1].

دیموکراسی لە سەردەمانێکەوە کە وەبیرنایەنەوە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا برەوی پەیداکردووە. "پرانسیپی دیموکراتی لەم مانایەدا کە دەبێ بۆ حاڵی هەندێ لە پێویستیە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگا سوودمەندبێ و ڕێز لە هەندێ لە داواکارییە گشتیەکان بگرێ ئەگەر لەگەڵ پێودانە دیاریکراوە

گشتیەکاندا هاوئاهەنگ و لەسەر ڕادەیەك لە چاکەی گشتی بنیات نرابێ، کار لە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەکات"[٢].

دیموکراسی لە چەمکی بەشداریی کاریگەر لە بەڕێوەبردنی کارە گشتیەکاندا هەمیشە هەبووە، بەڵام کەم و زۆر لە مەیدانەکانی حکومەتی خۆماڵی و ئەرکدا بە سنوورداری ماوەتەوە. هەتا لەم سنوورەشدا، کۆیلەکان یان سەرفەکان و کەمدەرامەتەکان یان چینەکانی خوارەوە، ژنان و زۆربەی کۆچبەران بەشدارییان لە دەسەڵاتدا نەکردووە. لە دەرەوەی ئەو بوارە دیاریکراوانە، پرانسیپی دیموکراتی نەریتێکی باو نەبووە، چونکە دژواری پەیوەندییەکان، بێ نەوایی، نەخوێندەواریی و هەستی رق لێبوونەوەی خەڵك، نەسازان و بێ متمانەیی بەیەکتری لە نێوانیاندا ڕێگر بوو لەبەردەم قبوڵ کردنی پرانسیپی دیموکراسی لە حکومەتی مەرکەزی دەوڵەتەکاندا[٣]. تەنها لە سەردەمەکانی دواتردا، چەند بنەمایەکی ڕاست بۆ خستنەگەڕی کاریگەرانەی دیموکراسی لەسەر ئاستی مەرکەزیی حکومەت دانرا.

دیموکراسی لە دژی "حکومەتی زۆرداریی و تاکەکەسی" سەریهەڵدا، بەڵام هەموو لایەنگرانی یەك بیروبۆچوونیان نییە. هەندێکیان (ئازادیی) بە ئامانجی سەرەکی حکومەت دەزانن و هەندێکی تر (یەکسانیی) بە داخوازیی تەواوی دیموکراسی لێك دەدەنەوە. فینیر لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە زۆر لە دیموکراتەکان ئازادییان بە (تەنها وەسیلەیەك بۆ ئامانجەکانی دیکە) زانیوە. هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕی گروپ و چینە جۆراوجۆرەکان ئەوە ئاشکرا دەکات کە (بیر و باوەڕیان بەشێوەیەکی سەرەکی (نەك بە تەواوی) بەرهەمی بەرژەوەندییەکانی ئەوانە و تا ئەوڕادەیە ئامادەی چوونە پێشەوەن کە بۆ دابینکردنی ئەو بەرژەوەندیانە نەك زیاتر پێویست بێ) هەروەها فینیر بەو ئەنجامە گەیشت کە بنەمای مەیلی دیموکراتی تا سەدەی هەژدە نارەزایی ئامێز و شۆڕشگێڕانە و ڕەتکەرەوە بووە "سەبارەت بەوەی کە دەبوو جێگای شتێکی دیکە بگرێتەوە، هوشیارییەکی کەم" هەبوو. بەڵام لە کاتێکدا کە ئەرکە پێویستەکانی وێرانکردن بە تەواوی ئەنجام دران، مەسەلەی ئەو ڕێگایەی کە دەبێ بگیرێتە بەر گرنگی پەیداکرد و ئەنجام ئەوە بوو کە نەوەیەك لە دوای ساڵی ١٨٤٨، (دیموکراسی لە مانای ئازادیدا کۆتایی هات و سوسیالیزم جێگای گرتەوە).

ئەو کەسانەی کە ئازادی بە ئامانجی سەرەکی دەزانن باوەڕیان وایە کە بنەمای دیموکراسی بریتییە لە "حوکم کردن لە ڕێگەی باس و گفتوگۆوە (واتە هاندانی حوکم کراوەکان) و تەسلیم بوونی بەرەبەرەی گروپە حوکمڕانەکان بە حوکم کراوەکان شانبەشانی دڵدانەوەی کەمایەتی و هاونیشتمان و تاکەکان و بەوردی چاودێری کردنی ویژدان و خاوەنداریێتی"[٤] بەڵام خواستی بەرەبەرەو بەردەوام بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی بەرفراوان لەگەڵ ئەو ئەنجامە ناچارییەدا هاوشان بووە کە زۆر لەو شتانەی کە ڕێزیان لێ دەگیرا، دەبوو لەناوببرێن. بە قسەی فینیر: "حکومەتە تازەکان بە کردەوە لەگەڵ کەنارخستنی زۆر و ڕێگرتن لە خوێن ڕشتن و پاراستنی دەزگا دیموکراتیەکاندا، ڕووبەڕووی ئەرکی قورسی دابینکردنی خێراو دوای ئەویش پاراستنی ژمارەیەك لە ریفۆرمەکان دەبوونەوە لە پێناوی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا"[٥] فینیر بەحسابکردن بۆ ناکۆکی توندی بیر و باوەڕەکانی پەیوەست بەو ئامانجەی کە دەبێ پیادەبکرێ، وتی ئەگەر بەردەوامیی کۆمەڵگای سیاسی پێویستە

"هەردولا دەبێ ئەوە بزانن کە حەق لای هەریەکێکیان نییە، بەڵکو هەموویان پێکەوە لەسەرحەقن". بەواتایەکی دی، بەهۆی ناکۆکی بیروباوەڕی ئینسانەکانەوە، کێشمەکێش و ڕەنگە لەناوچوون و ئاوابوونیش ناچاری بێت، مەگەر ئەوەی کە پێویستیی، دامەزراندنی دەزگاکانی سنووردارکردنی بە تەواویی نیشان دابێ.

## ١-مانا و پێناسەی دیموکراسی

هەندێ لە توێژەرانی سیاسی دیموکراسی نەك تەنها بە شێوەیەك لە حکومەت بەڵکو بە شێوەیەك لە دەوڵەتیش دەزانن. هەندێکی تر وەکو فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی ئاماژە بۆ دیموکراسی دەکەن. بە باوەڕی هیرینشاو (*Hearnshaw*)، لە حکومەتی دیموکراتیدا، سەراپای کۆمەڵ خاوەنی توانای باڵاترە و باڵادەستی کۆتایی لە کۆمەڵەوە سەرچاوەی گرتووە. "دیموکراسی وەکو فۆرمێك لە دەوڵەت تەنها شێوەی دامەزراندن و بە دەستەوەگرتن و بەرکەنارکردنی حکومەتە" دایسی ئاوا پێناسەی دیموکراسی کردووە "لە دیموکراسیدا بەشێکی گەورە لەگەڵ دەستەی فەرمانڕەوایە" بە قسەی ئیبراهام لینکۆڵن دیموکراسی "حکومەتی خەڵکە، لەلایەن خەڵکەوەیە، بۆ خەڵکە، بۆهەموانە و لەلایەن هەموانەوەیە" لە پێناسەکەی بریسدا بۆ دیموکراسی هاتووە "بریتییە لەو شێوەیەی حکومەت کە تیایدا دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی دەوڵەت بەشێوەیەکی یاسایی نەك بە چینێك یان چەند چینێکی تایبەتی بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی بە هەموو ئەندامانی کۆمەڵ سپێردراوە. واتە لەو کۆمەڵگایانەدا کە هەڵبژاردن هەیە فەرمانڕەوایی بەدەست زۆرینەوەیە، چونکە بۆ دیاریکردنی ئاشتیخوازانە و یاسایی ئیرادەی کۆمەڵگایەك کە یەکدەنگی تێدانییە، هیچ شێوەیەکی دیکە لەئارادا نییە"[٦]

بەم پێیە، هەروەکو ویڵسون وتویەتی، "دیموکراسی لە هیچ دوو وڵاتێکدا یەکسان نییە" : "لە ڕێگەی پەرەپێدانی نیشتمانی و بۆ یارمەتیدانی بەدیهاتنی شێوەی دیموکراتی حکومەت چەندان دەزگای جیاواز و جۆراوجۆر هێنراونەتە ئاراوە. ڕاستە کە دەربارەی تایبەتمەندیی بنەمای دیموکراسی یەکدەنگیی هەیە، بەڵام جیاوازی باوەڕیش زۆرە".

بە باوەڕی مەکایڤەر "دیموکراسی ڕێگای دیاریکردنی حکومەتی زۆرینەیان غەیری ئەوەنییە، بەڵکو لە بنچینەدا ڕێگای دیاریکردنی ئەوەیە کە چ کەسێ دەبێ حوکم بکات و لەبەر کام ئامانجانە"[٧].

بە قسەی لینین دیموکراسی بریتییە لە "شێوەیەك لە ڕێکخستنی سیاسی کۆمەڵ کە تائەوپەڕی لە خزمەتی بەرهەم هێناندابێ و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵ ئەوە دیاری دەکات" فراوانترین و گشتگیرترین چەمکی دیموکراسی چارلس مەریام خستوویەتیە ڕوو تیایدا دەڵێت: "دیموکراسی کۆمەڵێك ڕێسا یان تەرحی گشتی ڕێکخستن نییە بەڵکو چوارچێوەیەکە لە بیروڕا و شێوەی کارکردن کە لە پێناوی خێروخۆشی گشتیدا دانراوە بەشێوەیەك کە ئیرادەی گشتی ڕاڤە و ڕێنمایی دەکات"[٨].

بەم شێوەیە، دیموکراسی هەم شێوەیەکە لە حکومەت و هەم فەلسەفەی پێکەوە ژیانە. حکومەتێکە کە تیایدا خەڵك یان زۆرینەیان خاوەنی دەسەڵاتی کۆتایی بریاردانن دەربارەی مەسەلە گرنگەکانی سیاسەتی گشتی. حکومەتێکی ئاوا بۆ خۆی ئامانجێك نییە، بەڵکو وەسیلەیەکە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی زۆر گرنگتر وەکو ژیانێکی

باش بۆ هەموو دانیشتوان، لایەنی زۆری ئازادی تاکەکەس لەگەڵ گرەنتی گشتیدا، ڕێساو خۆشگوزەرانیی، زۆرترین ئیمکانیات بۆ هەموان، گەشەکردنی تەواوی کەسێتی تاکەکان و بەشداریی کاریگەری زۆرترین ژمارەی هاوولاتیان لە حکومەتدا[٩]. بە واتایەکی دیکە، دیموکراسی سیستمێکی سیاسی و فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتییە کە زیاتر لە هەر سیستم یان فەلسەفەیەك، هەمەجۆری بیروباوەڕ قبوڵ دەکات و تیایدا دەستاو دەست کردنی دەسەڵاتی سیاسی لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە ئەنجام دەدرێ و ئامانجی بریتییە لە دابین کردنی لایەنی کەمی خۆشگوزەرانی بۆ هەموان.

## ٢-بنەماکانی حکومەتی دیموکراتی

تا پێش سەدەی نۆزدە دیموکراسی وەکو سیستمی بنەما سیاسیەکان سەری هەڵنەدابوو بەڵام لەو کاتە بەدواوە بنەما بنچینەییە سیاسیەکانی لەخۆگرت. یەکەم بنەمای ئەم بنەما سیاسیانە، دەستووری نووسراو بوو کە دیموکراسی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لە کاتی شۆڕشەکانی ئەمریکا و فەرەنسەدا وەکو پێویستی حکومەت دەریخست و نیشانەی سەرەکی گەشەکردنی بوو وەکو شێوەیەك لە حکومەت. حکومەتی دیموکراتی بۆ ئاشکراکردنی داخوازی حوکم کراوەکان دەبێ خاوەنی دەزگایەکی دیاریکراو و سەقامگیر بێت و دەستووری نووسراو ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکات. هەڵبەتە لە هەلومەرجی تایبەتی مێژوویدا هەتا دەستووری نەنووسراویش وەکو هی بەریتانیا، دەشێ لە خزمەتی ئامانجەکانی دیموکراسیدا بێت. دووەم ئەندێشەی گرنگ دەربارەی حکومەت لە سیستمی دیموکراتیدا، ئارەزووە بۆ لایەنگریی حکومەتی یاسا کە مەعنای فەرمانڕەوایی یاسا دەگەیەنێ نەك فەرمانڕەوایی خەڵك. دەستووری نووسراو و حوکمی یاسا هاوئاهەنگ لەگەڵ ئیرادەی خەڵکدا پایەی بنچینەیی حکومەت دەهێننە ئاراوە. سێیەمین پێویستی بنەڕەتی دیموکراسی وەکو شێوەیەك لە حکومەت بریتییە لە گەڵاڵە نامەیەکی ماف بۆ پارێزگاری کردن لە ئازادییە تاکە کەسیەکان. چۆنیەتی ئەم مافانە، بابەتی فەلسەفەی کۆمەڵایەتییە و هێزە مێژووییەکانی بەدیهێنەری کۆمەڵ پێکیدەهێنن. بۆ نموونە، دیموکراسی ئەمریکا لە نێوان یەکسانی سیاسی و یاسایی و نایەکسانیی ئابووریدا ناتەبایی نابینێ، ئەگەرچی نایەکسانیی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ئاسایی و لاواز بە ناپەسەند دەزانرێ. لەلایەکی ترەوە، دیموکراسی سوسیالیستی، موڵکایەتی تایبەتی سەرچاوە سروشتیەکان و پیشەسازییە سەرەکیەکان قبوڵ ناکات؛ هەروەها حەزی لە ڕکابەریی ئازاد نییە وەکو فاکتەری پێشکەوتنی ئابووری. سەرئەنجام بوونی بونیادی دیموکراتی حکومەتی پێویستە چونکە بەشداریی زۆربەی زۆری ئەندامە بالغەکانی کۆمەڵگای سیاسی دابین دەکات. لایەنە بنچینەییەکانی حکومەت بریتین لە مافی دەنگدان، فەرمانڕەوایی زۆرینە، حکومەتی نوێنەرایەتی (لەو شوێنەدا کە دیموکراسی راستەوخۆ نییە) ویلسون وتویەتی ئەم لایەنە بنچینەییانەی حکومەت بەجیا و بەبێ بوونی حکومەتی دیموکراتیش هەبوون و پەرەسەندن و ڕەواجیان وەکو پێویست بە مانای بوونی حکومەتی دیموکراتی نەبووە. بەڵام بەحسابکردن بۆ پەیوەستی لەگەڵ بنەما ناوبراوەکانی دیکەدا، پایەکانی حکومەتی دیموکراتی دەهێننە ئاراوە.

## أ-دیموکراسی وەکو فەلسەفەی کۆمەلایەتی

مەسەلەی بایەخدان بە بیروباوەڕی خەلك یان بیروبۆچوونی گشتی لایەنی فەلسەفەی کۆمەلایەتی دیموکراسییە. دیموکراسی نوێ ئەوە قبوڵ دەکات کە ناکۆکیەکانی بیروڕای گشتی شتێکی بنچینەییە و تەنها نیشاندەری جیاوازی لە ماهیەتی بەرژەوەندییە گشتیەکانی هەموو تاکەکاندا نییە. تاك و گروپەکان چەند ئامانجێکیان هەیە کە دەیانەوێ حکومەت ئەو ئامانجانەیان دابین بکات. لەناو حکومەت یان دەوڵەتیشدا مەیلێك بۆ ئەو ڕوانینە هەیە کە "سەرنجی حکومەت بۆ ئامانجە کۆمەلایەتیەکانی بەرژەوەندییە ڕێکخراوەکان ڕابکێشێ". بەم پێیە ئامانجی کۆمەلایەتی دیموکراسی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، هاوسەنگیی یان بەرابەریی سیاسییە.

تەواوی داخوازییەکانی ئازادی و یەکسانی و برایەتی بە ئاشکرا تەئکید لە فەلسەفەی کۆمەلایەتی پەیوەست بە حکومەتی دیموکراتی دەکەنەوە. دیموکراسی بنیاتنراو لەسەر دەستوور بەپێی یاسا ڕێگە بە ئازادی دەدات و یاسا دەبێت "بەرهەمی پشتیوانیی سیاسی ئەندامانی کۆمەڵ بێت" یەکسانیی کە لە ڕووی مێژووییەوە لەگەڵ دیموکراسیدا هاوشان بووە، یەکسانیی پێشڕەوی یاسا و یەکسانیی دەرفەتەکانە. بەلام ئەم جۆرە یەکسانییە زۆر نەگونجاوە. باوەڕی گشتی ئەوەیە کە پرانسیپی یەکسانیی دەبێ پەرەی پێبدرێ بۆ مەیدانی ژیانی ئابووری و حکومەت لەم بارەیەوە دەبێ بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ بگرێ. سەبارەت بە پرانسیپی یەکسانیی هوشیاریی ڕوو لە گەشەکردن ئەوەیە کە تەواوی داخوازییە دیموکراسییەکان تەنها لە کۆمەڵدا توانای ڕەنگدانەوەیان هەیە. "ئەگەر خەلك دەبێ ئازاد بن دەبێ لە ڕێگەی ژیاندا لەگەڵ یەکتریدا بن، ئەگەر دەبێ یەکسان بن دەبێ لە هاوکاری و هاریکاری برایانەی کۆمەڵگای دیموکراتیدا بۆ یەکسانیی بگەڕێن" تازە تەواوی داخوازیی دەوڵەتی خۆشگوزەران بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەدەسێنێ و خۆشەویست دەبێ و وادیارە دیموکراسی سیاسی ڕێگەی (شەپۆلی ڕوو لە بەرزیی دیموکراسی کۆمەلایەتی" دەکاتەوە تا ئازادی و یەکسانیی و برایەتی دابین بکات کە بیروڕای گشتی بایەخیان پێدەدا.

ڕەنگە مایەی سەرنج بێت کە بزانین کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت وتیان کە دیموکراسی گشتگیر یان دیموکراسی بۆ هەموانیان لە ولاتەکەیاندا بەرقەرار کردووە و قسەکەی خۆیانیان لەسەر ئەو بنەمایە بەیان کرد کە بەرادەیەك یەکسانیی کۆمەلایەتی و نەژادی و ئابووریان بەدی هێناوە کە لە سەدەی بیستدا لە هیچ جێگایەکی تر هەرگیز بەدی نەهاتووە. کۆمۆنیستەکانی ئەو ولاتە بنەما پەرلەمانیەکان و ڕەوتە دیموکراتیەکانی خۆرئاوایان لە کۆمەڵگای چینایەتیدا هێندە بە مانادار نەدەزانی کە تیایدا کۆبوونەوەی دەسەلاتی ئابووری بەدەست چەند کەسێکەوەیە. لەلایەکی ترەوە باوەڕیان وا بوو کە سیستمی شورایی بەشداریی تەواوەتی خەلك لەسەر ئاستە جیاوازەکانی ژیانیان فەراهەم دەکات و چەندان دەرفەتی فراوان بۆ داهێنانی تاکەکەسی و چالاکی داهێنەرانە دەکاتەوە[10]. سەرئەنجام خەلکی سۆڤیەت بەرەبەرە بەهای حاکمیەتی یاسا و باسی ئازادیان دیاری کرد.

لە ڕووی فەلسەفەی کۆمەلایەتیەوە، دیموکراسی سێ لایەنی هەیە: کۆمەلایەتی، ئابووری، سیاسی، دەگوترێ هەتا کاتێك کە ئەم سێ لایەنە لە کۆمەڵدا نەبێت، دیموکراسی کامڵ نابێت.

مەبەست لە لایەنی کۆمەڵایەتی دیموکراسی ئەوەیە کە نابێ لەسەر بنەمای چین، نەبوونی، مەزهەب و ئایین، ڕەنگ و پێست و ڕەگەز دووبەرەکی هەبێت. لەم ڕوانگەیەوە دەگوترێت پیاوان و ژنان، دەوڵەمەند و هەژار بە چاوپۆشی لەهەر حوکمدانێکی چینایەتی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە یەکسانن و دەبێت بە یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت. لەلایەنی ئابوورییەوە، دیموکراسی مانای وایە کە دەبێ دابەشکردنی گونجاوی سەروەت و سامان لە کۆمەڵدا هەبێت و ئەو جیاوازییە زۆرانەی لەسەر بنەمای سەروەت و سامان هەن نەمێنن. دیموکراسی ئابووری بەرەسمی دان بە مافی کار، پشوودان، کرێی عادیلانە و مافی بێ سنووری بەهرەمەندیی لە ژیان دەنێت. لایەنی سیاسی دیموکراسی دەلیلی بوونی مافە سیاسیەکانە، یەعنی مافی دەنگدان، مافی ڕەخنەگرتن لە هەڵبژاردن و مافی گەیشتن بە پلە و پایە گشتیەکان. بۆ خستنەگەڕی کاریگەرانەی ئەم مافانە تاکەکەس دەبێت لە ئازادیی ڕادەربڕین، ئازادی ڕۆژنامەگەریی و کۆڕ و کۆبوونەوە و هەموو ئازادییە سیاسی و مەدەنیەکانی دیکە بەهرەمەند بێ.

فەلسەفەی نوێی دیموکراسی، وەکو هەر قوتابخانەیەکی دیکەی سیاسی، سەبارەت بە ماهیەتی مرۆڤ و کۆمەڵ چەند پرانسیپێك بەڕاست دەزانێت. لەگەڵ ئاماژەکردندا بۆئەوەی لەم بارەیەوە لە نێوان توێژەرە سیاسیەکاندا جیاوازیی بیروڕا هەیە، دەتوانرێ بە کورتی ئەو پرانسیپانە بژمێردرێ. هیرینشاو ئەم پرانسیپانەی خوارەوەی وەکو پرانسیپە ڕاستەکانی دیموکراسی ژماردووە:

١-هەموو ئینسانەکان وەکو پێویست عەقڵی ساغڵەمیان هەیە تاوەکو هاووڵاتیەکی هوشیار ڕۆڵی خۆیان ببینن.

٢-مرۆڤ وەکو سروشتی خۆی کار ڕاستە و دەتوانرێ چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێ بە باشی کار و ئەرکەکانی خۆی ئەنجامبدات.

٣-لە نێوان خەڵکدا هەستێکی بەهێزی پەیوەستەگی هەیە.

٤-لە نێوان خەڵکدا، ئیرادەی گشتی هاوبەش هەیە. تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە پرانسیپی دواییەوە هەیە، لە ڕووی حسابکردنەوە بۆ بەرژەوەندیی، دەبێ بوونی قازانجی جۆراوجۆر لە کۆمەڵگادا بە ڕاشکاوی بەڕەسمی دانی پێدابنرێ. بەم پێیە، دیموکراسی مەسەلەی هاوسەنگی کۆمەڵایەتییە و بیرە زاڵەکانی ئامانجی دیموکراسی لە هەر کاتێکی دیاریکراودا نیشاندەری هاوسەنگی قازانجەکانە.

رودی و هاوکارانی، لەگەڵ تەئکیدکردنەوەدا لەوەی کە دیموکراسی وەکو سیستمێکی حکومەتی ناتوانێت چاوپۆشی لە پرانسیپەکانی فەلسەفەی دیموکراسی بکات، ئەو پرانسیپانەیان ئاوا ژماردووە:

١-پەیڕەوی مرۆڤ لە عەقڵ و لۆجیك.
٢-پەیڕەوی مرۆڤ لە ئەخلاق.
٣-یەکسانیی ئینسانەکان.
٤-توانایی پێشکەوتنی مادی و مەعنەوی مرۆڤ.
٥-خوازیاری حکومەتی خەڵك.
٦-پرانسیپی ئازادی[11].

## ٣-جۆرەکانی دیموکراسی

جۆرەکانی دیموکراسی لە ڕووی مێژووییەوە نوێنەرایەتی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بوون. دیموکراسی ڕاستەوخۆ لە سەردەمی کۆندا لە شارە - دەوڵەتەکانی یۆنان و ڕۆمدا هەبوون. ئەمڕۆ دیموکراسی ڕاستەوخۆ وا لێکدەدرێتەوە کە

پەیوەندیی بە رابردووەوە هەیە. دیموکراسی راستەوخۆ تەنها لە دەوڵەتە زۆر بچووکەکاندا قابیلی جێبەجێکردنە کە ژمارەی دانیشتوانیان چەند هەزار کەسێکە و بەئاسانی دەتوانن لە جێگایەکدا کۆببنەوە و سیاسەتەکان بخەنە بەرباس و لێکۆڵینەوەوەو ڕێکی بخەن. لە هەندێ لە کانتۆنە بچووکەکانی سویسرا کە هێشتا (کۆبوونەوەی هەڵبژاردن)، یان تیایە، هاووڵاتیانی بالغ لە پیاوان لە ئەنجومەنی یەك شەمماندا لە نیسان یان لە مایسدا، کۆدەبنەوەو بە دەست بەرزکردنەوە نوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن، هەروەها ئەو هەنگاوانەش کە پێویستە دەنگی بۆ دەدەن و پەسەندی دەکەن.

حاڵی حازر دیموکراسی ڕاستەوخۆ لە بونیادەکانی ڕیفراندۆم و داهێنانی جەماوەریدا وجودی هەیە. ئەم دەزگایانە، کە لە ئەنجامی بوونیانەوە تاکەکان دەتوانن بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی لە کار و نوێنەرایەتیدا لە پەرلەمان لە ئەستۆی خۆیان داماڵن، لە سویسرا و هەندێ ویلایەتی ئەمریکادا هەن. لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دیموکراسی ڕاستەوخۆ لە لاتڤیا، ئەڵمانیا، ستوانیا، ڕوسیای سۆڤیەتی و ئیرلەندا سەریهەڵدا، بەڵام بێجگە لە یەکێتی سۆڤیەت لە شوێنەکانی تر فەرامۆش کرا. لە یەکێتی سۆڤیەت، بەپێی دەستوور بە داهێنانی پرزیدیومی ئەنجومەنی باڵا، لە مەسەلەی یاسادانانندا ئەگەری پەنابردنە بەر ریفراندۆم هەبوو. ئەگەرچی هەرگیز کاری پێنەکرا.

دیموکراسی ناراستەوخۆ (یان دیموکراسی نوێنەرایەتی) لە دەوڵەتە تازەکاندا کە رووبەریان فراوانە و ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە پیادە دەکرێ. بەم پێیە دیموکراسی ڕاستەوخۆ چیتر قابیلی وێناکردن نییە. لە ڕاستیدا لەم دەوڵەتانەدا خەڵك بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی خۆیانەوە فەرمانڕەوایی دەکەن. خەڵك بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لەلایەن نوێنەرە باوەڕپێکراوەکانی خۆیانەوە ئیرادەی دەوڵەت ڕێکدەخەن و تەعبیری لێ دەکەن. بنەمای ئەم جۆرە دیموکراسییە لەسەر پایەی ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی فەرمانڕەوایی هی خەڵکە، نوێنەرەکانیان، ئەو فەرمانڕەواییە پیادەدەکەن. نوێنەرەکان بەشێوەی دەوری هەڵدەبژێردرێن و لە بەرامبەر ئەو خەڵکەدا بەرپرسیارن کە دەتوانن ئەگەر بەپێی چاوەڕوانیەکانی ئەوان کارنەکەن لە هەڵبژاردنی داهاتوودا دەنگیان نەدەنێ و بیانخەنە کەنارەوە. بەم شێوەیە، نوێنەرەکان وەکو باوەڕپێکراوی خەڵك فەرمانڕەوایی خەڵك دەکەن. بەڵام دەبێ لە بەرامبەر ڕای گشتیدا هەستیار بن بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنی داهاتوودا لە نوێنەرایەتی نەخرێن.

شایانی باسە کە لە دیموکراسی نوێنەرایەتیدا، حزبەکان دەورێکی ژیانییان هەیە، چونکە ئیرادەی خەڵك ڕێکدەخەن و لە نێوان فەرمانڕەواکان و حوکمکراوەکاندا وەکو کەناڵێکی پەیوەندیی کاردەکەن. هەر بۆیە وتراوە کە دیموکراسی نوێنەرایەتی و حزبە سیاسیەکان دوانەن.

## ٤-کاراییەکانی دیموکراسی

دیموکراسی لە جیهاندا فراوان بووە و لایەنگرییەکی زۆری بۆ پەیدابووە و هەموو وڵاتە گرنگەکان دیموکراسییان هەڵبژاردووە. هەندێ لە سیفەتە گرنگەکانی دیموکراسی کە بۆتە هۆی باڵابوونی بەم شێوەیەیە:

### ١-کارایی حکومەت:

یەکێك لە گرنگترین پێوەرەکانی بەهێزی یان لاوازیی شێوەیەکی تایبەت لە حکومەت، کارامەبوونی ئەو حکومەتەیە. کارامەیی حکومەت بە

شێوازی کارکردنی ئەو حکومەتە لە هەلومەرجی ئاسایی و نائاسایی یان قەیراناویدا هەڵدەسەنگێنرێ. بەڕاستی وتویانە کە (هەڵبژاردنی گشتی و کۆنترۆڵی گشتی و بەرپرسیارێتی گشتی) کارایی دیموکراسی زیاتر لە سیستمەکانی دیکەی حکومەت، دابین دەکات. خۆبەڕێوەبردن، جەماوەر بەرەو دیسپلین دەبات و هەستی بەرپرسیارێتیان تێدا دروست دەکات و دەیانکات بە هاووڵاتی فیداکار و لەخۆبردوو.

**٢-دابین کردنی ئازادییە فەردییەکان:**

دیموکراسی تەنها شێوازی حکومەتە کە ئازادییە فەردییەکان دابین دەکات و لە ڕێگەی دەستوورەوە، مافی هاووڵاتیان زامن دەکات. جۆن ستیوارت میل، لەسەر هەمان پایە پشتیوانیی لە دیموکراسی کرد. ئازادی بیروڕا و دەربڕین، ئازادی ڕۆژنامەگەریی و کۆڕوکۆبوونەوە هەندێکن لە مافە مەدەنیە گرنگە زامن کراوەکانی خەڵک. دیموکراسی تاک بە بەهادار دەزانێ و دڵنیای دەکاتەوە کە دەرفەتی بەشداری کردنی دەبێت لە گەشەکردنی کۆمەڵدا. بەڕای لۆرانس لۆویل لە دیموکراسی تەواودا، هیچ کەسێ سکاڵا لەوە ناکات کە کەس گوێی لێ ناگرێ. بە قسەی هیرینشاو (دیموکراسی کۆمەڵێ دەمار بەهەر کەسێك دەگەیەنێ. لە نێوان ئەو کەسە و سەنتەردا پەیوەندی دەخوڵقێنێ) و حساب بۆ بیروبۆچوونی هەموو کەسێك دەکات.

**٣-دابین کردنی یەکسانیی:**

دیموکراسی خوازیاری یەکسانییە لە هەردوو بواری ئابووری و سیاسیدا و مافی دەنگدان و ڕەخنەگرتن لە هەڵبژاردن و بەدەست هێنانی پلە و پایە گشتیەکان بەبێ هیچ جۆرە جیاوازییەك لەسەر بنەمای چین، ڕەنگی پێست، مەزهەب یان ڕەگەز قبوڵ دەکات ئیمتیازاتی تایبەتی قبوڵ ناکات. لە دیموکراسی ڕاستەقینەدا، هەموو کەسێ مافی لای کەمی پێویستیەکانی ژیان و ئاسایشی کۆمەڵایەتی هەیە.

**٤-فێرکردنی جەماوەر:**

بەڕاستی دیموکراسی لە فێرکردنی گشتیدا ئەزموونێکی فراوانی هەیە. پێشبرکێی هەڵبژاردن لە ڕاستیدا ڕاهێنانێکی سیاسییە. لە هەڵبژاردنی گشتی یان لە هەر جۆرە هەڵبژاردنێکی دیکەدا، کاندیدە جۆراوجۆرەکان و دەنگ کۆکەرەوەکانیان مەسەلە گشتیەکان دەخەنە ژێر باس و لێکۆڵینەوەوە. بلاوکراوەی تایبەت بە هەڵبژاردن بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاودەبێتەوە. لەو کۆبوونەوانەدا ئەنجام دەدرێن، سیاسەت و بەرنامەی حیزبە جیاوازەکان روون دەکرێتەوە. لەم ڕێگایانەوە خەڵك بە گشتی لە ڕووی فیکری سیاسییەوە هوشیاری پەیدا دەکەن و دەنگدانی ئەوان نیشانەی ئەو بایەخەیە کە بەو حزب و کاندیدانەی دەدەن کە سیاسەت و بەرنامەکانیان بەدڵە. ئەم جۆرە هوشیاری و بەشداریکردنە ئاستی فیکری خەڵك بەرز دەکاتەوەو توانای تێگەیشتنی هاووڵاتیان لە کاروباری وڵات زیاد دەکات. بە قسەی بورنس *burns*: "هەموو حکومەتەکان شێوەیەکن لە فێرکردن، بەڵام باشترین فێرکردن، خۆفێرکردنە. بەم پێیە باشترین حکومەت حکومەتی خۆماڵییە کە دیموکراسی بێت".

**٥-پەرەپێدانی نیشتمانپەروەریی:**

دیموکراسی بە برەودان بە هەستی خۆشویستنی وڵات، لەناو خەڵکدا پەرە بە نیشتمانپەروەری دەدات. کاتێ بواری هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی خۆیان بە خەڵك دەدرێ، هەست دەکەن لە وڵاتەکەیاندا جێگایەکیان هەیە. فەرەنسیەکان هەتا شۆڕشی ١٧٨٩ کە مۆڵەتیان پێدرا لە

دیاریکردنی چارەنووسی وڵاتی باوو باپیرانیاندا بەشدارییەکیان هەبێ، هەرگیز برەویان بە خۆشەویستی وڵاتەکەیان نەدابوو. هێرشی عیراق بۆ سەر ئێران، هەستی نیشتمانپەروەرانەی خەڵکی ئێرانی بە جوانی نیشان دا، کە لە دوای شۆڕشی (١٣٥٧-١٩٧٩) چارەنووسی وڵاتەکەیان بەدەستەوە گرتبوو.

**٦-دابین کردنی سەقامگیریی حکومەت:**

دیموکراسی لە مەترسیەکانی شۆڕش پارێزراوە، چونکە حکومەتێکە لە ڕێگەی خواست و ویست و وتوێژ و دیالۆگەوە دامەزراوە. کاتێ خەڵك بتوانن لە ڕێگەی (متمانە پێنەدان) یان لە ڕێگەی دەنگدانەوە حکومەتەکەی خۆیان بگۆڕن، پێویست ناکات لە دژی ئەو حکومەتەی دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، دەست بدەنە توندوتیژی. دیموکراسی بە هەوڵدانی بۆ نەهێشتنی نابەرامبەریی ئابووریی، ئەگەری نارەزایی ناهێڵێ کۆمەڵ لە شۆڕش بەدوور دەگرێ.

**٧-نیزام و پێشکەوتن:**

دیکتاتۆریی نیزام دابین دەکات، بەڵام پێشکەوتن و پەرەپێدان پشتگوێ دەخات. دیموکراسی تاکە شێوازی حکومەتە کە تیایدا، جگە لە پاراستنی ئاسایش و نیزام لە وڵاتدا، خۆشگوزەرانیی خەڵك ئامانجێتی و توانای پێشکەوتنی خەڵك لە بوارە جیاوازەکانی ژیاندا زیاد دەکات.

**٨-بەهای خەڵك:**

دیموکراسی بە قبوڵکردنی بەهای تاکە کەس، هانی پێشخستنی داهێنان و بێباکی دەدات و هەستی بەرپرسیارێتی لای تاکەکەس پەروەردە دەکات. میل گوتەنی "دیموکراسی لە حکومەتەکانی دیکە باشتر، شێوەیەکی باشتر و بەرزتری سیمای نیشتمانی دەهێنێتە ئاراوە" مافە مەدەنی و سیاسیەکان گەورەیی بە تاك دەبەخشن. بە قسەی بارکەر: "دیموکراسی فیکر و ئیرادەی خەڵك زیاد دەکات، داوای یارمەتیان لێدەکات و لەو ڕێگەیەوە وەکو کەسێك یارمەتیان دەدات بۆ پەرەپێدانی تواناکانیان"[١٢] لە هیچ فۆرمێکی دیکەی حکومەتدا، خۆدروستکردن، هێندەی فۆرمی حکومەتی دیموکراسی ئاسان نییە. بەڕای لۆرانس لۆویل "هەمیشە باشترین حکومەت ئەو حکومەتەیە کە خەڵك لە بواری ئەخلاقی و ڕاست و دروستی و هەوڵ و کۆشش و پشت بە خۆبەستندا، بەشێوەیەکی تۆکمە پەروەردە بکات" و بەبێ دوودڵی دیموکراسی هەموو ئەم کارانە دەکات.

**٩-دیموکراسی حکومەتی پسپۆران و نوێنەرانی خەڵکە:**

کارایی بە تەنیا بەس نییە. حکومەتی پسپۆران زیهن گومڕا دەکات و ڕەواج بە جۆرە بیر و بۆچوونێکی نەگۆڕ و لە قاڵبدراو دەدات لای کاربەدەستانی حکومەت. حکومەتە دیکتاتۆریی و پاشایی و ئەرستۆکراتەکان، پشت بە پسپۆران دەبەستن کە بە دژواریی ئاگایان لە پێویستیەکانی خەڵکە و هیچ هەوڵێك نادەن بۆ ئەوەی بزانن خەڵك چۆن بیر دەکەنەوە. لە لایەکی دیکەوە، دیموکراسی دەتوانێ لە ڕووی پسپۆڕییەوە سوود لە پسپۆران وەربگرێ، ئەگەرچی بڕیاری کۆتایی لە ئەستۆی نوێنەرانی خەڵکدایە. کارمەندانی وڵات لە ژێر چاودێریی ئەو وەزیرانەدا کاردەکەن کە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراون. ئەم بارودۆخە توانای خەڵك زیاد دەکات بۆ سوود وەرگرتن لە خزمەتگوزاریی پسپۆران بەڵام بڕیاری کۆتایی بەدەست ئەو وەزیرانەیە کە خەڵك هەڵیانبژاردوون و ڕای خەڵك دەزانن. لەو حاڵەتەدا پەیوەندییەکی بەهادار لە نێوان

حکومەت و خەڵکدا دێتە ئاراوە. لە ڕاستیدا، حکومەتی خۆماڵی هەزاران جار لە حکومەتێکی باش و کارامە باشترە کە ڕەگەزی نوێنەرایەتی تێدا نییە.

١٠-فێرکردنی هاووڵاتیان:

ئەلێکسی دوتوکویل، بیریاری بەناوبانگی فەرەنسی، تەئکیدی لەوە دەکردەوە کە یەکێك لە گرنگترین ئیمتیازەکانی دیموکراسی ئەوەیە کە وەکو قوتابخانەیەکی فێرکردن کار بۆ هاووڵاتیان دەکات. دیموکراسی مافی دەنگدان و ناڕەزایی دەربڕین لە هەڵبژاردن دابین دەکات و بەکارهێنانی ڕاست و دروستی مافی دەنگدان و ناڕەزایی دەربڕین لە هەڵبژاردن فێری هاووڵاتیان دەکات. ئەم جۆرە دەرفەتە هیچ فۆرمێکی دیکە لە حکومەت فەراهەمی ناکات. گیتیل *Gettell* نووسیوویەتی "گرنگترین باشی هەر فۆرمێك لە حکومەت، بریتییە لە زیادکردنی فەزڵ و هێزی هۆشمەندی خودی خەڵك و یەکەم تێبینی لە بڕیارداندا سەبارەت بە سیفەتە باش و شایستەکانی شێوەیەکی دیاریکراوی حکومەت ئەوەیە کە تا چ ڕادەیەك دەیەوێ تایبەتمەندیی فیکریی و ئەخلاقی لە هاووڵاتیاندا دروست بکات".

١١-فۆرمی شیاوی حکومەت:

دیموکراسی لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە هیچ کەسێ لە هەڵە بێبەریی نییە و ئەگەری ئەوە هەیە هەموو کەس هەڵە بکات؛ بە هەمان شێوە کەس ناتوانێ ئیدیعای ئەوە بکات کە بێخەوشە. دیموکراسی ڕەوتی دیالۆگ و ڕەخنە قبوڵ دەکات. کارل پۆپەر وتوویەتی "بۆچوونی مەعقول هاوشانی ئەو بیروبۆچوونەیە کە هەموو کەسێ قابیلی هەڵەکردنە و بە ڕەخنەی کەسانی دی دەتوانێ پەی بەوە بەرێت. بەم پێیە، نابێ هیچ کەسێ داوەری خۆی بێت" ڕەوتی بەردەوامی دیالۆگ و وردبینی وەکو ریفۆرمسازێکی پێویست بۆ ڕێگرتن لە خراپ بەکارهێنانی دەسەلات یان ڕێگرتن لە بەهەڵەداچوون لە داوەرییدا بەکاردێت و تەئکید لە خەسڵەتی عاقڵانەی حکومەتی دیموکراتیك دەکاتەوە.

١٢-ڕێزنەگرتن لە دەسەلات:

وەك ئایڤەر باوەڕی وایە کە دیموکراسی پەیوەندیی بە سایکۆلۆجیای دەسەلاتەوە نییە. دیموکراسی چاودێریی هەمەلایەنە پەسەند دەکات و نایەڵێت هەستی دەسەلاتخوازیی لای چینی فەرمانڕەوا برەو پەیدا بکات. لە دیموکراسیدا حکومەت دەستێکی ئەمینە، هەر بۆیە، چینی فەرمانڕەوا تووشی کەڵکەڵەی ئەوە نابێت دەسەلات پیرۆز بکات و ڕێزی لێبنێ.

دەتوانرێ ئەو ئەنجامە بەدەست بهێنرێ کە دیموکراسی پارێزەری مافەکانی خەڵکە، پاڵنەری گەشەکردنی فیکریانە، بریتییە لە ڕێگرتن لە خراپ بەکارهێنانی دەسەلات و بانگەواز بۆ چاخێکی نەگۆڕ، بریتییە لە ئەمن و ئاسایش و خۆشگوزەرانی لە ڕووی ئابوورییەوە.

## ٥-کەم و کورتیەکانی دیموکراسی

لەگەڵ ئەوەشدا کەوا دێتە بەرچاو توانا و کارابیەکانی دیموکراسی تەواو پڕ بایەخە و مەیلی تایبەتی بۆ حکومەتی دیموکراسی لە جیهاندا لە فۆرمی حکومەتەکانی دیکە لەپێشتر و باڵاتری دادەنێ، بەڵام لە ڕەخنە بەدەرنییە. لە خوارەوە لە هەندێ لە کەم و کورتیەکانی دیموکراسی دەکۆڵینەوە:

١-حوکمرانی نەزانین:

ئەرستۆ باوکی زانستی سیاسەت، دیموکراسی وەکو شێوەیەکی گەندەڵ و گومڕای حکومەت و

جۆرێك لە حوكمڕانی خەڵكی نەزان مەحكوم كرد. ئەفلاتونیش مامۆستای ئەرستۆ دیموكراسی بە حوكمڕانی نەزانین ناوبرد. لیكی *Lecky*، ئاوا وەسفی دیموكراسی دەكات "حكومەتی هەژارترین و نەزانترین و بێتواناترین كەسانێكە كە زۆر زیادیشن".

لە دیموكراسیدا دەنگەكان دەژمێرن نەك ئەوەی هەڵیانسەنگێنن. زۆرینە لە كۆبوونەوە و دەزگاكانی داوەریی و كابینەكاندا بەشێوەیەك بڕیار دەدەن كە رەنگە هۆشمەندان ببن بە كەمینە و بخرێنە كەنارەوە و گێلەكان كارەكان بەڕێوەبەرن. ئەوساش، نوێنەرە هەڵبژێردراوەكانی خەڵك، خاوەن پیشەیەكی بێدەسەلات و بێئەزموونن. شارەزایی بەڕێوەبردن و هوشیارییەكی پراكتیكیان نییە.

**٢-داواكردنی سەروەت و سامان:**

زۆربەی دیموكراسیە نوێكان سەرمایەدارین. ئەم دیموكراسیانە پشتیوانیی لە چینە خاوەن سامانەكان دەكەن. دەنگی كالایی قابیلی فرۆشتنە و ئەوەی زیادكردنی بۆ دەردەچێت دەتوانێت بیكرێت. بە ئاشكرا كۆمەڵێ دەوڵەمەند و بازرگان یان سەرمایەدارە گەورەكان دەیكڕن و لە كۆتاییدا حكومەتەكان دەخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئەمانە چاپەمەنی و تریبیونەكان بەكاردەهێنن بۆئەوەی بۆ ئەو سیاسەتانەی خۆیان دەیانەوێ پشتیوانیان بەدەست بێنن. حزبە سیاسیەكان بە پارەی ئەمان كاردەكەن. زۆربەی سیاسەتمەداران ئامرازێكی گونجاون بەدەست دەوڵەمەندەكانەوە. بریس ئاماژەی بۆ ئەنجامی زیانبەخشی "دەسەلاتی پارە لە سیاسەت"دا كردووەو تەئكیدی لەوە كردۆتەوە كە پارە ڕێ لە كاری دەسەلاتی جێبەجێكردن و یاسادانان دەگرێ و دیموكراسی گەندەڵ دەكات. ماركسستەكان، دیموكراسی ئەمریكایان ناوناوە "دیموكراسی پەرستنی دۆلار" لینین دەربارەی مافی دەنگدانی دیموكراسی سەرمایەداریی وتوویەتی "لە كۆمەڵگای چینایەتیدا، مافی دەنگدان سەرابێكە و سەرچاوەیەكی ناواقیعییە، ئەوەی واقیعە و هەیە، پارەو سەرمایەیە، بە واتایەكی دیكە، لە دیموكراسیدا شێوەی سیستمی سیاسی دیموكراتیە بەلام ناوەڕۆكەكەی بریتییە لە حكومەتی دەوڵەمەند و سەرمایەداران" بە باوەڕی ماركسیستەكان، دیموكراسی راستەقینە تەنها لە جێگایەك دەخەملێ كە سەرمایەداریی لەناوچووبێ و نایەكسانیی نێوان سەرمایەداران و هەژاران گەیشتبێتە كەمترین ڕادە.

**٣-نەبوونی حكومەتی زۆرینە:**

رەخنەگران لە دیموكراسی باوەڕیان وایە دیموكراسی چیتر حكومەتی زۆرینە نییە. جاری وایە ژمارەی ئەو دەنگانەی كە حزبی دەسەلاتدار بەدەستیان دەهێنێ لە ژمارەی دەنگەكانی حزبی ئۆپۆزسیون كەمترە. بۆ نموونە، حزبی كار-ی بەریتانیا، كە لە راپرسی دوای جەنگی جیهانیدا سەركەوتنی بەدەست هێنا، لە حزبی پارێزگاران زیاتری دەنگ نەهێنا. لەبەرئەوە رەنگە دیموكراسی هەمیشە حكومەتی زۆرینە نەبێت.

جگە لەمەش، دەسەلاتی عەمەلی چەند بەرپرسێك بۆ خۆیانی قۆرغ دەكەن كە "فەرماندەی بالا" و "كۆمیتەی حزبی" یان مەكتەبی سیاسی حزب پێكدەهێنن، لە كاتێكدا كە باقی ئەندامەكانی تری حزب تەنها بەشوێنپێی ئەواندا دەڕۆن. كارلایل، دیموكراسی بە حكومەتی "هەلپەرستان و فێڵبازەكان" ناودەبات. گۆدوین دیموكراسی بە "حكومەتی دیماگۆگی و مشەخۆر و سەرۆكی حزبەكان" ناو دەبات. رەخنەگرێك لە دیموكراسی، دیموكراسی وەكو "حكومەتی سیاسەتمەداران،

لەلایەن سیاسەتمەدارانەوە بۆ سیاسەتمەداران" وەسف دەکات. بە باوەڕی ڕۆبەرت میشیلز، کار و دەزگا حزبییەکان پەیڕەویی لە (یاسای ئاسنینی ئولیگاریش) دەکەن. میشیلز کە لە پێشڕەوانی کۆمەڵناسیی سیاسییە، لە خوێندنەوە بەناوبانگەکەی خۆیدا بۆ سیاسەتی ناوەوەی حزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا و حزبە سیاسیەکان، دەستەواژەی "یاسای ئاسنینی ئولیگاریشی" بەکارهێناوە. ئەم دەستەواژەیە بەشێکە لە بیری گشتی میشیلز کە هەموو گروپە ڕێکخراوەکان، ئایا دەوڵەت یان حزبی سیاسی، سەندیکای بازرگانی یان هەرچییەك بن، بەشێوەیەکی زاتی بەناو دیموکراسی دەزانێ. بەڵگەی میشیلز ئەوەیە کە بۆ ئیشی کاریگەر لە کۆمەڵدا ڕێکخراو پێویستە، ڕێکخراو بە ناچاریی پێویستی بە بیرۆکراسییە و بیرۆکراسیش دەسەڵات لە دەستی چەند کەسێکدا لە سەرەوەی هەرەمی دەسەڵاتدا کۆدەکاتەوە. بەڕای ئەو "دیموکراسی بەبێ ڕێکخراو قابیلی وێناکردن نییە" و بەم پێیە، ئەو داوایانەی حەز بە ئۆلیگاریشی دەکەن لە دیموکراسیدا وجودی هەیە. هەروەها دەربارەی پەیوەندیی نێوان دیموکراسی و ڕێکخراو نووسیویەتی "ئەو چینەی کە لە بەرامبەر کۆمەڵدا ئاڵای پڕوپاگەندە تایبەتیەکانی خۆی بەرز دەکاتەوە و سوورە لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵێ لە جیهانبینی یان ئەندێشەکانی خۆی بیگەیەنێتە قۆناغی بەدیهاتن کە لە کردەوە ئابوورییەکانی ئەو چینەوە سەرچاوە دەگرێ، بە ناچاری پێویستی بە ڕێکخراوێکە. بەدەر لەوەی کە پروپاگەندە ئابووریی یان سیاسیەکان لە ئارادابن. ڕێکخراو وەکو تاکە وەسیلەیەك دێتە بەرچاو کە دەتوانێت ببێتە بەدیهێنەری خواست و ئامانجێکی دەستەجەمعی. لەوێوە کە ئەو خواستە دەستەجەمعییە لەسەر بنەمای بەکارهێنانی خەرجی کەمتر وەستاوە یان بەدەربڕینێك قسە سەبارەت بە دەست پێوەگرتن لە ئارادایە، ڕێکخراوەکە وەکو چەکێ لە دەستی هەژارەکاندایە کە بۆ خەبات لە دژی دەوڵەمەندەکان بەکاردێت"(١٣)

بەم پێیە ئەو کەسانەی کە لەناو ڕێکخراوەکەدا دەسەڵاتیان هەیە، حکومەت بەڕێوەدەبەن و لە هەلومەرجێکی ئاوادا قسە لەسەر حکومەتی زۆرینە بێهودەیە.

**٤-گومان سەبارەت بە بنەمای نوێنەرایەتی لە دیموکراسیدا:**

دیموکراسی باوەڕی بەهەڵبژاردنی نوێنەر هەیە لەسەر بنەمای دابەشکردنی وڵات بۆ چەند ناوچەیەك. باوەڕ وایە کە ئەو ئەندامی پەرلەمانەی کە لە بازنەیەکی تایبەتی هەڵبژاردندا هەڵبژێردراوە، نوێنەری هەموو یان زۆرینەی دەنگدەرانی ئەو بازنەیەیە، بەڵام بەلای ئەو نوێنەرەوە ئەوە کاری کردە نییە کە ئەو بە کردەوە نوێنەری هەموان بێ لە هەموو مەسەلەکاندا، لە باشترین حاڵەتدا تەنها دەتوانێ نوێنەری پیشەکەی خۆی یان هی چینەکەی خۆی بێت. مافناسێك چۆن دەتوانێت نوێنەری مامۆستایان و ئاسنگەران یان پێڵاوفرۆشان بێت. دەتوانرێ ئەوە قبوڵ بکرێ کە لە هەندێ لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتییدا، ئەو کەسە نوێنەری ئەمانەیە، بەڵام ئایا دەتوانێت لە هەموو مەسەلەکاندا نوێنەریان بێت؟ هەر بۆیە وتویانە نوێنەرایەتی وەزیفی دەبێ جێگەی نوێنەرایەتی لەسەر بنەمای دابەشکردنی وڵات بگرێتەوە و لە جیاتی پەرلەمان، دەبێ ژمارەیەك لەو نوێنەرانە هەبن، کە هەریەکەیان سەروکارییان لەگەڵ لایەنێکی تایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەبێ، بەم پێیە تەنها نوێنەرایەتی وەزیفی ڕاستەقینە و دیموکراسییە.

**٥-خراپ بەکارهێنانی پرانسیپی یەکسانی:**

لە دیموکراسیدا یەکسانیی زۆر تەئکیدی لەسەر دەکرێتەوە و لەسەر ئەو گریمانە درۆینە بنیات نراوە کە هەموو ئینسانەکان لە ئامادەییدا بۆ بەشداری کردن لە حکومەتدا، هەرچەندەش بەهای واقیعییان توانای زیهنیان هەبێ، یەکسانن. هەر بۆیە، مافی دەنگدان بەهەمووان دراوە و لە دیاریکردنی سیاسەتەکانی حکومەت یان هەڵبژاردنی کاربەدەستاندا رای کەس زیاتر لەوی تر بەهای نییە. ئەم جۆرە یەکسانییە لە رووی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەوە چارەنووسسازە، چونکە بایەخنەدان بە فێرکردن و زانستی پسپۆڕیی، دیموکراسی دەکات بە حکومەتی نەزان و نەشارەزاو بێتواناکان.

**٦-فێرکردنی درۆینە:**

رەخنەگران لە دیموکراسی دەڵێن دیموکراسی دەبێتە هۆی فێرکردنێکی مەدەنی ناڕاست. ململانێکانی هەڵبژاردن زۆربەیان ساختەن. راستیەکان زیادەرەوییان تێدا دەکرێ یان زۆر جار دەشێوێنرێن. دەنگدەران بە دەگمەن وێنەیەکی راست سەبارەت بە بەرنامەی حزب و سیفەتەکانی ئەو رێبەرەی داوای پلەیەك دەکات لە دەزگای یاسادانان یان کابینەدا، بە دەست دەهێنن. لە ڕاستیدا، دیماگۆگیە زیرەکەکان کە بە قسەی جوان و پڕ زرینگانەوە، بەڵام زۆر جار بێماناو بێبنەما، خەڵك بۆ دەنگدانی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ بەم حزب و بەو حزب بانگهێشت دەکەن، ئەو خەڵکە هەڵدەخەڵەتێنن. بە هەمان شێوە، لەناو ئەو خەڵکەدا هەستێکی درۆینە سەبارەت بە یەکسانی و هەڵەی زەین دەهێننە ئاراوە کە بۆ حکوم کردنی وڵات وەکو هەموو کەسێکی دیکە گونجاون.

**٧-بەرگرتن لە پێشکەوتنی زانستی و هونەری و ئەدەبی:**

خەڵك کە بەشێوەیەکی گشتیی روانینێکی موحافیزەکارانەیان هەیە، دژی پێشکەوتنی وڵاتن لە رووی زانستەوە. خەڵك زۆر بە دەگمەن گوێ بە پەرەپێدانی پەیوەندیەکان و هونەر و تەلارسازیی دەدەن. بەڕای بورنس "هەر مەدەنیەتێ کە دیموکراسی دەخوڵقێنێ بێبایەخ و ناوەنجی و لێڵ و تاریکە".

**٨-دو دڵی لە بەهای ئەخلاقی دیموکراسیدا:**

دیموکراسی لە ڕووی ئەخلاقیەوە خەڵك مایە پوچ دەکات. ئەو ململانێ پڕ تەزویر و بوختان ئامێزەی کە حزبە سیاسیەکان دەیکەن نەك تەنها مەسەلەکان بێبایەخ دەکات، بەڵکو گەندەڵیش زیاد دەکات. دیموکراسی وا لە ڕێبەران دەکات کە پرانسیپ یان مەرامی ئەخلاقی لەدەستبدەن و خەڵکیش دەکات بە مرۆڤی ئامێریی دەزگای بەڕێوەبەریش گەندەڵ دەبێ. بریس لە فەسڵێ لە نووسینەکەیدا بە ناونیشانی "دەسەڵاتی پارە لە سیاسەت"دا دەربارەی کاریگەریی گەندەڵی ئامێزی پارە لە دیموکراسیدا لەسەر دەنگدەران و یاسا دانەران و کاربەدەستە ئیداریەکان و حاکمەکانیش باسێکی دوور و درێژی هەیە.

**٩-دژایەتی تاکێتی و ئازادی:**

دیموکراسی ڕێگای ئازادی بیرکردنەوە دەگرێ و عەقڵ بەزایە دەدات. لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا بیریاری راستەقینە گاڵتەی پێدەکرێ یان نادیدە دەگیرێ. سوکرات لەسەر داوای پێڵاودرووییەك دادگایی کراو ناچار کرا ژەهر "شەوکەران" بخواتەوە و "چەرم بەسەر زانستدا سەرکەوت" هندۆسێکی رەگەزپەرست کە لەگەڵ بەرنامەکانی گاندیدا نەبوو لە دژی رەگەزپەرستی ئەم پیاوەی تیرۆر کرد. بەم

پێیە دیارە کە جەماوەر یان خەڵك ئەو کەسانەیان خۆشناوێ کە پابەندی پرانسیپن. هەتا ئەگەر کەسێك بیەوێ سوود لە حزب وەرگرێ دەبێ شووناسی خۆی لەو حزبەدا بتوێنێتەوە.

**١٠-بالادەستیی بەرژەوەندیی ناوچەیی بەسەر بەرژەوەندیی نیشتمانیدا:**

هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات و پشتیوانیی، بەشێوەیەکی گشتی چەند زیانێ بە خۆشگوزەرانی میللەت دەگەیەنێ. نوێنەرەکان لە پێناوی دابینکردنی زۆربەی بەرژەوەندییەکاندا بۆ بازنەی هەڵبژاردنەکەی خۆیان لەگەڵ یەکتریدا ململانێ دەکەن، بەم پێیە بەرژەوەندی گشتیی و هاوبەشی میللەت لەبەرخاتری بەدەستهێنانی ئیمتیازی ناوچەیی نادیدە دەگیرێ.

**١١-خەرجی زۆر و زەوەندی حکومەت:**

وتراوە کە دیموکراسی پڕ خەرجیترین شێوەی حکومەتە. پارەیەکی زۆر بۆ بانگەشە و بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن خەرج دەکرێ. لە وڵاتێکی دەوڵەمەندی وەکو ئەمریکادا، ملیۆنەها دۆلار لە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆمار و ئەنجومەنی پیراندا خەرج دەکرێ. لە وڵاتە تازە پێگەیشتوو و هەژارەکانیشدا بارودۆخەکە بە هەمان شێوەیە. ئەو پارە زۆرەی کە بۆ هەڵبژاردن و نوێنەرەکان خەرج دەکرێ دەتوانرێ باشتر سوودی لێوەربگیرێ و لە بواری بەرهەمهێنانی نیشتمانیدا سەرمایەگوزاری بکرێ.

**١٢-دژایەتی کردنی کامڵ بوون:**

وتراوە کە دیموکراسی هیولایەکی بایۆلۆژییە. هەرچەندە گەشە بکات زیاتر چڕ دەبێتەوە و ڕێ لە کامڵبوونی هەمەلایەنە دەگرێ. سیستمێکی دەماری ناوەندیی نییە. لە بوونەوەری زیندوودا، مێشك شوێنێکی دیاریکراوی هەیە. لە دیموکراسیدا مێشك لە هەموو جێگایەکدا هەیە. مەبەست لەوەیە کە جڵەوی حکومەت نابێ بە دەست هەمووانەوە بێت و دەبێت بە کۆمەڵێ کەسی هۆشیار بسپێردرێ کە توانای بیرکردنەوەو بەرنامەڕێژیان هەیە. دیموکراسی بە خەڵکانێك دەسپێردرێ کە نائاگان و دەسەلاتی سیاسیان نییە. لەم ڕووەوە دیموکراسی دەبێ بە ڕێبازی کەسانی بێدەسەلات.

ڕێبازی بایۆلۆژی بۆ سیستمی دیموکراسی خاسیەتێکی نازانستی دیاری دەکات. لایەنگرانی ئەم ڕێبازە جیاوازییە زیهنی و ئەخلاقیەکانی خەڵك وا لێك دەدەنەوە کە لە بۆماوەوە سەرچاوە دەگرێ و باوەڕیان وایە نابەرابەریی کۆمەلایەتی و ئابووریی و ڕەنگدانەوەی جیاوازیی سروشتیی تواناکانە. وەك دوگال وتویەتی "توانای گەشەکردنی زیهنی و فیکری، سیفەتێکی بۆماوەیە و پەیوەندیەکی نزیکی بە پێگەی کۆمەلایەتیەوە هەیە" بە پێی ئەم بۆچوونە نابێ هەموو کەسێ بە یەکسان ببینرێ و لە بواری سیاسەتدا یەك پێگەی یەکسان بۆ هەمووان قبوڵ بکرێ. مافی هەموان بۆ دەنگدان، بەچاوپۆشی لەنابەرامبەریی کۆمەلایەتی و ئابووری، ڕەنگدانەوەی بەرابەریی هەموانە.

**١٣-حوکمڕانیی هەمووان:**

دیموکراسی حوکمڕانیی هەمووانە. لە دیموکراسیدا سەبارەت بە مەسەلە جۆراوجۆرەکان بە دەنگی زۆرینە بڕیار دەدرێ. کابینە و دەزگاکانی دادوەریی و دادگاکان بە دەنگی زۆرینە بڕیار دەدەن. حزبە سیاسیەکانیش لە کۆمەڵە خەڵکێ پێکهاتوون کە بەدەنگی زۆرینە بڕیار دەدەن. ئەو کەسانەی کە لە گروپێکدا دەنگ دەدەن یان دەنگ بە گروپێك دەدەن تایبەتمەندییە راستەقینەکانی خۆیان لە دەست دەدەن و خۆیان لە گروپەکەدا دەتوێننەوە.

**١٤-ناسەقامگیریی حكومەت:**

دیموكراسی تا كاتێ سەقامگیره كه هەمووان لەگەڵیدا بن. زیهنی له پێش بینی هەمووان رەنگه له هەر كاتێكدا له دژی حكومەت راپەڕێ و لەسەر تەختی دەسەڵات لایبەرێ. به تایبەتی لەو وڵاتانەدا كه سیستمی فره حزبیان تێدایه، حكومەت، به خێرایی دەگۆڕێ. وتراوه " فەرەنسیەكان به هەمان شێوه كه زوو به زوو كراس دەگۆڕن، وەزیر دەگۆڕن" ماوەی ناوەنجی تەمەنی وەزارەتێ له فەرەنسا تەنها نۆ مانگه. هێنری ماین باوەڕی وا بوو لەو كاتەوه كه دیموكراسی پەیدا بووه، هەموو فۆرمەكانی حكومەت له جاران ناسەقامگیرترن.

**١٥-هاندانی ململانێی چینایەتی:**

كاتێ دەوڵەمەندەكان له بەرامبەر هەژاران و بێنەوایاندا بن، هەڵبژاردن دەبەنەوه. كاتێكیش له دەسەڵاتدابن چەند یاسایەك پەسەند دەكەن كه به قازانجی سامان كۆكردنەوه بێت. ئەم رەفتارەی به قازانجی چینی سەرمایەداران رەواج به مەسەلەكان دەدات ململانێی چینایەتی توند دەكات و نەهامەتیەكانی ژیانی هەژاران زیاتر دەكات. دیموكراسی تۆوی ناڕەزایی له نێو جەماوەری هەژاراندا دەچینێ و رەنگه ئەم ناڕەزاییه ببێته هۆی بەرپاكردنی شۆڕش.

**١٦-خراپەی سیاسەتی حیزبی:**

حیزبه سیاسیەكان بۆ دیموكراسی پێویستن. بەڵام لەگەڵ بێبەشكردنی ئەو كەسانەدا كه توانایان هەیه له گەیشتن به پلەوپایه سەرەكیەكانی وڵات و به دانانی ئەندامانی حزب لەو پلەو پایانەدا هەتا ئەگەر باری ئابووریيان مامناوەندیش بێت. ڕۆڵێكی خراپ دەگێڕن. ئەم كارانه كه وەكو لەكەی خەوش بەسەر ناوی دیموكراسیەوه به شێوەیەكی فراوان ئیدانه كراوه دەبێته هۆی لەناوچوونی سیستمەكه.

بەرای بریس، حزبه سیاسیەكان رەواج به پووچیی‌و ریاكاریی دەدەن و پێوەره ئاكارییەكان لەناودەبەن. میشیلز باوەڕی وابوو كه حیزبەكان یاسای ئاسنینی ئۆلیگارشی (دارایی) به پێویست دەزانن، واته ڕێبەران بڕیار دەدەن و ئەندامانی حزب به ئاسانی تەسلیم دەبن. ئەم جۆره به ئامرازبوونەی جەماوەر له بەرامبەر ڕێبەراندا، دیموكراسی بەرەو گاڵتەجاڕیی دەبات. بانگەشەی هەڵبژاردن خەڵك گومڕادەكا. گیانی حیزبایەتی كوێرانه رەواجی پێدەدرێ و بەرژەوەندییه نیشتمانیەكان زیانیان بەردەكەوێ. دەنگدەران ناچارن له نێوان دوو یان چەند كاندیدێكدا هەڵبژێرن، كه رەنگه ساختەچی یان گێل بن یان له بنەڕەتدا نەشیانناسن. لەم رووەوه دەنگدان دەبێته شتێكی میكانیكی یان ڕەتدەكرێتەوه. بەباوەڕی هەندێ كەس، دیموكراسی شێوه حكومەتێكه كه تیایدا مافی هەڵبژاردنی شوان به مەڕەكان دەدرێ، بەڵام مەڕەكان هەر به مەڕیی دەمێننەوه.

**١٧-ئاڵۆزبوونی بڕیاردان:**

دیموكراسی باوەڕی به جیاكردنەوەی هەرسێ دەسەڵاتەكەی حكومەت هەیه، واته(یاسادانان، جێبەجێكردن، داوەریی) ئەمەش دەبێته هۆی ئاڵۆزی و دواكەوتنی ناپێویست له بڕیارداندا. هەركاتێ بۆ بەدەست هێنانی بڕیارێك راوێژ به ویستی جۆراوجۆر بكرێ، رەوتی بڕیاردان دوورودرێژ دەبێ. لەلایەكی ترەوه، له دیكتاتۆریەتدا، لەبەرئەوەی یەك دەسەڵات هەیه، لەم رووەوه به زوویی بڕیاردەدرێ.

بریس كه توێژینەوەی كۆمەڵایەتی سەبارەت به كارایی شێوازەكانی دیموكراسی جیهان كردووه، كەموكورتیه سەرەكیەكانی دیموكراسیی لەم خاڵانەدا كورت كردۆتەوه:

١–دەسەڵاتی پارە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم کارکردنی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردندا.
٢–مەیلێك هەیە کە سیاسەت دەکات بە پیشەیەکی بەسوود.
٣–زیادەڕەویی لە گوێدان بە پرانسیپەکانی بەڕێوەبردندا دەکرێ.
٤–بیری یەکسانیی خراپ بەکاردەهێنرێ و ڕێز لە بەهاکانی پەیوەست بە شارەزایی بەڕێوەبردن ناگیرێ.
٥–حزب دەسەڵاتێکی ناپێویست پەیدادەکات.
٦–نوێنەران لە دەزگای یاساداناندا و کاربەدەستانی سیاسی لە دەزگای جێبەجێکردندا لە پەسەندکردنی یاساکان گەمە بە دەنگەکان دەکەن و لە بەرامبەر تێکچوونی نەزمدا نەرمونیانی دەنوێنن[١٤].

لێکۆڵینەوەی شیکاریی کەموکورتیەکانی دیموکراسی قەناعەت بە مرۆڤ دەکات کە دیموکراسی هێشتا کامڵ نەبووەو ئەوەی نیشان نەداوە کە دەرمانی هەموو دەردەکانە. دیموکراسی نەیتوانیووە هەستی هاودەردی لەنێو خەڵکدا پەرەپێبدات، نابەرابەریی لەنێوان (دەوڵەمەند) و (هەژار)دا کە جێی داخە لەناوبەرێ و سیاسەت لە پیسیەکان خاوێن بکاتەوە. زۆر بەخاوی کاردەکات و لەڕێگای کارکردن گرەنتی ململانێ خێراکانی سەردەمی ئامێرو سەردەمی دەسەڵاتی ئەتۆمی نییەو زانیاری گشتی پێویست نییە. بەڵام ئەو پرسیارەش دەکرێ کە ئایا ئەڵتەرناتیڤێکی باشتر هەیە؟ جیهان شێوەی دیکەی حکومەتی تاقی کردۆتەوەو هەموویان کەموکورتیان هەیە. حکومەتە پاشاییو ئەرستۆکراتیو دیکتاتۆرییەکان و ڕژێمە فاشستەکان بۆ بەرژەوەندی خەڵك زۆر زیان بەخشبوون. ئازادییە تاکەکەسیەکان پێی پاشا زۆردارو دیکتاتۆرە ستەمکارەکانی ڕاکێشاوە. بەم پێیە، ئەو خەڵکەی جیهان کە هەڵگری خەون و خەیاڵ بوون و لێی بێبەش بوون لەبەرئەوەی دیموکراسی ڕوانگەیەکی باشترو چەند پرشنگێکی هیوا دەبەخشێ برەویان پێدەدا.

ئەگەر نەتوانی بەهەشت بەدەست بێنی، کارێکی گێلانەیە ئەگەر بۆ ڕزگار بوون لە دۆزەخ هەوڵنەدەی. بێڕەحمیەکانی هیتلەر لە ئەڵمانیاو مەیلی فراوانخوازیی نازی و فاشیستەکانی ئەڵمانیاو ئیتالیا، ستەمکارییو تاوانە حکومیەکان لە شوێنانی دیکە، مرۆڤ دەگەیەنێ بەو ئامانجەی کە دیموکراسی وێڕای هەموو بێتوانایی و کەموکورتیەکانی، شێوەیەکی زۆر باشترە لە حکومەتی دیکتاتۆری، فاشستی، عەسکەرتاری یان پاشایی زۆردار. بەڵام کاری سەرکەوتووانەی لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بەشێوەیەکی گونجاو پێویستی بە چەند سەرەتایەکی دیاریکراو هەیە، کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوەوە.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ ڕەخنەگران لە دیموکراسی بکرێ بە چوارگروپەوە:
١–لایەنگرانی حکومەتی پاشایی ڕەها یان ئەو ئەرستوکراتانەی کە زۆر حەزیان لە دیموکراسی نییە.
٢–لیبراله میانڕەوەکان کە لە زیادەڕەوییەکانی دیموکراسی و ئەگەری بێئارامی دیموکراسی و هەوڵدانی لەبەرقەرارکردنی یەکپارچەیی و یەکڕیتمی کۆمەڵایەتی نیگەرانن.
٣–ئەو سوسیالیستانە کە دیموکراسی تەنها بە قبوڵکردنی لایەنە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان پەسەند دەکەن.

٤-ئەو فاشستانە لەبەر ناکارایی پڕ خاوەخاو، کات بەفیڕۆدان و دوودڵبون و نەبوونی ڕێباز ڕقیان لە دیموکراسییە.

هیچ کەسێ ئیدیعای ئەوە ناکات کە دیموکراسی کەموکورتی نییە. لەم بارەیەوە بورنس وتویەتی: "کەس نکوڵی لەوە ناکات کە ئەنجومەنەکانی یاسادانان کەموکورتیان هەیە، بەڵام ئەگەر ئوتومبیلێ باش کارنەکات کارێکی ژیرانە نییە پەنا بۆ عەرەبانە ببرێ." تەنها چارەسەری نەخۆشیەکانی دیموکراسی، دیموکراسی زیاترە. دەتوانرێ ئەوە ببینرێ کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، دیموکراسی متمانە و ڕێزێکی زیاتری بەدەستهێناوە. نەك تەنها ئەو دەوڵەتانەی کە تازە سەربەخۆییان بەدەست هێنابوو جۆرێك شێوەی حکومەتی دیموکراتیان قبوڵ کرد. بەڵکو هەتا ئەو حکومەتانەی کە دیموکرات نین، پێیان خۆشە کە بە دیموکرات بناسرێن دیموکراسی بەو شێوەیەی کە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا پیادەدەکرێ، پێویستی بە دوبارە بیرلێکردنەوەی بنەڕەتی هەیە بۆئەوەی کەموکورتیەکانی نەمێنێ کە لە وڵاتە دیموکراتەکاندا لە نابەرابەریی کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەوە سەرچاوەی گرتووە.

## ٦-هەلومەرجەکانی سەرکەوتنی دیموکراسی

بونی پوراساد، دوای لێکۆڵینەوەی وردی هەموو ئەو بەڵگە مێژووییانەی لەبەردەستدان، گەیشتە ئەو ئەنجامەی: "هێشتا هیچ وڵاتێ نەگەیشتۆتە چەمکی کامڵ و قووڵی دیموکراسی" و دیموکراسی "هێشتا وەکو ئامانجێ ماوەتەوە و نەك ئەوەی بووبێتە شتێکی راستەقینە" هەرکاتێ، لە سەردەمی کۆن و نوێدا، ئەزموونی دیموکراسی دەستی پێکردووە، "لە نێو دەورووبەرێکی خراپدا عەسکەرتاریەت، هەژاریی، نەزانین و ساختەکاریی کۆمەڵایەتی" هەبووە. کەواتە ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی چ هەلومەرجێ پێویستە. دیموکراسی لە کاتێکدا سەرکەوتووانە کاردەکات کە کۆمەڵ ئەم هەلومەرجانەی خوارەوەی تێدابێ:

**١-نەمانی عەسکەرتارییەت:**

دیموکراسی لەو وڵاتانەدا ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات کە بەشێوەیەکی نیسبی لە عەسکەرتارییەت رزگاربووبن. دیموکراسی حوکمڕانی زۆر قبوڵ ناکات و لەسەر بەهاداریی مرۆڤ، تا فراوانترین دەرفەتی شیاوی گەشەکردن و پەرەپێدان، بەم پێیە لەسەر پرانسیپی ئازادی بۆ هەمووان بنیات نراوە. لەلایەکی دیکەوە، عەسکەرتاریەت چڕکردنەوەی دەسەڵاتی لەگەڵدایە و زۆرداریی بە پێویست دەزانێت. بە قسەی پوراساد، عەسکەرتاریەت یەکێکە لە کۆسپە سەرەکیەکانی بەردەمی دیموکراسی و لێرەوە ئاشکرا دەبێت کە بۆچی دیموکراسی زۆر بە دەگمەن لە مێژوودا بەدی هاتووە. پوراساد تەئکید دەکاتەوە هەتا کاتێ عەسکەرتاریەت بەردەوامبێ، هەرگیز دیموکراسی لە مەترسی پارێزراو نابێ، چونکە نەریتی بیرکردنەوە کە دیموکراسی پێویستی پێیەتی لەگەڵ عەسکەرتاریەتدا هاوئاهەنگ نییە کە پێویستی بە فەرمان و ملکەچی هەیە.

**٢-نەمانی نابەرابەریی لە سەروەت و ساماندا:**

دیموکراسی لەو وڵاتانەدا بە ئاسانی پیادە دەبێ کە نەك تەنها لە عەسکەرتاریەت بەدووربن بەڵکو لە زیادەرەویەکانی سەروەت و سامان و هەژاریش ئازادبن، لە وڵاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆری خەڵك هەژار بن و ژمارەیەکی کەمیش دەوڵەمەند،

دەزگا ئازاد و دیموکراتەکان ناتوانن سەرکەوتووانە کاربکەن. هاوولاتی بوونی هوشیارانە و هۆشمەندانە، کە بەبێ ئەوە هیچ دیموکراسیەتێ توانای سەرکەوتنی نییە، تەنها لە جێگایەکدا کاری کردەیە کە تیایدا هاوولاتیان بەشێوەیەکی نیسبی لە گرفتارییەکانی ژیانی ڕۆژانە ئازادبن و بێخەم بن بۆ ئەوەی بتوانن لە کاری گشتیدا بەشداری بکەن، ئەمرۆ توانای ئەوە هەیە کە بەشێوەیەکی وا سەرچاوە زانستی و تەکنەلۆژییەکان بەکاربهێنرێ کە بژێو و دەستبەتاڵیەکی زۆر بۆ هەمووان فەراهەم بێت. ئەگەر کۆمەڵگاکان لەسەر بنەمای بەکارهێنانی زانست و تەکنەلۆژیا و ئاستی ژیانێکی باشتر ڕێکبخرێن بنەمای ئابووریی دیموکراسی زیاتر دادەمەزرێ و هەلومەرجی پێویست بۆ هەمووان فەراهەم دەبێت بۆ ئەوەی پشت بە خۆیان ببەستن و لە کاری بە کۆمەڵدا بەشداری کاریگەر بکەن.

**٣-بەرابەریی کۆمەلایەتی:**

بەرابەریی کۆمەلایەتی پرانسیپێکی دیکەی گرنگ و بنەڕەتییە کە دیموکراسی پێویستی پێیەتی. جیاوازیی چینایەتی و جیاوازیی کۆمەلایەتی نێوان ئەم یان ئەو کەسە، دیموکراسی نابووت دەکات. جیاوازییە زمانی و ناوچەییەکان و پارچە پارچە کردن خۆرەی پرانسیپە ژیانییەکانی دیموکراسین. بەم پێیە بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی دەبێ هەمووان بە دەرفەتی یەکسان و بەبێ هیچ جیاوازییەك بەشداری لە دیموکراسیدا بکەن. یەکسانیی (بەرابەریی) کۆمەلایەتی نابێ تەنیا بەقسە بێ، بەڵکو دەبێ بە کردەوەش هەبێ.

**٤-فێرکردنی بەهاکانی دیموکراتی:**

دیموکراسی باوەڕی بە چەند بەهایەکی وەکو بەهادارێی مرۆڤ، هەڵکردن لەگەڵ بیروڕا جۆراوجۆرەکاندا و بڕیاردان لە ڕێگەی گفتوگۆوە هەیە و جەختیان لێدەکاتەوە. لە هەمووشی گرنگتر، ئەوە ڕاستی باوەڕی یونانیە کۆنەکانە کە فێرکردنی هاوولاتیان دەبێ لەگەڵ شێوەی ژیانیان هاوئاهەنگ بێ. بۆ بەدەستهێنانی ئەم هاوئاهەنگیە پێویستە زیهنە ناکامڵەکان گەشەبکەن، گیانی هاودەردی و ئارامگرتن، نەریتی پێکەوە گونجان و ڕێزگرتن لە هەست و باوەڕی کەسانی دی پەروەردە بکرێ، کە بەبێ ئەمانە کاری کۆمەڵی دیموکرات نەك سەرکەوتوو نابێ بەڕێوەش ناچێ.

**٥-فێرکردنی راست و دروست:**

سەرکەوتنی دیموکراسی نەك تەنها پێویستی بە نەبوونی نەزانینە بەڵکو پێویستی بەوەشە کە بەشێوەیەکی گونجاو هاوولاتیان فێربن. بێئاگایی و نەزانین دەبنە کۆسپ لەبەردەم قبوڵکردنی سووربوونە ڕاست و دروستەکانی زیهندا و بەر بە ریفۆرمە بەرفراوانەکان دەگرێ. ئەگەر زانست پەرەنەسێنێ و بلاونەبێتەوە و لەناوەندی بچووکدا قەتیس بکرێ، ئەگەر جەماوەر لە خەوی غەفلەت و هەڵەدابن هیچ بەرچاو ڕوونیەك بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی لە ئارادا نابێت. بەقسەی پوراساد لە سەردەمی پێش زانست و زانیارییەوە پێستی نەزانین و هەڵە دڕێنراوە، زەمینەی بۆ سیستمە زانستیە پالاوتە و خاوێن خۆش کردووە. ئەوەی کە دەبێ ئەنجام بدرێ ئەوەیە کە دەبێ زانست ببرێتە هەموو ماڵەکانەوە، ڕۆشنبیریی بکرێ بە ڕۆشنبیرییەکی جیهانیی، زیهن پەروەردە بکرێ و خوی سوکرات فێری خەڵك بکرێ.

فێربوون، هێزی بیرکردنەوە تیژ دەکاتەوە و تێگەیشتنی ڕاستی شتەکان دەکات بە کاری کردە. هاوولاتیان دەکات بە چاودێر و هۆشیاریان دەکاتەوە و بۆ ڕەخنەگرتن لە هەنگاوە ناڕاست و زیانبەخشەکانی حکومەت گیانی ئازایەتیان

پێدەبەخشێ. بۆ بەکارهێنانی راست و دروستی مافی دەنگدان توانا بەخەڵك دەبەخشێ. بە قسەی بریس "بەهرەی مافی دەنگدان، ئیرادەی بەکارهێنانی دەخوڵقێنێ.. و بەهرەی زانست، توانای بەکارهێنانی راست و دروستی مافی دەنگدان دەخوڵقێنێ".

**٦-ئازادی ڕۆژنامەگەریی:**

ڕۆژنامەگەریی ئازاد، ئینجیلی دیموکراسییە. خەڵك دەبێ دەستیان بە زانیاری راست و دروست و بێلایەنانە بگات دەربارەی مەسەلە ناوخۆیی و دەرەکیەکان. کاتێ حکومەت چەند سیاسەتێکی گرنگ پیادە بکات بەڵام ئەو سیاسەتانە نەخاتە بەردەم ڕای گشتی، خەڵك تووشی نائومێدی دەبن و هەست بە بێبەشی دەکەن. ڕۆژنامەگەریی ئازاد و بێلایەن نەك تەنها پەیوەندیی خەڵك لەگەڵ چالاکیەکانی حکومەتدا دروست دەکات، بەڵکو سکاڵاو زوڵم کردن لە خەڵکیش دەخاتە ڕوو. لەم ڕێگەیەوە، پەیوەندیی سوودمەندانەی نێوان خەڵك و حکومەت لە ڕێگەی ڕۆژنامەوە بۆ واقیعی بێلان دروست دەبێت و گەشە دەکات.

**٧-هوشیاری هاووڵاتیان:**

هاووڵاتیان دەبێت بە ئاگا و هوشیار بن و لە کاری گشتیدا بەشداری بکەن و یارمەتی کەسانی دیش بدەن لە کاری ڕەواو ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا. هاووڵاتی دەبێ بەوپەڕی نیازپاکیەوە هاوکاریی حکومەت بکات و هەرکاتێ هەست بکات حکومەت بەشێوەیەکی ناڕاست کار دەکات ڕەخنەی لێبگرێ. هوشیاری زاتی بەهای ئازادی و دیموکراسییە، تەنها هاووڵاتیانی هوشیار دەتوانن چاودێرییەکی راست و دروستی کارەکانی حکومەت بکەن. لاسکی *Laski* سەروەختێ وتبووی دیموکراتە نەزان و بێئاگاکان ناتوانن داکۆکی لە دیموکراسی بکەن. ئەمانە کاتێ لە مەترسی سەر ئازادی خۆیان بەئاگادێنەوە کە بۆ ئەنجامدانی لابردنی مەترسیەکە زۆر درەنگ بووە. هەروەها لاسکی هوشیاری کردووینەتەوە کە بۆئەوەی هوشیاری کاریگەربێ، دەبێ ڕێك بخرێ. بەڕای تۆمسون *Thomson* بوونی بیر و وێنای دیموکراتی کە ئیلهام بەخشی کاری جدی هاووڵاتیانە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دیموکراتیەکان، بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی پێویستە.

**٨-ئاکاری بەرز:**

ئاکاری بەرزی خەڵك لە فاکتەرە لەجیابوونەوە نەهاتووەکانی سەرکەوتنی دیموکراسییە. بەبێ بوونی ڕێبەری بەڕێز لەسەر کاروبارەکان، دیموکراسی لەبەردەم شکستدا دەبێت، بەڵام خەڵکیش نابێ گەندەڵی قبوڵ بکەن. ئەوە لە خەڵك چاوەڕێ دەکرێ کە خۆشگوزەرانی گشتی بخەنە پێش بەرژەوەندیی تایبەتی و تاکەکەسیەوە و لەبەر خێرو خۆشی ئایندە دژوارییەکانی ئێستا بە ئارامیەوە تەحەمول بکەن.

**٩- پێکهاتن لەسەر مەسەلە سەرەکیەکان:**

بەشێوەیەکی گشتی بیروڕا وایە کە کاری سەرکەوتوانەی دیموکراسی پەیوەندی بە بوونی ئاگاییەوە هەیە سەبارەت بە مەسەلە هەرە گرنگەکانی کۆمەڵگا. لە دیموکراسیدا ڕێبەران دەتوانن هەموو جۆرە کارێکی باش یان خراپ ئەنجام بدەن، لەم ڕووەوە پێویستە کەسانی خاوەن تێگەیشتنی بەرز و داوەریی راست و دروست، کەسێتی لە هەژان نەهاتوو و هێزی داهێنەر دیاربن. لەم بارەیەوە پێویستە بگوترێ کە خودی ڕەوتی دیموکراتی لە ماوەی درێژخایەندا یارمەتی سەرهەڵدانی جۆرێ راست و دروستی ڕێبەریی دەدات.

**١٠-بەڕێوەبردنی دروست:**

بەڕێوەبردنی دروست یەکێکی ترە لە پێویستیە گرنگەکانی دیموکراسی و بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی پێویستە بە شێوەیەك ئەگەر نەبێ بە دژوارییی دەتوانرێ چاوەڕوانی پشتیوانی لە خەڵك بکرێ. ئەگەر دیموکراسی ئاوێتە بێ بەگەندەڵی و بەڕێوەبردنی خراپ، خەڵك باوەڕیان پێی نامێنێ.

**١١-ملکەچی پسپۆڕان و سوپا:**

لە کاتێکدا کە پسپۆڕانی خاوەن ئەزموون بە ئاشکرا زۆر پێویستن، بەڵام پسپۆڕان دەبێ ملکەچی عەقڵی ساغڵەمی ڕێبەرانی باڵا بن. دەبێ وەکو کارمەندان و کەسانی سوپا رەفتار لەگەڵ پسپۆڕاندا بکرێ. سوپاش نابێ دەستێکی باڵاتری لە وەزیرە مەدەنیەکان هەبێ. دەبێ بە تایبەتی جەخت لەوە بکرێتەوە کە تا زەمانێ کە سوپا ملکەچی دەسەڵاتی مەدەنی و سیاسی نەکات، دیموکراسی ناتوانێ کار بکات.

**١٢-گروپی نەیاری بەهێز و کاریگەر:**

بوونی گروپی نەیاری بەهێز و کاریگەر، یەکێکە لە بنەماکانی دیموکراسی پەرلەمانی. ئەگەر گروپی نەیاری هوشیار و چاودێر نەبێ، کە چاودێری هەڵەکانی حکومەتی دیموکرات بکات و بیانخاتە ڕوو، حکومەتی دیموکرات دەکەوێتە بەردەم ناوردبینیەوەو دەسەڵاتی خۆی خراپ بەکاردەهێنێ. زۆرجار تەنها ئەگەری رەخنەگرتن بەسە بۆ ئەوەی حکومەت بخاتە سەر ڕێرەوێکی دروست. ئەو جۆرە گروپە نەیارانەی کە لە شوێنی وەکو بەریتانیا هەن، دیموکراسی بەهێز دەکەن و متمانە و کەرامەتی زیاد دەکەن.

**١٣-حکومەتی خۆماڵی هەرێمی:**

بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی دەبێ دام و دەزگای دیموکراتی لەسەر ئاستی هەرێمیش دابمەزرێنرێ. دامودەزگا هەرێمیەکان وەکو نوێنەرانی دەزگای یاسادانان بە پێودانێکی بچوکتر کاردەکەن. ڕێبەرانی هەرێم فێری هونەری ڕێبەری دەبن و خەڵکی هەرێمەکەش فێر دەبن کە چۆن مافی دەنگدانی خۆیان بەکاربهێنن. دامودەزگاکانی حکومەتی خۆماڵی هەرێمی وەکو دامودەزگای سەرەتایی بۆ راگەیاندنی باشیەکانی مەدەنیەت کاردەکەن و یارمەتی هاووڵاتیان دەدەن بۆ ئەوەی ببنە میللەتێکی هوشیار و دیموکرات. لە راستیدا هاووڵاتیانی دەوڵەتی دیموکرات دەبێ لە هەموو ڕوویەکەوە پەیوەست بن بە حکومەتەوە بەجۆرێ کە بیر و بۆچوونەکان بەردەوام لە ئاڵوگۆڕدابن.

**١٤-بەرنامەڕێژیی نیشتمانیی بۆ خۆشگوزەرانیی:**

بەرنامەڕێژیی نیشاندەری هەوڵ و کۆششی چڕوپڕە بۆ خێرایی بەخشین بە رەوتی دیموکراتی کە دەبێ بە حسابکردن بۆ هەموو تواناکان، ژیانێکی باشتر و ئەگەری سوود وەرگرتنی فراوان لە هەموو سەرچاوەکان فەراهەم بکات. بەرنامەڕێژیی دەبێ پێشکەوتنی ئابووریی و سیاسی و فێرکردن لە خۆی بگرێ و بە تەواویی و بەشێوەیەکی خێرا سوود لە تواناکانی زانست وەربگرێ.

**١٥- موڵکایەتی تایبەتی:**

موڵکایەتی تایبەتی کە پێویست ناکات بێسنوور بێ، بۆ کاری سەرکەوتووانەی دیموکراسی بنەڕەتییە. بەڵام دیموکراسی لە جێگایەك باشتر و بەهێزتر کاردەکات کە مافی موڵکایەتیی تایبەتی بەشێوەیەکی یەکسان بۆ هەمووان هەبێ. وا دیارە لە نەرویج و سوید و دانیمارك و سویسرا کە زۆر جیاوازی دەوڵەمەندیی و هەژارییان لەناوبردووە، دیموکراسی زیاتر دابین کراوە. ئەم جیاوازیانە لە چەند وڵاتێکی دیکەی وەکو ئیتالیا هێشتا هەیە و

ئاشكرایه، بەو پێیە دیموكراسی رەوتێكی خاوو هێواشی هەیە(١٥).

## ٧-رێگاكانی دیموكراسی راستەوخۆ

لە چوارچێوەی دیموكراسی نوێدا ملیونەها كەس دەژین. لەم رووەوە، جگە لە چەند كانتۆنێكی سویسرا، دیموكراسی راستەوخۆ، شتێكە پەیوەندیی بە رابردووەوە هەیە. بەڵام هەندێ رێوشوێنی دیموكراسی راستەوخۆ، وەكو ریفراندۆم، داهێنانی گشتی، دووبارەكردنەوە، پلێبیسیت، لەلایەن هەندێ وڵاتەوە بە پلەی جۆراوجۆر بەكارهاتووە، پەرەسەندنی پەیوەندی خێرا توانای گەرانەوەی بۆ لای هەموو هاووڵاتیان بۆ مەبەستی سنووردار و دیاریكراو فەراهەم كردووە. بەڵام ئەم رێوشوێنانە یان ئەم رێگایانە بریتی نین لە بەردەوامبوونی دیموكراسی راستەوخۆ، بەڵكو بریتین لە هاوئاهەنگی نوێ بۆ دابینكردنی پێویستیە تازەكان و لە بنەرەتدا بۆ ئەوە قبوڵكراون چونكە نارەزایی هەیە سەبارەت بە كاری سیستەمەكانی هەڵبژاردن و دەزگاكانی نوێنەرایەتی و حزبە سیاسیەكان. ئەم رێگایانە جەخت لە لایەنی پۆزەتیڤ و ئەوپەری حوكمرانی خەڵك و ملكەچی میكانیزمی ئاسایی حوكمەت بۆ خواست و ویستی دەنگدەران دەكەنەوە بەبێ دەستێوەردانی حیزبە سیاسیەكان.

### ئەلف. پلیبیسیت:

زاراوەی پلیبیسیت، لە بنەرەتدا زاراوەیەكی فەرەنسیە، بەڵام لە رازاوەی لاتینی *plebiscitum* وەرگیراوە كە لە هەردوو زاراوەی حوكم (*seitum*) و خەڵك (*plebis*) پێكهاتووە. بە باوەری لیكۆك *Lecock*، پلیبیسیت لە هەموو جۆرە دەنگدانێكی گشتیدا سەبارەت بە مەسەلەیەك بەكاردێ. بەڵام سترۆنگ *strong* باوەری وایە تەنها لە مەسەلە سیاسیە گرنگەكاندا، بەشێوەیەكی سەرەكی بە مەبەستی خوڵقاندنی هەلومەرجی سیاسی كەموزۆر هەمیشەیی بەكاردەهێنرێ. بەم پێیە، پلیبیسیت پەیوەندی بە یاسادانانەوە نییە. هەروەها بەشێك نییە لە رەوتی ئاسایی ماف و تەنها شێوازێكی دیموكراتییە بۆ ئاشكراكردنی بیروڕای خەڵك دەربارەی بابەتێكی سیاسی كە گرنگیەكی گشتی هەبێت.

لە سەردەمی نوێدا، ناپلیون لە ساڵی ١٨٠٤ دا پلیبیسیت-ی بەكارهێنا بۆئەوەی بە فێڵ بەسەر دەستووردا باز بدات. لەوە بەدواوە، ئەم شێوازە چەندان جار بەكارهاتووە. لە دوای جەنگی یەكەمی جیهان، بۆ ئاشكراكردنی بیروڕای خەڵك یان بەشێك لە خەڵك سەبارەت بە مافی ئۆتۆنۆمی بەكارهێنرا. سەرانی سیاسیش هەركاتێ شەرعیەتی كارەكەیان هەندێ گومانی لەسەر بووە، بۆ پەسەندكردنی بیروڕای خۆیان بەكاریان هێناوە. لیكۆك بیروڕای وایە كە ئەنجامی پلیبیسیت دەبێ "دەربرینی بیروڕا بێت بەبێ ئەنجامە یاساییەكەی". بەڵام دژوارە ئەوە بەدی بكرێ كە حكومەت چۆن لە ئەنجامە یاساییەكانی پلیبیسیت خۆی دەدزێتەوە یان لەبەرچاوی ناگرێ، مەگەر حكومەتێكی دیكتاتۆری بێت.

### ب- ریفراندۆم

زاراوەی ریفراندۆم بە مانای (گەرانەوەیە بۆ). ریفراندۆم شێوازێكە كە لە رێگایەوە بە گەرانەوەی راستەوخۆ بۆ لای خەڵك دەتوانرێ بیروڕای گشتی

ئاشكرا بكرێ. ڕەوتێكە كە تیایدا ڕای خەڵك سەبارەت بە هەنگاوێكی ئاسایی یان پەیوەست بە دەستوور دەپرسرێ. بە قسەی بروگس "لە ریفراندۆمدا دەنگدەران دەتوانن ئەو هەنگاوە ڕەتبكەنەوە كە دەزگای یاسادانان پێشان پەسەندی كردووە" مۆنرۆ ریفراندۆم بەشێوازێك دەزانێت كە بەهۆیەوە دەتوانرێ ڕێگا لە جێبەجێكردنی ئەو یاسایانە بگیرێ كە لە لایەن دەزگای یاسادانانەوە دانراون و تەسلیم بە خەڵك كراون و لە كاتی دەنگ لەسەرداندا قبوڵیان كردووە.

ڕیفڕاندۆم بۆ یەكەمجار لە سەدەی شانزەهەمدا لە سویسرا بۆ ئاشكراكردنی ڕای خەڵكی داهێنەری ئەو وڵاتە دەربارەی مەسەلە گرنگەكان بەكارهێنراوە. كاریگەریی ریفراندۆم سەبارەت بە مەسەلەكانی پەیوەست بە دەستوورەوە یەكەم جار لە ئەمریكا و پاشان لە سویسرا دەستی پێكرد. بەڵام بەكارهێنانی سەبارەت بە یاسای ئاسایی لە هەردوو وڵاتدا بەشێوەیەكی نیسبی دیاردەیەكی تازەیە. ریفراندۆم دوو جۆرە: ١/بە زۆر یان ئیلزامی. ٢/بەخوایشت یان بە هەڵبژاردن.

ریفراندۆم كاتێ بە زۆرە كە هەموو یاسا دیاریكراوەكان بەشێوەیەكی ئیلزامی دەبێ بۆ قبوڵ كردن یان ڕەتكردنەوە بەرلەوەی ببێ بە قانون بگەڕێنرێتەوە بۆ لای خەڵك. ئاشكرایە شێوەی ئیلزامی ریفراندۆم دیموكراتییە، چونكە پێویستی بە دەربڕینی ڕای گشتی هەیە سەبارەت بە هەموو قانونێك. لە سویسرا و ئوسترالیا بۆ هەموو ریفۆڕمێكی پەیوەست بە دەستوور پەنا بۆ ریفراندۆمی ئیلزامی دەبرێ. لە هەندێ كانتۆنی سویسرا، هەتا سەبارەت بە گەڵاڵەنامە ئاساییەكان مەرجێك بۆ ریفراندۆمی ئیجباری هەیە. هەركاتێ یاسای دانراو لەلایەن دەزگای یاسادانانەوە بەپێی داخوازیی ژمارەیەكی دیاریكراوی هاووڵاتیان بۆ بیروڕا دەربڕینی كۆتایی بدرێ بە خەڵك بە (ریفراندۆمی ئیختیاری) ناودەبرێ. ئەگەر زۆرینە دەنگی پۆزەتیڤیان لەسەردا، دەبێ بە قانون، جگە لەم حاڵەتە بڕیارەكەی دەزگای یاسادانان لە متمانە دەكەوێ. سترۆنگ بە چاكی سوودەكانی ریفراندۆمی كورت كردۆتەوە: "یەكەم/ ریفراندۆم كەمتەرخەمی دەزگای یاسادانان چاكدەكات كە ڕەنگە تووشی گەندەڵی بووبن یان بە پێچەوانەی ئەركی سەرشانیانەوە كاربكەن. دووەم/ پەیوەندیەكی بەسوود لە نێوان كاندیدەكان و دەنگدەراندا دروست دەكات، پەیوەندییەك كە هەمیشە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی دەوریەوە داین نابێت. سێیەم/ ریفراندۆم گرەنتی ئەوە دەدات كە هەر (یاسایەك كە لەگەڵ ڕای گشتیدا ناكۆك بێ، پەسەند ناكرێ[١٦].

كەموكورتیەكانی ریفراندۆم دەتوانرێ بەم شێوەیە بژمێردرێ: پێگەو دەسەڵاتی دەزگای یاسادانان نابووت دەكات؛ ئیختیارێك دەخاتە بەردەمی خەڵك كە بۆ بەكارهێنانی بەشێوازێكی هوشمەندانە ئەو مەرجانەیان تێدا نییە، بەڕاست و دروستی ناتوانێ ڕای گشتی عەكس بكاتەوە، چونكە ئەو دەنگدەرانەی كە لە ریفراندۆمدا بەشداری دەكەن زۆرجار كەمن؛ لە مەسەلە ژیانییەكاندا دەبێتە هۆی دواكەوتنی ناپێویست و زیانبەخش؛ سەبارەت بە سوودمەندی ئاكاریی ریفراندۆم گومان هەیە؛ ماهیەتی بەشداریی خەڵك تیایدا زیاتر لایەنی نێگەتیڤی هەیە تا پۆزەتیڤ؛ كەموكورتیەكانی سیستمی حزبی زیاددەكات؛ دەربڕی بیری ڕاستەقینەی خەڵك نییە، شێوازێكی پڕ خەرجیە؛ سەرئەنجام بۆ وڵاتە فراوانەكان لەبار نییە.

## ج-داهێنانی گشتی

لایەنگرانی یاسا دانانی ڕاستەوخۆ لەو مافە ڕازی نین کە سەبارەت بە دەنگدان دەربارەی ئەو گەلاڵەنامەیە هەیە کە دەزگای یاسادانان پەسەندی کردووە. ئەمانە پشتیوانی لە شێوازێکی داهێنانی گشتی دەکەن بۆئەوەی خەڵك خۆیان یاسا دابنێن. لە سویسرا هەر پەنجا هەزار هاوڵاتیەك دەتوانن داخوازییەك ئیمزا بکەن و تیایدا ئەو هەنگاوانە دیاری بکەن کە دەیانەوێ ببێ بە قانون. لە جێگەی خۆیدا، پێشنیاز بۆ ڕای خەڵك دەکرێ و بە پەسەندکردن و ڕازی بوون لەسەر ئەو بڕیارە وەکو یاسایەکی دانراوی لێدێت. لە سویسرا (داهێنانی) کانتۆنەکان هەم سەبارەت بە هەنگاوی ئاسایی و سەبارەت بەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە دەستوورەوە هەیە جێبەجێ دەکرێ. ژمارەی ئیمزاکەرانی پێشنیازێکی لەو جۆرە لە کانتۆنێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێ.

جیاوازی هەیە لە نێوان داهێنانی گشتی و عەرز و حاڵدا. یەکەم/ جیاوازیان ئەوەیە کە یەکەمیان فەرمانی تێدایە و ناتوانرێ ڕەت بکرێتەوە. دووەم/ داهێنانی گشتی لەو خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ کە حاکمیەتیان هەیە و دەبێ کاری پێبکرێ. سێیەم/ تەنها پەیوەندی بەو مەسەلانەوە هەیە کە پەیوەستن بە یاسادانانەوە، لە کاتێکدا کە سەبارەت بە هەموو مەسەلەیەك دەتوانرێ عەرزوحاڵ بنووسرێ؛ و سەرئەنجام دەزگای یاسادانان ئەو ئازادی کارکردنەی نییە کە هەرچۆنێکی دەوێ مامەڵە لەگەڵ "داهێنانی گشتیدا" بکات و دەبێ پێشنیاز بکات بۆ ڕای خەڵك یان خۆی ڕای خەڵك پەسەند بکات. بەڵام سەبارەت بە عەرزوحاڵ دەزگای یاسادانان ئەو مافەی هەیە هەرچۆنێکی دەوێ مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

داهێنانی گشتی دوو جۆرە: ١/نووسراو. ٢/نەنووسراو (واتە لە قسەی گشتیدا خۆی حەشارداوە). داهێنانی گشتی نووسراو لە هەموو ڕوویەکەوە بە شێوەی گەلاڵەنامەیەك کامڵە. لەم ڕووەوە، دەزگای یاسادانان ناچارە یان پەسەندی بکات یان بۆ بڕیاردان لەسەری بیخاتە بەردەم ڕای خەڵك. لە هەرجێگایەك کە داخوازییەکە بە قسەی گشتی دەربڕابێ یان نەبووبێ بە ڕەشنووسێکی تەواو. بە "داهێنانی گشتی نەنووسراو" ناودەبرێ. لە سویسرا دەزگای یاسادانان پێشنیاز پەسەند دەکات، ڕەشنووسەکەی ئامادەدەکات و بۆ بڕیاردان لەسەری دەیخاتە بەردەستی خەڵك. ئەگەر ئەنجومەنی فیدراڵی سویسرا پەسەندی نەکرد، مەسەلەکە بۆ ڕای سەرەتایی خەڵك دەخرێتە بەردەمیان. ئەگەر زۆرینەی هاووڵاتیان پەسەندیان کرد، ئەنجومەنی فیدراڵ دەبێ هەنگاوە پێشنیازکراوەکە پەسەند بکات و بیخاتە بەردەمی خەڵك. سەبارەت بە داخوازیی پیاچوونەوە بە دەستووردا شێوازەکە کەمێك دەگۆڕێ. لە حاڵەتێکی وادا، بۆ دیاریکردنی پێویستی پیاچوونەوە، بڕیاری گشتی پێویستە. ئەگەر زۆرینەی هاووڵاتیانی سویسرا داوای پیاچوونەوەی گشتی بکەن لە دەستووردا، ئەنجوومەنی فیدراڵ خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە. ئەنجومەنی فیدراڵی هەڵبژێردراوی نوێ ڕەشنووسی دەستووری نوێ بەشێوەیەکی پێشنیازکراو ئامادە دەکات و دوای پەسەندکردنی دەیخاتە بەردەم ڕای گشتی خەڵك. ئەگەر زۆرینەی خەڵك و کانتۆنەکان پەسەندیان کرد، دەستووری تازەی چاککراو جێبەجێ دەکرێ. ڕەوتی داهێنانی گشتی لە کانتۆنەکانی سویسراش کاری

پێدەکرێ. بەڵام ژمارەی ئیمزای پێویست بۆ کارێکی وا لە کانتۆنێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ.

## د-لەسەرکار لابردن

لەسەر کار لابردن ڕێگایەکی دیکەی دیموکراسی راستەوخۆیە. لەهەر جێگایەک کە دوبارەکردنەوە هەبێ، دەنگدەران مافی ئەوەیان هەیە هەرکەسێکی هەڵبژێردراو یان هەر نوێنەرێ لەسەر کار لابەرن کە بەشێوەیەکی باش بەرپرسیارانە ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ ناکات. ئەم سیستمی لەسەرکارلابردنە لە هەندێ ویلایەتی خۆرئاوای ئەمریکا وەکو ئەریزۆنا، مونتانا، لویزیانا، کانزاس، واشنتن، کالیفۆرنیا، ئەرکانزاس و چەند ویلایەتێکی تر هەیە، لە ویلایەتی ئەڤرگان هەتا دەتوانرێ حاکمەکانیش لەسەر کار لابرێ، بەڵام لە ویلایەتی واشنتن ناتوانرێ ئەوە بکرێ.

## پەراوێزەکان

1-finer، op. Cit. P. 123

2-Beni prasad، op cit. P 227

3-finer، op. Cit. P. 128.

4-Ibid.

5-Ibid.

6-james Bryce، Modern Democracies، Vols.2 (Newyork: the Macmillan co 1921) vol،1، p.20

7-Robert maclver، the web of Government، op. Cit. P. 198.

8-charlesE. Merriam، the new domocracy and the new desperation (chicago: chicago university press 1939) p. 44.

٩-ك.ك. رودى، ت. ج. اندرسن و ك.ك. كريستول، اشنايى باعلم سياست، ترجمه بهرام ملكوتى، ٣ جلد چاپ دوم (تهران: كتابهاى سيمرغ، ١٣٥١) ج١، ص ١٠.

١٠-براى مطالعة درباة نظر كمونيستى دموكراسى، نگاه كنيد به:

yuri p. Frontsev، commonism and freedom of the Individual، moscow: Foreign Languges publishing house n.d; and kapur، op. Cit. P 330.

١١-براى مطالعه درباره اين اصول، نگاه كنيد به: رودى پيشين، ص ١٣٣-١١٠.

12-Barker، the study of op. Cit. P 207.

١٣-روبرت ميخلز، جامعه شناس احزاب، ترجمه احمد نقيب زاده (تهران: نشر قومس، ١٣٦٩) ص ٢٣.

14-Bryce، op، cit. Vol. 2، p. 504.

١٥-براى مطالعه بشتر درباره دموكراسى، بنيادهاى حكومت دموكراتيك و توانهاى موفقيت ان، نگاه كنيد به:

Dillon، op. Cit.، Chaps 4 and 5، p. 41، 80; and Agarwal، op، cit p. 277-295.

16-C.F. Strong Madern Political Constitutions (London: sidgwick and jackson 1966) p. 229.

## سەرچاوە

ئەم باسە بەشی (١١)یە لە کتێبی بنیادهای علم سیاست
– عبدالرحمن عالم
چاپ سوم ١٣٧٦ نشرنی – لاپەڕە ٢٩٣-٣١٩.

# بەرگری کردن لە دیموکراسی

ئالن دوبنوا

لە فارسییەوە: فەرەیدون

باشترین رژێمی سیاسی کامەیە؟ پرسیارێکی وا بێ واتایە. هیچ ڕژێمێکی سیاسی خۆی لە خۆیدا واتە دابڕاو لە کات و شوێن و هەلومەرجە تایبەتیەکان باشترنیە لە رژێمەکانی تر. بۆ پرسە مرۆڤایەتیەکان چارەسەرێکی "پاوانی تاك" لە ئارادا نییە. شێوەی هەموو کۆمەڵگا و نەتەوەکان چەسپیو و نەگۆڕ نییە. ئەگەر بگوترێت باشترین دەوڵەت ئەوەیە کە زۆرتر بەرژەوەندیەکانی گەل دابین دەکات، ئەوە نابێتە وەڵام، چونکە پرسێکی تازە دەخاتە ڕوو. پرسی تازە ئەمەیە کە لە پێناسەکردنی بەرژەوەندیە گشتیەکاندا هاوڕایی نەهاتۆتە گۆڕێ. هەرکەس بەشێوەیەکی جیا بەرژەوەندیە گشتیەکان پێناسە دەکات (خۆشگوزەرانی، هێز، عاقیبەت بەخێری...) و ئەم پێناساندنانەش ناکۆکن. دەشکرێت وەها وەڵام بدرێتەوە باشترین ڕژێم ئەو ڕژێمەیە کە فۆرمەلەی ئەو بەهایانە دەکات کە گەلێك ڕێزی لێ دەگرێ. بەڵام ئەم پرسیارەش گەلێك تەماوییە. پێویستیەکان بە گوێرەی قۆناغ و چەرخەکان، دەشێت بەراوەژووش ببنەوە. چاوەڕوانی کاتی ئاشتی لەگەڵ چاوەڕوانی کاتی شەڕدا جیاوازە و هەموو دەزانن کە ئەگەر دەوڵەتی یاسایی وڵاتێك لە کاتی ڕوودانی "دۆخێکی نائاساییدا" بیەوێت بە هەمان شێوەی دەوڵەتی یاسایی ئاسایی خۆی بمێنێتەوە، چەند کەندو کۆسپ دێنە ڕێگەی.

ئەگەر دیموکراسی لەبەرچاوبگرین، یەکسەر ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئایا ئەم رژێمە لە سەرانسەری دنیادا یەك بەکارهێنانی هەیە یان نا؟ هێندێك هۆ هەیە وامان لێ دەکات گومان لەمە بکەین. لە لایەکەوە رەگ و ریشەی دیموکراسی بە واتا رۆژئاواییەکەی لە مێژووی رێکخراو و دەزگا سیاسیەکانی ئەوروپادایە و لە لایەکی تریشەوە دیموکراسیەتی لیبرال پەیوەندی قووڵی هەیە لەگەڵ ئەخلاقی دینی یەهودی، کریستیانی و فەلسەفەی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەهەمی ئەوروپادا. لەم دۆخەدا چۆن دەتوانین پاکانە بۆ بەرپاکردنی ئەم

سیستەمە لە جیهانی سێیەمدا بکەین؟ راستیەکەی ئەمەیە دیمۆکراسی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی — کولتوری ڕۆژئاواییە کە بڵاوبوونەوەی بە چواردەوری جیهاندا بۆتە مۆڵەتێك بۆ پەسەندکردنە گشتیەکەی[١].

هەر بەم هۆیەوە ناتوانرێت "هەقیقەتی" سیستەمێکی سیاسی بسەلمێنرێت. لە ئاستی بەرزتردا دەتوانین هەوڵبدەین ئەمە دەربخەین کە لە فلان هەلومەرجی تایبەتدا و بۆ گەیشتن بە فیسار ئامانج، فلان ڕژێم لە فیسار ڕژێم باشترە. هەموو ئەو بیرمەندانەی گوتوویانە دیموکراسی باشترین ڕژێمە، خۆیان لەوە بواردووە کە خودی هەقیقەتی چەمکی دیموکراسی بسەلمێنن و دەستیان داوەتە بەراوردکاری و تەنیا ئەوەیان گوتووە گوایە دیموکراسیەت کەم و کورتی هەیە، بەڵام کەم و کورتیەکانی کەمترە (یان کەم زیانترە) لە رژێمەکانی تر. تەنانەت شێوە هەڵسوکەوتێکی بەو جۆرە لەگەڵ کێشەکەدا، مەسەلەی بایەخی پرنسیپ و پێوەرە باوەڕپێکراوەکانی بیرمەند دەخاتە ڕوو[٢]. لەم ڕووەوە، سادەترین ڕێگە ئەمەیە کە وا بزانین باشترین ڕژێم لە بنەڕەتدا بوونی دەرەکی نیە و دەبێت باشی و خراپی هەر ڕژێمێك بە گوێرەی پرەنسیپە بڕوا پێبووەکانی خۆمانەوە بنرخێنین.

دوو گروپ مرۆڤ رەخنەیان لە دیموکراسی گرتووە. رەخنەی گروپی یەکەم سەبارەت بە پرەنسیپ و بناغەی دیموکراسیە. رەخنەگرانی ئەم گروپە دژی دیموکراسین. گروپەکەی تر بە پێچەوانەی گروپی یەکەمن و دەڵێن بە دەگمەن ڕژێمێك پەیدا دەبێت لەگەڵ ئایدیال و تیۆرییەکانی دیموکراسیدا گونجاو بێت. ئەم گروپە هێندێك پێشنیاریان هەیە لەخۆگری چارەسەری شیمانەییە. خوێندنەوەی مێژوو نیشانی دەدات لێکۆڵەرەوەکان بەردەوام و ناوەناوە هێندێك هەڵوێستی گروپی یەکەمیان وەرگرتووە و هێندێکیش بیروڕای گروپی دووەمیان هەڵبژاردووە. ئێمە لەم بەشەدا بەتایبەت دەربارەی بەڵگەهێنانەوەی پەیوەندیدار بە گروپی یەکەمەوە دەدوێین.

لە رابردوودا، بیرمەندانی چەپ بیر و نووسەرانی راستگر پرەنسیپی دیموکراسیان رەخنەکردووە. بۆ نموونە بە پێچەوانەی ئەو وێناکاریە بەناوبانگەی سەندیکالیستە شۆڕشگێڕە فەرەنسیەکان لەساڵەکانی ١٩١٤-١٨٩٦ وەك ژۆرژ سۆرەل[٣]، ئەدوارد بەرث[٤]، پاتۆ[٥]، پۆژە[٦]، پەلۆتیەر[٧] و تەنانەت پرۆدۆن[٨] و بلانکی[٩] لە بارەی رەخنەگیری لە دیموکراسیەوە کەمترنین لە کەسانێکی وەك بۆناله[١٠]، ژۆزف دەمایستر[١١]، مۆرا[١٢]، کارلایل[١٣] و سپەنسەر[١٤]. فلۆبەر دەڵێت گەڕانەوە بۆ دەنگدانی گشتی "مایەی سەرشۆڕی هۆشمەندانە" و مۆنتالەمبەر[١٥] دەنگدانی گشتی وەك کەرەستەیەکی ژەهراوی دەبینێ.

بەلزاك دەڵێ، دیموکراسی "پڕەنسیپێکی بەتەواوەتی هەڵەیە" و ئۆگۆست کۆنت دەنووسێت، "دەسەڵاتی گەل درۆیەکی شوورەیی ئامێزە". ئەرنەست رەنان دەڵێت، "هەڵبژاردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵێك کەسی بیرناوەڕاست لە دەوریەك کۆببنەوە و ئەم بیرانەش لە ئاستی زەینی ناوەڕاسترین پادشاکان نزمترە". دەتوانرێت زۆر لەم چەشنە قسانە بهێنرێتەوە. بیروڕای ئەو نووسەرانەی ناویان برا، گەلێك پەیڕەو و بەرگریکەری پەیدا کردووە[١٦].

زۆرینەی ئەم رەخنەگرانە کەسانی بەناوبانگن. بەڕای ئەوانە دیموکراسی قەڵەمڕەوی جودایی و پەرشوبڵاوی و ناسەقامگرتوویە و هەروەها سەکۆی دیکتاتۆری زۆرینەیە و دەبێتە هۆی میان مایەیی و

کەم بەهرەیی. ڕژێمە پشت بەستووەکان بە حیزب – حیزبێنە، یەکێتی نەتەوەیی تێکدەدەن و چەشنێك دۆخی شەڕی ناوخۆیی بەدی دێنن کە جاروبار ئەملا دەسووتێنن و جاروباریش ئەولا. هەڵبژاردن و پەرلەمان بازی دەبێتە هۆی بە دەسەڵات گەیشتنی مرۆڤە کەم هۆش و کەم مایەکان. چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەشداری چالاکیە سیاسیەکان دەکەن زیادە، گەمەی سیاسی کورت دەبێتەوە لە کێشمەکێشی تاکەکان بۆ دابین کردنی بەرژەوەندیە تایبەتەکان و ئەم کارەش خۆی دەبێتە هۆی پەرەگرتنی عەوام فریواندن کە ئەنجامەکەی لەبیرکرانی بەرژەوەندی گشتیە. لە وەها حاڵەتێکدا، فەرمانڕەوایان و خاوەن دەسەڵاتان و کارگێڕەکان چونکە حەزدەکەن هەڵبژێردرێن، پێیان ناکرێت پڕۆژەی درێژخایەن پێشکەش بکەن یان بڕیاری وا بگرن کە لە هەمان پێویست بوونیدا پێچەوانەی ویستی خەڵك بێت. جگە لەمەش لێپرساوە هەڵبژێردراوەکانی خەڵك خواستە هەمە چەشنە پیشەییەکان دنە دەدەن، ئەمە لە حاڵێکدایە کە ئەمجۆرە خواستانە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا ناکۆکن. کارگێڕە هەڵبژێردراوەکانی گەل بە زمانی زۆرینەی جەماوەرەوە قسە دەکەن، و بۆ ڕەزامەند ڕاگرتنی زۆرینەی خەڵك[١٧] زەبوونترین ئارەزووەکانیان ستایش دەکەن. دیموکراسی بە ناچاری دەبێتە هۆی ئاژاوە و چێژپەرستی جەماوەر و کۆمەڵە خەڵکێکی یەکسانی خوازی ماددی. چەمکی بەرژەوەندی گشتی دەبێتە چەمکێکی ڕسوا و ئاشکرا دەبێت کە "قەلەمڕەوی ئازادی" شتێك نیە جگە لە قەلەمڕەوێکی چەندی و ماددی. شارەل مۆرا دەڵێت دیموکراسی "هەموو ئەو دەسکەوتانەی خەڵك لە خولەکانی پێشوودا ئافراندوویانە، هەڵدەلووشێت". دیکتاتۆری زۆرینەی خەڵك و سەرکوتی بیر و ئەندێشە، جێی حکومەتی تاك دەگرێتەوە و بەرزبوونەوەی پلەی کەسە کەم بەهرەکان دەبێتە هۆی کەم مایەیی خەڵك. کریستیان پەرۆ[١٨] دەڵێت: "دیموکراسی کەسەکان لەگەڵ یەکدا یەکسان دەکات و ئاستی بیریان دادەبەزێنێ، چونکە یەکسانی و دابەزاندنی فام و هەستی گشتی لە نیهادی دیموکراسیدا شاردراوەتەوە و بە کورتی کەسە نابووتەکان دەبنە جێبەجێکەری یاسا".

خەڵك بە زۆری ئەمجۆرە بیروبڕوایانە بە ڕاست دەزانن[١٩]، بەڵام بەم حاڵەشەوە دیموکراسی لەگەڵ ڕژێمەکانی تردا بەراورد دەکەن و دەگەن بەو ئەنجامەی گەلێك لەو ڕەخنانەی لە دیموکراسی دەگیرێن، لە ڕژێمەکانی تریشدا هەیە. چونکە ئەمجۆرە ڕەخنانە بە تایبەتمەندیە چەسپیوەکانی سروشتی مرۆڤەوە پەیوەستن. بەهەرحاڵ، بڕوای باو ئەمەیە کە لانی کەم دیموکراسی ئەم ئیمتیازەی هەیە دیکتاتۆری ناگرێتە خۆی و لەبەرئەمە ڕژێمە دیموکراتیەکان وەك ئەو ڕژێمانە پێناسە دەکرێن کە هێز تێیاندا سنوردارە و ڕژێمی دژە دیموکراتیش ئەو ڕژێمانەن کە هێز تێیاندا هیچ سنوور و قەید و بەندێکی نیە. بەمجۆرە هاتنەدەرەوە لە دیموکراسی هاوتای تێوەگلانە لە سەرەڕۆیی و ملهوڕی تاکدا. چەرچیل قسەیەکی بەناوبانگی هەیە، دەڵێت: "تەنیا ئەو کاتە دەتوانین بڵێین خراپترین ڕژێم دیموکراسیە کە جگە لە دیموکراسی هیچ ڕژێمێکی تر لە ئارادا نەبێت". (ژان ماری لۆپەن[٢٠] (ڕێبەری بەرەی نەتەوەیی فەرەنسا کە پارتیەکی ڕاستی توندڕەوە) ئەم قسەیەی چەرچیلی وەك بەڵگە هێناوەتەوە و گوتوویەتی؛ من "دیموکراتێکی چەرچیل ئاساییم"). ئەو ئیمتیازەی لە فۆرموولەکەی چەرچیلدا بەدی دەکرێت ئەمەیە کە مرۆڤ ئاسوودە دەکات تا ئیتر بیر لە شێوە ڕەخساوەکانی دیموکراسی نەکاتەوە.

(دەڵێین شێوەی ڕەخساوی دیموکراسی، چونکە هێشتا ناتوانرێت دەربارەی ئەو ڕژێمانەی مرۆڤـ نەیدیون بیر بکرێتەوە) و کورتکراوەکەی دەبێتە ئەمە هەرچەند لەوانەیە دیموکراسی رژێمێکی نەفرەت لێکراو بێت، بەڵام رژێمەکانی تر پتر لە دیموکراسی نەگریسن. ئەنجام ئەمەیە ئیتر دیموکراسی بە "باشترین ڕژێم" لە قەڵەم نادرێت، بەڵکوو وەك ڕژێمی کەم نەقس و کەم گرفتتر باسی لێوە دەکرێت.

ڕەنگە ئەم دوورییانەی "دیموکراسی یان دیکتاتۆری"یە ببێتە هۆی سەرسوڕمان بەڵام پێویستە ئەوە بوترێت کە ئەم سەرسوڕمانە هیچ بناغەیەکی نییە و بەدەست هێنانی ئازادی هەمیشە لەگەڵ پەرەسەندنی دیموکراسیدا هاوجووت نەبووە و هەڵبەت زۆرینەی زۆری ئەو ڕژێمانەی لە مێژووی ئەورووپادا شکیان دەبەین، ئازادیان ڕەت نەکردۆتەوە. بەو جۆرەی تۆکڤیل نووسیویەتی: "ئازادی لە سەردەمە جۆربەجۆرەکاندا و بە شێوەی جیاجیا بۆ خەڵك ئاشکرا بووە. ئازادی هیچکات پاوەنکراوی ڕەوشێکی کۆمەڵایەتی تایبەت نەبووە و لە شوێنی دیکە و لە دەرەوەی رژێمە دیموکراتیەکانیشدا دیتراوە. کەوابوو ئازادی خەسڵەتی تایبەتی ئەو قۆناغانە نیە کە دیموکراسی تیا باوە[٢١]. جۆڤانی سارتۆری ئەم بیروبڕوایەی تۆگڤیل پەسەند دەکات و دەڵێت: "لە سەرەتادا ئامانجی دیموکراسی خوازی، بیرێکی دیموکراتیانە نەبووە. ئازادی لە پێداویستیەکانی دیموکراسیە، بەڵام ئازادی میوەی دیموکراسی نییە و ئەم دوو بابەتە گەلێك لێك جیاوازن"[٢٢].

لە لایەکی ترەوە، ئەزموون پیشانی داوە کە ڕژێمە دیموکراتیەکانیش دەتوانن ببنە حکومەتی سەرکوت و کۆلۆنیالیزم و تەنانەت ترساندن و تۆقاندنیش. ئالەن دەیگوت، "دیموکراسی کە ئەوەندە (لە تیۆردا) جوان دێتە بەرچاو، بە کردەوە دەتوانێت ببێتە شتێکی ترسناك" — ئەمەش بەڵگەیەکی ئەم گوزارشتەیە کە "زەوی دۆزەخیان بە نیازی پاك ڕاخستووە". هەموان دەزانن "دیموکراسیە جەماوەریە"کانی ڕۆژهەڵات کەوتنە چ حاڵ و ڕۆژێکەوە و هەموان بیری دێتەوە لە شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا دوای ئەوەی "جاڕنامەی مافی مرۆڤ" بڵاوبۆوە، چۆن قۆناغی تۆقاندن دەستی پێکرد و کوشت و بڕی خەڵکی ئەیالەتی واندە قەوما[٢٣]! بەڵام ئەم بیروباوەڕەی کە گەڕانەوە بۆ ڕای گشتی دەکات، مرۆڤە توندڕەوەکان چەك دەکات، لەبەرئەوەی لە هەر کۆمەڵگایەکدا میانڕەوەکان زۆرینە پێکدێنن، ڕاست نییە و نابێت پانتایی بڵاوبوونەوەی بیرێك لە نێوان خەڵکدا بە کەم بگیرێت. کەوابێت لەم بارەشەوە هیوایەکی ئەوتۆ نابینرێت.

ئەو ناکۆکیەی کۆڕو کۆمەڵە لیبراڵەکان لە نێوان دیموکراسی و حکومەتی تۆتالیتەردا دەیبینن، گوماناوی دێتە بەرچاو. لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییە[٢٤] سەرەڕای ئەوەی لە گۆشەنیگای جۆربەجۆرەوە کراون، دەریدەخەن کە ڕەگ و ڕیشەی حکومەتە تۆتالیتەرە تازەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئایدیۆلۆژیا کە دیموکراسیە هاوچەرخەکانی لێوە دەرهاتوون. ئەم ئایدیۆلۆژییانە فەلسەفەی یەکسانی خوازی و ئەقڵانیەتی تایبەتی فەلسەفەی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەیەمە[٢٥]. تالمۆن دەنووسێت: "لە سەدەی هەژدەهەمدا لە هەمان کاتدا کە پێشەکیەکانی دیموکراسی جۆری لیبراڵ ئامادە دەکرا، پێشەکیەکانی پرۆسەیەکی فکری تریش پێکدەهات دەتوانرێت ناوی تۆتالیتەری لێبنرێت. ئەم دوو شێوە دیموکراسیە ئەودەمە لە پەیکەری هاوبەشی خۆیان دابڕان کە

بنەما هاوبەشەکانیان بە مەحەکی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا تاقیکرایەوە"(٢٦).

سەرەنجام نابێت ئەم خاڵەش لەبیر بکرێت حکوومەتە تۆتالیتەرەکان روخساری جۆربەجۆر دەگرنەخۆ و ئەو هاوشێوەیی و هاوسانی و لێکچوونەی بەرەبەرە لە وڵاتە دیموکراتیە لیبراڵەکاندا هەموو شتێك دەخاتە یەك ڕیزەوە، خۆی جۆرە دیسپوتیزمە کە تۆکڤیل لێی دەترسا چونکە تایبەتمەندی و لایەنە تۆتالیتەرەکانی، لە سەرکوتی خەڵك و ئۆردوگاکانی بێکاری ڕژێمە تۆتالیتەرەکان کەمتر نییە.

کەوابوو دەبێت ئەم هەقیقەتە لەبەرچاو بگیردرێت هیچ رێ و شوێنێکی دیموکراتی نییە کە بتوانێت لە بەرامبەر سەرەڕۆیی و دیسپۆتی و ملهوڕی خاوەن دەسەڵاتەکاندا، گرنتی حکومەت بکات. هەروەك ئەرەستۆ دەڵێت، دەوڵەتێکی پەنادەری خەڵك دەتوانێت ببێتە دەوڵەتێکی چەوسێنەر. دیکتاتۆری، تایبەت بە حکوومەتە پادشاییەکان یان حکومەتی چەند کەسێك (ئۆلیگارشی) نییە. دیکتاتۆری جۆرە نەخۆشی و گەندەڵییەکە، کە هەمیشە سەر دەردێنێت و بەشێوەی یەکسان بەڵام بە شکڵی جیاواز هەڕەشە لە سیستەمە سیاسیەکان دەکات.

جا با بڕۆینەوە بۆ لای رەخنەگرە تازەکانی دیموکراسی. ئەو رەخنانەی رەخنەگرانی ئیمڕۆ لە دیموکراسیان گرتووە، یەکێك زیاتر نییە و ئەویش رەخنەگرتنە لە یاسای زۆرینە. ژاکلین دۆ رۆمییە کێشەکە لە چەند وشەدا کورت دەکاتەوە و دەڵێت: "پێدەچێ ئەوەی کە هەرکەس بە دەنگی یەکسانەوە بەشداری لە کاروباری دەوڵەتەکەیدا بکات، کارێکی راست بێت، بەڵام هەر خودی ئەم کارە دەتوانێت ترسناکیش بێت، چونکە توانا و دەسەڵاتی (صلاحیەت) هەموان یەکسان و وەك یەك نیە. بە دەربڕینێکی سادەتر، ئەمە رێك و راست هەمان گێرەو کێشەیە کە تێکڕای دیموکراسیەکان گرفتارین"(٢٧).

ئەنجامی راستەوخۆی کاری دەنگدان لە راستیدا بە واتای گرتنی بڕیارە لەلایەن زۆرینەوە. لەم رووەوە وێنای ئەوەی کە مەسەلەی مەرجەعیەت (ئۆتۆریتە)، کە مەسەلەیەکی چۆنایەتیە بتوانێت لە زۆرینەوە کە مەسەلەیەکی چەندایەتیە بێتە دەرەوە، مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان دەکات.

ئالێرەدایە رەخنەکان وەکو کۆمەڵێك جۆگەلە دەگەنە یەك، بەجۆرێك "تەین" لە پێشەکی کتێبی بنەماکانی فەرەنسای هاوچەرخدا(٢٨) دەنووسێت: "ئەگەر دە ملیۆن نەزان بنێنە سەریەك، ناکەنە زانایەك". ئەگەر هەڵەکانیش لەگەڵ یەك کۆبکەنەوە، راستیەکی لێدەرنایەت.

چۆنی لە چەندی دەرنایەت و بەهای دیاردەیەك، کارێکی چەندی نییە، بەڵکو کارێکی چۆنیە. ئەو هۆ و هۆکردەی زۆرینە دەیهێنێتەوە بێ یەك و دوو هۆ کردو هۆیەکی راست نییە. بۆ دەبێ وا بیر بکرێتەوە ئاپوورەترین بەشی کۆمەڵگایەك، هەر لەبەر ئاپوورەبوونی، باشترین بەشی ئەو کۆمەڵگایەیە؟ ئەو قسەیەی دەڵێت، زۆرینە "راستی دەردەبڕێت" ئایا بەو واتایە نییە مرۆڤ بە راستی باوەڕ بکات کە ویستەکانی زۆرینە پشتی بە راستینەیەکی "جیهان پەسەند"ی یەکجار خەیاڵاوی بەستوە؟

ئەم وێناکاریەی گوایە زۆرینە راستی دەڵێت، بێ یەك و دوو رەخنەیەکی دیکە دەردەخات لەسەر ئەوەی "چەندایەتی" نەك تەنیا "چۆنایەتی" دروست ناکات، بەڵکو زوربەی جار لە ناوی دەبات و لەبەرئەمە ئەو مەترسیە گەورەیە دێتە پێش کە

چەمکی "تەرازی ماتماتیکی" کە پێویستی دەنگدانی گشتیە لەگەڵ "ناوەنجی" بە مانای میان مایەیی و کەم بەهرەیدا بەهەڵە تێکەڵ بکرێت. رەخنەگران دەڵێن باشترین کەسەکان یان کەسە بژارەکان هەمیشە کەمینەن بێ توانایی و بێ دەسەلاّتی رێبەرەکان لەمەوە سەرچاوە دەگرێت کە "زۆرینەی هاوولاّتیان" هەڵیان دەبژێرن. بەرلەمە، ماکس نۆردو[٢٩] هەوڵی دابوو تا بەشێوەیەکی "زانستیانە" بیسەلمێنێ ئەنجامی دەنگدانی گشتی ناتوانێت شتێك بێت جگە لە ئەنجامی دەنگدانی کەم بەهرەو میان مایەکان. ئەندرە تاردیۆ دەنووسێت: "ئەنجامی یاسای زۆرینە دەبێتە ئەوەی کە دەسەلاّت بدرێتە دەستی کەسە بێ تواناکان.." هەروەها دەڵێت "زۆرینەی دەنگدەران بۆ ئەوە بانگهێشت دەکرێن تا لەبارەی ئەو کێشانەوە رای خۆیان دەربڕن کە هیچی لێنازانن"[٣٠]. رینە گەنۆن دەڵێت یاسای زۆرینە شتێك نییە جگە لە "یاسای بالاّدەستی مادە و هێزی کاڵی زبر و "ناکرێت بەرز لە نزمەوە دەربهێنرێت" و دەگاتە ئەو ئەنجامەی "رای زۆرینە شتێك نیە جگە لە دەربڕینی بێ توانایی نەبێت"[٣١]. بەرتراند دۆ ژۆڤەنەل لە گۆشەنیگایەکی ترەوە کێشەکە دەخوێنێتەوە (چونکە لێرەدا مەبەست ئەوەیە بێژین زۆرینە لە خۆگری مەترسی دیسپۆتیزمی بەزەبرە)، و دەڵێت: "پشتیوانی زۆرینەی خەڵك لە دەوڵەتێك – هەرچەند پڕ ژمارەترین زۆرینەکانیش بێت – لەباتی ئەوەی نیشاندەری باش بوونی ئەو دەوڵەت یان حکوومەتە بێت، نیشانەیەکە بۆ ئەوەی رەنگە بتوانرێت لەمەڕ چۆنایەتی ئەو دەوڵەتەوە گومان پەیدا بکرێت"[٣٢]. ئەم قسەیەی ژۆڤەنەل پەسەندی قسەکەی تۆگڤیل دەکات کە دەڵێت: "ئەو ڕێسایە کفراوی و چەپەڵە کە بە هۆیەوە زۆرینەی خەڵك مافی ئەوەیان هەبێت لە کاری ولاّت بەڕێوەبردندا هەرچێکیان بوێت بیکەن".

کەوابوو ئەو بابەتە بنچینەییەی لێرەدا گەلاّڵە کراوە، توانایە (دووربینی و تەدبیری خەڵکە) لە کاری سیاسەتدا. ئەم فکرەی گوایە باشترین ڕژێم، حکوومەتی زاناکانە، فکرێکی کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانی کۆن و هەروەها ئەو بیرەی گوایە دیموکراسی لە ڕێگای نەفیکردنەوە چاکترین کەس هەڵدەبژێرێت (واتە شێوازی لابردن بەکاردەبات) بە هەمان رادە کۆنە. بە قسەی ئەفلاتوون، خودی سۆکرات ئەسینایییەکانی سەرکۆنە دەکرد لەبەرئەوەی لەبارەی پرسە سیاسیەکانەوە دەدوان "بێ ئەوەی فێری ئەمجۆرە بابەتانە کرابن و بێ ئەوەی لە ژێر دەستی مامۆستایەکدا دانیشتبێتن"[٣٣]. ئیمرۆش خەڵك و رای گشتی لەبەر ئەو رکوکینەیەی لە وشەی زۆرینە هەیانە، بە زۆری پاڵپشتی ئەم بیروڕایەن کە دەبێت رێگەی هەڵبژاردنی کارگێرانی سیاسی "زۆرتر رووی لەوە بێت کە پیاوانی خاوەن توانا بباتە پێشەوە". ئەمڕۆ زیاد لە جاران وشەکانی "کارناس – پسپۆری و تەکنیسیەن دەبنە هاومانای وشەی "خاوەن توانا".

ئەم شێوازەی بەرگری کردن لە چەمکی "توانا – صلاحیەت" گەلێك تەماویە. چونکە یەکەم، پێناسەکردنێکی یەك لایەنە لە صەلاحیەت بوونی نییە و صەلاحیەت "توانا" دەتوانێت شێوەی جیاواز بگرێتە خۆی. بەلاّم بە تایبەت بەیەك زانینی دوو چەمکی "توانایی" و "زانست و ئاگاداری" کارێکە هەمیشە رەخنەگرانی دژی دیموکراسی دەیکەن و بێگومان گەلێك مەترسیدارە. ماکس ڤێبر هەموو تایبەتمەندیەکانی جیاکەرەوەی زانا لە سیاسەتمەداری لە نامەیەکدا شیکردۆتەوە. هۆی دانانی سیاسەتمەدارێك لە پۆستێکی تایبەتدا پتر

لەوەی کە لە زانست و ئاگایی ئەوەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەمەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەم سیاسەتمەدارە زانست لە خزمەتی کام ئامانجدا بەکاردێنێت؟ مرۆڤی سیاسی مرۆڤی زانا نیە. مرۆڤی سیاسی مرۆڤێکی بڕیاردەرە، مەبەست لە سیاسەتمەداری "بێ توانا" بە هیچ کلۆج ئەو مرۆڤە نییە زانیاریەکانی کەم بێت. مەبەست لە سیاسەتمەداری بێ توانا ئەو کەسەیە ناتوانێت لە مەسەلەی دیاریکردنی هێڵێکی سیاسیدا بڕیاربدات. مرۆڤی سیاسی "پیاوە خاوەن تواناکان" و تەکنیکارەکان لە دەوروبەری خۆیدا کۆدەکاتەوە و مەسەلەی دۆزینەوەی شێوازی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی لە ئەستۆ دەنێت، لەبەر ئەمە، کاری سیاسی لەگەڵ زانست و توانای زانستدا یەکسەر بێ پەیوەندی نییە. بەڵام یارمەتی وەرگرتن لە تەکنیسیەن و پسپۆڕان شتێکە و سپاردنی کاری دیاریکردنی ئامانجەکان بەوان، شتێکی ترە. ئەگەر بمانەوێت کاری حکومەت بسپێرینە دەستی پسپۆرانەوە، دەبێت بزانین لەبەرئەوەی بڕیارە سیاسیەکان لە هەمان حاڵدا لە خۆگری ناکۆك بوونی بەرژەوەندی بڕیاردەرەکان و فرەیی چارەسەرە رەخساوەکانە، دەبێت تەدبیرێك وەرگیرێت کە فەرمانی پسپۆران بنرخێندرێت و پێداچوونەوەی تێدا بکرێت. بەڵام ڕۆژگاری ئێمە کە ئەفسانە لە خاوەن تەکنیکەکان (تەکنۆکراتەکان) داماڵراوە، وردە وردە ئەم بابەتە لەبیر دەکات. بەمجۆرە پسپۆران یان خاوەن هونەرەکان لە سنووری پراکتیکی رۆڵی خۆیاندا دێنەدەر و بە خێرایی حکومەتی خاوەن تەکنیکەکان (تەکنۆکراسی) شەرعیەت پەیدا دەکات و بەم بیانووەوە گوایە ئاڵۆزی روو لە زیادبوونی مەسەلە گشتیەکان، بە ناچاری سیاسەتمەداران بەو کەسانەوە وابەستە دەکات کە "لێی دەزانن"، خەڵك لە دەسەڵات بێ بەش دەکەن و لە هەمان حاڵدا، خودی چەمکی سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵات دەبێتە دووکەڵ و بە با دەدرێت.

زیادەڕۆیی لە گرنگی و بایەخی "توانا"دا بە لۆژیکی بەو ئەنجامە دەگات کە پسپۆڕێکی دراو بکرێتە وەزیری دارایی. ئابووری زانێك بکرێتە وەزیری ئابووری و مامۆستایەکیش بکرێتە وەزیری پەروەردە و فێرکردن و هتد.. ئەگەر وا بکەین، لە راستیدا لەبیرمان چۆتەوە کە هەر "وەزیر – تەکنیسیەن"ێك حەز لەوە دەکات بیر و ئەندێشەکانی هەلاوێردەی زانستە پیشەییەکەی خۆی بباتە پێشەوە و لە گۆشەنیگای بەرژەوەندیە پیشەییەکانیەوە کە خۆشی وابەستەیەتی، تەماشای کێشەکان بکات. جگە لەوە، نابێت لەبیربکرێت پسپۆر بوون لە بوارێکی دیاریکراوی زانستیدا بە هیچ کلۆجێك لێهاتووییەکی گشتی بۆ پسپۆرەکە دروست ناکات تا بتوانێت لە زەمینەی جێی مەبەستا سیاسەتێك دابڕێژێت. ژاکماریتەین[٣٤] دەیگوت، " کاتێك دیموکراسی لێك هەڵوەشێتەوە، سیاسەت دەبێتە موڵکی پاوەنکراوی کۆمەڵە پسپۆرێکی دیاریکراو" ئەم خاڵەش تەواوی ڕاستیە. تۆکڤیل یەکێکە لە چاودێرە درەوشاوەکانی بەرجەستەی سیستەمە سیاسیەکان. ئەو کاتەی لۆیی ناپلیۆن ئەوی بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا دانا، کارێکی کرد کە بە تەواوەتی پێچەوانەی بیروبڕواکانی بوو. واتە بۆ دوبارە بەرقەرار کردنەوەی حکومەتی پاپا لەشکرکێشی کردە سەر کۆماری ڕۆما و خنکاندی. گیزۆ کە ئەویش سیاسەتی سەردەمی خۆی باش دەناسی، ئەو دەمەی گەیشتە پۆستی سەرۆکایەتی دەوڵەت، هەروەك تۆکڤیل رەفتارێکی بێ شەرمانە و بێ لەبەرچاوگرتنی رای گشتی گرتە پێش. لە رابردووی

نزیکتر بە خۆمانەوە، دەتوانرێت گەلێك نموونەی تر بدۆزینەوە.

مەترسی هەڵخلیسکان بە تایبەتی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت کە تەکنیسیەن لەبەر ئەو پسپۆریەی هەیەتی، دوچاری ئەم وەهمە دەبێت کە بە شێوازی عەقڵی و رێگەی بابەتیەوە نە تەنیا دەتوانرێت ئامرازەکانی گەیشتن بە ئامانج دیاری بکرێت، بەڵکو دەتوانرێت ئامانجەکانی کاری سیاسیش دیاری بکرێت. ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە فاکتۆرە ئابووری و تەکنۆلۆژیەکان خەریکن فاکتۆرە سیاسیەکان دەدەنە لاوەو پسپۆرانی ئەمجۆرە زانست و فەننانە بە پشت بەستن بە بەڵگە هێنانەوەی "تێك ئالۆزاوی کۆمەڵگەی تەکنیکی"، دەیانەوێت کاری بەڕێوەبردنی وڵات کە لە راستیدا بەڕێوەبردنی کاروباری مرۆڤە، بگۆڕن بە بەڕێوەبردنی کاروباری شتەکان. وێڕای ئەمجۆرە بەڵگاندنانە، هەر ئەم خاوەن فەننانە دەریدەبڕن کاتی لابردنی ئایدیۆلۆژیەکان هاتووە. ئایە ئەوەی کە وەزیرانی ئابووری و دارایی بۆ چەندەمین جار دەبنە سەرۆك وەزیر، ئەم مەبەستە دەرناخات؟ بەمجۆرە دەبینین لانی کەم لە دنیای فیکردا، ئامانجەکان تێکەڵ بەیەك دەبن و دەبنە یەك ئامانج لێپرسراوانی کاروبار بەڵگەی "گیروگرفتی دەرەکی" و "سەختگیرییە پێویستەکان" دێننەوە، تا باشتر خەڵك باوەڕ بکەن کە لە فلان رەوشدا دەتوانرێت "تەنیا و تەنیا یەك سیاسەت" بەکارببرێت. بە گوزارشتێکی تر، رێگەیەك بۆ هەڵبژاردن لە ئارادا نییە. بەڵام بە گوێرەی پێناسەکاری، سیاسەت هونەری هەڵبژاردنە و لە دیموکراسیدا مۆڵەتی "هەڵبژاردن" ئەمەیە کە بە "کاری دەنگدان" هەرە باشترین هەڵدەبژێردرێت و دەردەکەوێت، جا ئەگەر "هەڵبژاردن" لە گۆڕێدا نەبێت، ئیتر دەنگدان بە کەڵکی چی دێت؟ و لە بنەڕەتەوە هەڵبژاردن مانای خۆی ون دەکات. بە کورتی چەمك یان ئەفسانەی "توانای تەکنیکی" بەم مانایەیە کە کاری سیاسی و مێژوویی، کارێکی لاوەکیە و لەبەر ئەمە چەمکێکە بە خەستی دژی دیموکراسیە.

بەڵام ئایا رەخنەی ئەو کەسانەی لەو بڕوایەدان هەڵبژێرەکان "توانا" یان نییە، پتەوترە؟ لێرەدا وا دێتە بەرچاو کە بەرهەڵستانی دیموکراسی چەمکی سەلاحیەتی گشتەکی لەگەڵ چەمکی سەلاحیەتی تایبەتدا بە هەڵە تێکەڵ دەکەن. کەوابوو لەم حاڵەتەدا ئەوەی لە هەڵبژێر چاوەڕێی دەکەن، ئەمە نیە لە بوارێکی تایبەتدا بە وشیاریەوە بڕیار بدەن دەبێت چی بکرێت؟ (ئەمەش دەبێتە رەنجی بەفیرۆچوو) ئەوەی لە هەڵبژێر چاوەڕێ دەکرێت ئەوەیە کە بە دووربینی و وریاییەوە جیاوازی نێوان لێهاتوویی و لێنەهاتوویی پاڵێوراو لێك بکاتەوە.

بەڵام ئایا هەڵبژێرەکان بە گشتی زۆر بێ توانان؟ ئەمە بەو جۆرە نییە. لەلایەك، ئەگەرچی مەیلی بەشداری کردن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا مەیلێکی رەوایەو دەشێت بێتە دی و دەستی پێڕابگات، بەڵام ویست و حەزی ئەوەی وڵاتی مرۆڤیش راست و دروست بەڕێوەببرێت، حەزێکی رەوایەو دەشێت بێتەدی، بەڵام مەیلی یەکەم شتێك نییە جگە لە هۆی بەدیهێنەری مەیلی دووەم. "فرانچە سکۆنیتی" کەم تا زۆر بەرهەقە لەوەی کە دەڵێت: "خەڵك عەوام و میان مایەن، بەڵام پێیان خۆش نییە کەسە کەم مایەکان کاروبارەکانیان بەڕێوەببەن"[٣٥]. خەڵك حەز ناکەن بەڕێوەبەرێتی کارەکانیان بسپێرنە دەستی کەسانێك کە لە خەڵکانی تر جیاواز نین و وەك کۆمەڵانی خەڵکن. خەڵك حەز دەکەن لەلایەن کەسانێکەوە بەڕێوەببردرێن کە بەڵگەی قەناعەت پێکەر بۆ

ڕێزگیری و ستایشی ئەو کەسانەیان لاهەبێت. بە پێچەوانەی وێناکاری گشتییەوە، هەڵبژێر نایەوێت کەسێك هەڵبژێرێت کە ڕێك و ڕاست لە خۆی بچێت. هەڵبژێر و دەنگدەر گەورەیی و مەزنی ڕێزیان خۆش دەوێت و ئەگەر ئەم سیفەتانە لە کەسێکدا بەدی بکەن، لێکی دەکەنەوە. ئەگەر هەڵبژێر ترسنۆکیش بێت، بوێری و ئازایەتی خۆش دەوێت. هەڵبژێر ئاگای لە سیاسەت نییە، بەڵام سیاسەتی خوازراوی خۆی لێکدەکاتەوە. ڕاست وەکو ئەو کەسەی دەتوانێت جوانی و نازکی پەردەیەکی نیگار تێبگات و تەنانەت ڕەخنەگری هونەریش بێت، بێ ئەوەی بتوانێت نیگاربکێشێت؛ یان ئەوەی حەز لە کتێبێکی دڵچەسپ و دڵگیر بکات، بێ ئەوەی خۆی بتوانێت بنووسێت. ئەرەستوو کە لە لایەنگرانی یەکسانی نەبووە، دەڵێت: "جەماوەر یان ڕەشایی گەورە لە تاکەکان پێك هاتووە و ئەگەر جیاجیا و یەکەیەکە تەماشای تاکەکان بکەین شایستەییەکی ئەوتۆیان نییە. بەڵام ئەگەر ئەم تاکانە کۆببنەوە، لەو کەسانە بەهێزتر دەبن کە خاوەنی شایستەیین. کەوابوو ئەمجۆرە چاکەیە، چاکەی تاك نییە، بەڵکو چاکەیەکە لە دۆخی کۆدا خۆی دەنوێنێت"[٣٦]. ئەو پرسەی لێرەدا گەڵاڵە دەکرێت، ئەمەیە لێهاتوویی و سەلاحیەتی تایبەتی خەڵك چیە و لە چ زەمینەیەکدا دووربینی خەڵك چاکتر خۆی نیشان دەدات؟ ئەو بێزاری و نەفرەتەی چینی سیاسەتباز لەناو خەڵکدا دروستیان کردووە، پڕ واتایە. کەمن ئەو هاووڵاتیانەی بتوانن بە وردی باسی ئەو شتە بکەن کە لە کرداری پیاوە سیاسیەکاندا نەفرەت ئەنگێزە و دەبێتە هۆی ئەوەی کەمتر بڕواو متمانەیان پێبکەن. ڕاستینە ئەمەیە خەڵك لە ناخەوە هەست دەکەن سیاسەتمەدارانی ئیمڕۆ، چاوەڕوانیە ڕاستەقینەکانیان بەجێ نایەنن. لەبەرئەمە زیادەڕەوی نییە ئەگەر بیربکەینەوە هەرچی پتر هاووڵاتیان ئاگایان لە دڵبەستەیی و پەیوەندیە هاوبەشەکانی ناوخۆیان هەبێت، باشتر دەتوانن ئەو بڕیارانەی پتر لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا گونجاو بێت لێك بکەنەوە، بەو مەرجەی هەلودەرفەتی هەڵبژاردنی ڕاستەقینەیان بۆ بڕەخسێندرێت و پڕوپاگەندە و عەوام فریوی ئەم هەڵبژاردنە چەواشە نەکات.

لەم بارەوە، ناتوانرێت بایەخ و گرنگی ئەم دیاردە ڕاستەقینەیە واتە ئاگادار بوونی خەڵك و گەل نەبینرێت کە بەهۆی بوونی ویژدانی نەتەوەییەوە، نوێنەرانی ئەو گروپەی سیستەمێکی سیاسی — کۆمەڵایەتی تایبەت داخواز دەکەن، دڵبەستەی فەلسەفەیەکی هاوبەش دەکەن. ئەم فەلسەفە هاوبەشە دروستکەری جۆرێکی هاوبەشی هەستی وابەستەبوونە کە بۆ هەر کام لە تاکەکان، دەبێتە سەرچاوەی ئەرك و لەبەرچاوگرتنی ئەم ئەرکانە، تاکەکان لە گۆرەپانی ڕکەبەری و کێش و واکێشە تایبەتەکان بەرزتر دەکاتەوە. لەم زەمینەیەوە ریمۆن پۆلێن دەنووسێت: "ڕەوابوونی دەوڵەت تەنیا گوزارشت لە حورمەت گرتنی بنەماکانی حکومەت و دەستووورە بنەڕەتیەکان و ڕێزگرتن لە یاسا و شێوازە یاساییەکانی پەیوەست بە هەڵبژاردنی کارگێرانیەوە نیە (...) سەرچاوەی شەرعیەت جێگرتووە لە کۆمەڵە پرەنسیپێك کە بە گوێرەی ئەو پرەنسیپانە هاورایی بە کۆمەڵی قووڵی خەڵك بەدی دێت. ژێرخانی هاورایی و گردبوونەوەی نەتەوەیی، مێژوو و ئاسەوارە کولتووریەکانی گەل و سەرکەوتنەکانی لە کێشمەکێشی ژیانیدایە و، لە هەمان حاڵدا، هاورابوونی نەتەوەیی پشت بەستوو بە پەیامێکی نەتەوەییە، واتە بانگهێشت کردن بۆ ئەوەی گەل لە ڕێگەی ئافراندنی بەرهەمە کولتووریەکانەوە، ئایندە

بنیات بنێت. هاورابوونی به كۆمەڵ ئەمەیە، گەلێك له عەینی بەردەوامكردنی نەریتەكەیدا، پەیتا پەیتا چوارچێوە و سنوورەكەی تێپەڕێنێت. هاوارابوونی نەتەوەیی پشتبەستوو به وێناكردنێكی تایبەت له مرۆڤ، له كۆمەڵگا و له سیاسەت. ئەم هاورابوونه قووڵه خۆی له خۆیدا بەم ئەركه راسپێردراوە، مێژووی ئایندەی گەل بەدەستی خودی گەلەوە بنیات بنێت و له رۆحی هاوبەشی ئەو هاورابوونه ئیلهام وەربگرێت. ئەنجامه ریز بەستووەكانی وەرچەرخانی مێژووی كۆمەڵگایەك، تایبەتمەندیەكانی ئەو كۆمەڵگایه زیاد دەكات. بەڵام كۆمەڵگا دابڕاو لەم تایبەتمەندیانە، كاری بنیاتنانی كولتور درێژە پێدەدات. ئەم كولتووره بزوێنەری بزووتنەوەیەكه و ئەو بزووتنەوەیەش گیانی نەتەوەییە. گیانی نەتەوەیی له راستیدا سیستەمێكی بیروبڕوای داپۆشراوو دەرنەبڕاوە كه دیمەنه هۆگرەكان و یاره هاودڵەكان و كولتووری تایبەتی هەركام له تاكەكانی گەل، توخمه پتەوەكانی پێكدێنێت. له كۆمەڵی ئەم توخمانە، پرەنسیپی هاوتەبایی و پەسەندكاری بەدی دێت. ئەم پرەنسیپانه له هەر مرۆڤدا، له بیروبڕوا دەربڕاوەكانی زۆر قووڵترە. هەستی هاودڵ بوونی نەتەوەیی له هەستی وابەستەبوون به گەلێكەوە و وابەستەبوون به كولتوور و خۆشەویستی نیشتمانەوە، سەرچاوە دەگرێت. بنەمای شەرعیەتی رژێمێكی سیاسی و بەرنامەیەكی سیاسی له هەر كۆمەڵگایەكدا، كولتوور و سیاسەتی كولتووری ئەو كۆمەڵگایەیە. كولتووری نەتەوەیی هەر كۆمەڵێك جۆرە رەوابوونێكی سیاسی بەدی دێنێت كه لەگەڵ مێژوو و كەسایەتی ئەو وڵاتەدا گونجاوە"[٣٧]. پاراستنی ئەم ویژدانه نەتەوەییه و جیهان بینیەكەی پشت سەری، ئیمرۆ پتر له جاران بۆته مەرجی یەكەمی كارایی دیموكراسی.

لەلایەكی ترەوە پێویسته ئاماژە به دوو جۆر راوەرگری گشتی بكەین: جۆری یەكەم راوەرگرتن و دەنگدانه بۆ وەرگرتن یان رەت كردنەوەی پێشنیارێك، واته بۆ راگەیاندنی بڕیاری خەڵكە. جۆری دووەم گەڕانەوە بۆ دەنگدانی گشتییه بۆ ئەوەی كەسانێك هەڵبژێردرێن تا دواتر بڕیار وەرگرن. شارل مۆرا دەیگوت: "ئیرادە و گرتنی بڕیار و كردەوە، كاری ژمارەیەكی كەم و له ژمارهاتووە. پەسەند كردن و قبول كردنی كاری زۆرینەیە". مۆرا كەم تا زۆر كێشەكه تێگەیشتبوو. (ئایا دیموكراسیەكانی رۆژگاری ئێمە وا ناجووڵێنەوە؟) له لایەكی ترەوە نەتەوەیەك دەتوانێت خواستەكانی خۆی به تەواوەتی له ئیرادەی سیاسەتمەدارەكانیدا ببینێتەوە. بەجۆرێك دەتوانرێت بگوترێت مادەم گەلێك پیاوە سیاسیەكانی خۆی پەسەند دەكات و به خەڵكانی تر حەز ناكات، ئەوا خواستی ئەوان به خواستی خۆی دەبینێت، بەڵام لەلایەكی تر هێندێك پرس و كێشه هەن كه دووربینی خەڵك پتر چارەسازیانە. چونكه ئەم پرسانه له قسەڵۆكی ئەو راستیانەن كه خەڵك لەگەڵیاندا هەڵس و كەوتێكی بێ ناوبژی و ئامادەبووتریان هەیه و باشتر دەیاننا‌سن. پرسی رێكخراوە ناوبژیەكان، واته رێكخراوە پیشەیی و پۆلێنیەكان و رێكخستنه ئەیالەتی و ویلایەتیەكان و هتد، كێسی بنەڕەتی جێبەجێكردنی دیموكراسی ناوچەییه[٣٨].

ئەو وێناكاریەی بەرهەڵستانی دیموكراسی له چەمكی گەل هەیانه، به شێوەیەكی سەرسووڕهێنەر بەو وێناكاریه دەچێت كه تاك خوازان له واتای ئەم وشەیه هەیانه. بەم مانایه كه بەرهەڵستانی دیموكراسی وەك تاك خوازان، گەل به كۆمەڵەیەك له

یەکە و تاکەکان دەزانن و ئەم بەرهەڵستکارانە "تاك" بە خاوەنی لێهاتوویی و سەلاحیەت نازانن، لە ئەنجامدا کۆی "تاك"ەکان واتە گەلیش بە خاوەنی لێهاتوویی نازانن. بە کورتی ئەمەیە، بەرهەڵستکارانی دیموکراسی یەکسەر گەل لەبیردەکەن. دیارە ئەم شێوە لێکدانەوەیە، لە خۆگری پێوانە و پێوەرێکی تایبەتە. هەڵبەت دەتوانرێت گەل وەك هۆکارێکی بێ بایەخ و کەم بەها لە قەڵەم بدرێت، بەڵام بە پێچەوانەی ئەم بیروبڕوایەوە، ئێمە لەو بڕوایەداین، گەل چەمکێکی بنەڕەتی مێژووی کۆمەڵگاکانە و ناتوانرێت گومان بکرێت گەل و نەتەوە دەبنە سەرچاوەی شەرعیەتی سیاسی و بەرهەرحاڵ ناکرێت لەیەك کاتدا هەم گەل وەك یەکێك لە فاکتۆرە بنەڕەتیەکانی کاروباری وڵاتداری بزانرێت و هەم هەموو روخسارەکانی دیموکراسی یان بە وتەیەکی تر هەموو شێوەکانی "هێزی گەل" بنرێتە لاوە.

بە بیروڕای ئێمە چەمکی گەل لە تایبەتمەندیی هەموو توخمە پێکهێنەرەکانی بەرینترە. چەمکی گەل هەمەکیەتێکی هاوچەشن و رێکە. لەبەرئەمە، تایبەتمەندی و چۆنایەتی تایبەت بە خۆی هەیە. چەمکی گەل لەگەڵ چەمکی جەماوەردا (رەشایی بەرین) جیاوازە. لە چەمکی "گەل"دا جۆرێك جموجۆڵی خۆیی هەیە کە لە خۆیەوە دێتەدەر. جەماوەر، پێکهاتەی کۆمەڵێك تاکی جیا لە یەکترە کە بە کاتی و بە شێوازێکی نادیار لە دەوری یەك کۆبوونەتەوە و هیچ جۆرە هەستێکی وابەستەبوونیان بەیەك نییە. چەمکی گەل بە کوورەی تواندنەوەی ئاسن دەچێت کە تێیدا تاکەکان شکڵ دەگرن و سەرئەنجام دەبنە هاووڵاتی. ئەگەر بەمجۆرە تەماشای پرسەکە بکەین، دەبینین کە پەیامی دیموکراسی، بە قووڵی پەیامێکی نەتەوەییە.

بەو مەرجەی چەمکی نەتەوە وەك شێوەی سیاسی چەمکی گەل تێبگەین. ماددەی یەکەمی دەستووری کۆماری وەیمار[٣٩] بە راشکاوی دەڵێت "هێزی دەوڵەت لە گەلەوە سەرچاوە دەگرێت". لەبەرئەمە دەتوانرێت بگوترێت هێزێکی سیاسی ئەودەمە رەوایە کە وەڵامدەرەوەی خواستە قوولەکانی گەل بێت و هەلێکی وا بداتە هەموو هاووڵاتیان کە لە وەرچەرخاندنی مێژووی کۆمەڵگاکەیاندا بەشداربن. بەمانای تەواوی وشەکە، زانینی دیموکراسی شتێك نیە جگە لەوەی کە گەل هەست بکات لە باری سیاسیەوە لە رژێمێکی دیموکراتیدا دەژیت و بەگوێرەی توندبوون و تیژبوونی ئەم خۆزانینە، چالاکانە لە کاروباری کۆمەڵگادا بەشداری بکەن.

بەڵام نە تەنیا دیموکراسیە لیبراڵەکانی رۆژگاری ئێمە چەمکی گەلیان وەك چەمکێکی هاوچەشن (ئۆرگانیك) قبول نییە، بەڵکوو ئەو هەنگاوە سیاسیانەی دەینێن پتر دەگەڕێتەوە بۆ تێکدانی گەل و لەت لەت کردنی و تاخم سازی و حیزب سازی و سەرئەنجام دروستکردنی کەسانێکە کە لە بنج و بناوانەوە بەرامبەر بەیەك بێگانەن. هۆکەشی ئەمەیە کە دیموکراسیە لیبراڵەکان، ئیتر ئەو ورە هاوکاریە تایبەتیەی دیموکراسیەکانی یۆنان و رۆمی کۆنیان نییە. سەرچاوەی دیموکراسیەکانی ئیمرۆ، تاکپەرستی تایبەتی دینی کرستییان و عەقڵ خوازی فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدەهەم و جیهان بینی پرۆتستانتە ئینگلیز و ساکسۆنیەکانە. لەم دیموکراسیە تازانەدا، "هاووڵاتی" ئەو کەسە نیە کە بە هۆی ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ خەڵکدا هەیەتی، دانیشتووی گۆڕەپانی یەك مێژوو بێت و خاوەنی یەك چارەنووسی وەك هەموو هاونیشتمانیانی تری خۆی بێت. لەم دیموکراسیانەدا هاووڵاتی گیانلەبەرێکی رووتە کە کات کاریگەری تێدا نییە،

جیهانێکه و دابڕاو له هەر جۆره وابەستەبوون به نەتەوەیەك یان وڵاتێکی تایبەتی خاوەنی مۆڵەقێك "مافی مرۆڤە" که رانەگوێزراو و بەسەر نەچووه. لەم دیموکراسیه لیبراڵانەدا چەمکی مرۆڤ به تایبەت به گوێرەی بەهرەی له هەست پێکردنی چێژ و ئێشدا پێناسه دەکرێت. پۆل وۆن دەڵێت مرۆڤ له حوکمی "یەکێك له توخمه پێکهێنەرەکانی نفووسدایه" و به دەنگێکی له هەست داماڵراو درێژەی پێدەدات، تاك توخمێکه، "بەهەمان ئەو مانایەی که ئامارگرەکان له گروپێکی میکرۆب یان کۆمەڵێك دار قسەدەکەن". به واتایەکی تر، ئەم دیموکراسیه لیبراڵانه، تا ئەو ئاسته مرۆڤ بچووك دەکەنەوه که دەڵێن تان و پۆی مرۆڤ له هەوای خۆپەرست پێکهاتووه و بنەمای کاری ئەم مرۆڤەش پرەنسیپی بەرابەریه (یەکسانیه). چەمکی گەل جێگەکەی لەگەڵ چەمکی ناڕوونی کۆمەڵگادا دەگۆڕێتەوه. لێرەدایه که نووسەرێکی لیبرال وەك جۆڤانی سارتۆری دەڵێت، "پەیوەندی دیموکراسی لەگەڵ سیاسەتدا وەك پەیوەندی سیستەمی بازاڕه لەگەڵ ئابووریدا"!

فرانچەسکۆ نیتی دەنووسێت، دیموکراسی تازه چ له باری ناوەرۆکەوه و چ له باری ئەو پەرەسەندنەی له جیهاندا پەیدای کردووه، له بنەڕەتدا ئەمریکاییه"[٤٠]. بەو مانایه دەتوانرێت بگوترێت گشتگیرکردنی لەگەڵ گشتگیرکردنی ورەی ئەنگلۆساکسۆندا هاوجووت بووه. بەمجۆره جێی سەرسووڕمان نیه که دیموکراسی لیبراڵ چەمکی گەل بەکارناهێنێ و زمانی ئینگلیزی له بنەوه وشەیەکی بۆ دەربڕینی ئەم چەمکه پێ نییه[٤١]. بنەڕەتی دیموکراسی تازه ئەمریکاییه و ژێرخانەکەی سەروو سروشتی (میتافیزیکی) و کریستیانیه. بڵاوکراوەی سەربەخۆیی ئەمریکا (١٧٧٦) به راشکاوی دەڵێت "هەموو مرۆڤەکان یەکسان خوڵقاون" و ئەم یەکسانیه له هاووڵاتی بوونیانەوه سەرچاوەی نەگرتووه. "خودا هێندێك مافی رانەگواستراو و لێوەرنەگیراوی پێ بەخشیون" و "ئەم راستیانه له خۆیاندا ئاشکرا و سادەن". بەمجۆره، یەکسان بوونی سیاسی مرۆڤ له پەیوەندی یەکسانی گیانی هەر تاکێك لەگەڵ "پەروەردگاری جیهاندا" سەرچاوه دەگرێت. لەم رووەوه، چەمکی "دەسەڵاتی گەل، تەنیا رووی رواڵەتی پەیدادەکات و به کردەوه دەسەڵات دەبێته دەسەڵاتی ئیلاهی.

لێرەدا تێدەگەین بەهۆی چیەوه لایەنگرانی دیموکراسی لیبراڵ له هەمان حاڵدا که دەسەڵات به هی گەل دەزانن، به زۆری به گومانەوه سەیری خەڵك دەکەن. فرانچەسکۆنیتی دەڵێت، "گەل شتێك ناخوڵقێنن، واته هیچ شتێك له نەبوونەوه ناهێننه بوون. ئەو کارەی خەڵك دەیکەن ئەمەیه که پێشوازی له بەروبووی کۆششی تاکەکان دەکەن و له شوێنێك دەیانپارێزن". لەم حاڵەتەدا، زاراوەی "دەسەڵاتی گەل" شتێك نییه جگه له فۆرموولێکی کار رێکخەر نەبێت. هەر بەو شێوەیەی ژۆرژ بۆردۆ بەهەق دەیڵێت: "یەکێك له کارەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا ئەمه بوو، چەمکی گەل وەك پارێزەری ئازادیه تاکەکەسیەکان جێگیر بکات. بۆ گەیشتن بەم مەرامه، چینی بۆرژوازی یارمەتی دا تاکوو ئەم چەمکەی گەل رەسمی بکرێت و پەرەی پێبدرێت. لەم کارەدا سوودی بۆرژوازی رەچاوکرابوو، چونکه بەمجۆره حکومەتەکەی پتەوتر دەبوو. چینی بۆرژوازی نیگەرانی گەل بوو، چونکه هێزی گەلی دەناسی. لەم رووەوه بۆ بەڵاوەگێڕی و دوورکردنەوەی ئەو مەترسیەی هەڕەشەی له گیانی دەکرد، چەمکی گەلی لەناو خەرمانەیەکی شته پەتیەکاندا تواندەوه تاکوو راستیه مەترسیدارەکەی لێ لاچێت"[٤٢].

لەوەها هەل و مەرجێکدا، ئەم مەترسیە دێتە پێش کە لە ڕژێمی لیبراڵدا دیموکراسی پەیوەندی تەواوی خۆی لەگەڵ گەلدا بپچڕێت و "هێزی گەل" ئیتر هێزی هاوولاتیانی ولاتێکی دیاریکراو نەبێت. رینە کاپیتان بە باشی تێگەیشتووە "لە کۆمەڵگایەکی تاکپەرستدا (ئەندی ویدۆئالیست) بیری هاوبەشی کردن بە هیچ کلۆج ناتوانێت جێبەجێ بکرێت[٤٣]. لەم ڕووەوە لە لای لیبراڵەکان بوونی تاك لە پێشەوەی کۆمەڵگادایە و کۆمەڵگا پێکهاتوو لەو تاکانەیە هەر کامیان بە دوای کاری خۆیانەوەن و ئامانجی دیاریکراو پەیڕەو دەکەن. لەبەرئەمە، لیبراڵەکان لەو باوەڕەدان کە ژیانی کۆمەلایەتی لە گەردیلەکان واتە تاکەکان پێك هاتووە و بۆیە گەل و نەتەوەکان لە بیروباوەڕی ئەم لیبرالانەدا حوکمی ئەو سەرخانە ناجێگیرە زوو گوزەرانەیان هەیە کە مانا و چەمکێکی ئەوتۆیان نییە. لە ڕوانگەی کاپیتانەوەو بە پێچەوانەی بیروڕای باسکراو، پەرەسەندنی دیموکراسی نە تەنیا بە مانای فۆرمی رێکخستنی دەوڵەت نییە، بەڵکوو وەك چەشنێك لە پەیوەندی مرۆڤایەتی لەگەڵ پەرەسەندنی بواری کاری بە کۆمەڵی رێکخراودا هاوپەیوەندە. لەم شێوازە روانگەیەدا کۆمەڵگا بەتایبەتی لەو تاکانەی هەرکامیان بەدووی کارو ژیانی خۆیانەوەن، پێك نەهاتووە. بەڕای کاپیتان، کۆمەڵگا گرنگیەکی روو لە زیادی دەداتە بنکە[٤٤] و رێکخستنە بە کۆمەڵەکان، لە حاڵێکدا ئەم رێکخستن و کۆمپانیا و بنکانە نە تەنیا لە کۆمەڵی هەوڵدانی کەسی تاکەکانەوە پێك نەهاتوون، بەڵکو بە هۆی پسپۆڕانەبوونی کاری ئەندامەکانیان و یەکێتی ئیرادەی ئەم ئەندامانە، رێکخستن و بنکە و کۆمپانیاو... خەسڵەتێکی ئۆرگانیك (ئەنداموار) پەیدا دەکەن[٤٥].

بەو جۆرەی باسکرا، "دەوڵەتی پشتبەستوو بە گەل" دەوڵەتێکی بە راستی دیموکراتیە و لەگەڵ دەوڵەتی لیبراڵدا هەرگیز بە هەڵە تێکەڵ ناکرێت. دیموکراسی لە پلەی یەکەمدا چەشنێك هێزە و لەبەرئەمە لە خۆگری جۆرێك دەسەلاتی رەوا یان چاوگی (ئۆتۆریتەیە). دەوڵەتی لیبراڵ خوازیاری سنووردارکردنی دەسەلاتە و بە گشتی بە چاوێکی گوماناویەوە سەیری هەر چەشنە دەسەلاتێکی رەوا دەکات. دیموکراسی شێوازێکی ولاتداری و جۆرێك کردەوەی سیاسیە. لیبرالیزم چەشنێك ئایدیۆلۆژیایە خوازیاری سنووردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەتە و سیاسەت کەم بایەخ دەکات تاکو وابەستە و هەڵواسراو بە ئابووری بکات. دیموکراسی لەسەر بناغەی دەسەلاتی گەل بنیات نراوە، لە حاڵێکدا لیبرالیزم لەسەر بناغەی مافەکانی تاك پێکهاتووە.

تۆکۆیل لە بەرگی یەکەمی ئەو کتێبەی دەربارەی دەزگا سیاسیەکانی ئەمریکا نووسیویەتی، یەکەمین کەس بووە جیاوازی و ناکۆکی نێوان لیبرالیزم و دیموکراسی لێك کردۆتەوە[٤٦]. لە مێژووی سیاسی فەرەنسادا لێك هەلاواردنی ئەم دوو بابەتە بەشێوەیەکی بەرچاو دیاریکراوە. بەو مانایەی لە ئینگلتەرە و ئەمریکادا دیموکراسی بە پەیکەرەی لیبرالیزمەوە جۆشی خواردووە، لە حاڵێکدا لە فەرەنسا بەراوەژووەی ئەم دیاردەیە رووی داوە. بە وتەیەکی تر، رۆسۆ بەر لە تۆکۆیل و بەنژامین کۆنستان هاتووە. بەم هۆیەوەیە کە سیستەمی سیاسی فەرەنسا خۆی لە خۆیدا سیستەمێکی ئامێتەیە و لە هێندێك لاوە لە خۆگری ناکۆکیە. بۆ نموونە لە دەستووری فەرەنسادا (١٧٩١) لەلایەك لە ژێر کاریگەری رۆسۆدا هاتووە "هەموو هاوولاتیان مافیان هەیە کە بۆ خۆیان یان لە ڕێگەی نوێنەرانیانەوە لە داڕشتنی دەستووردا

بەشداری بکەن"، بەڵام چونکە دەستوور دەربڕی ئیرادەی گشتییە، کەوابوو ناتوانرێت ئیرادەی گشتی بە گوێرەی ئەو پێناسەکاریە بە بریکاری بە کەسێك بدرێت. لەم ڕووەوە ئاماژەکردن بە گشت "نوێنەران" کە پێویستی بە پیادەکردنی دەسەڵاتە، پێشێلکەری ئەو کێشانەیە کە پێشتر لە دەقی دەستووردا هاتوون. کلۆد نیکۆلە لەو کتێبەی ئەم دواییانە لە ژێر ناوی "ئایدیۆلۆژیای کۆماری فەرەنسا"[٤٧]دا نووسیویەتی، بەباشی نیشانی داوە تا چ ڕادەیەك نەریتی سیاسی فەرەنسا لە نەریتی لیبرالیزمی ئینگلیز دوورە. ئەم نەریتە بە تایبەتی ئەو ناکۆکیەی بەرای بەنژامین کونستان لە نێوان ئازادی تاك و ئازادی بەشداری گشتی لە کاروباری سیاسی و هەروەها کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیدا هەیە، رەت دەکاتەوە. نیکۆلە دەنووسێت بەڕێوەبردنی وڵات لە لایەن کۆماری خوازەکانەوە بە شێوازی کۆنە، واتە حەزدەکەن لە کاری جێبەجێکردنی هێزدا بەشداری بکەن، تەنانەت ئەگەر ئەم جێبەجێکردنە لەلایەن نوێنەرانی ئەنجوومەنیشەوە ئەنجام بدرێت. بەڵام وەك دەبینین ئەم شێوە سیاسەتە، سیاسەتێك نییە کە ئامانجی سنووردارکردنی دەسەڵات بێت، بەو جۆرەی ئەنگلۆساکسۆن و لیبراڵەکان بڕوایان پێی هەیە. چەند ساڵێ پێش ئێستا "کارە دۆمالبەرگ" پیشانی داوە ڕژێمی فەرەنسا پتر رژێمی دەوڵەتێکی دەستوورییە تا ڕژێمی دەوڵەتێکی حقوقی[٤٨]. ئامانجی دەوڵەتی دەستووری "دابین کردنی باڵادەستی و یەکانەبوونی هێزی یاسا دانانە و تەنیا لە خۆگری پەیرەوی کردنی ڕێکخراوە دەوڵەتیەکانە لە یاساکان". لە حاڵێکدا گریمانە لەسەر ئەمەیە کە دەوڵەتی حقوقی "سیستەمێکی سنووردارکەرە کە نە تەنیا دەسەڵاتی ڕێکخراوە ئیداریەکان بەرتەسك دەکاتەوە بەڵکوو ڕێکخستنە یاسادانەرەکانیش بەهێندێ سنوور و قەید و بەندەوە دەبەستێتەوە"[٤٩].

بەرهەڵستکارانی دیموکراسی ڕەخنەیەکی تریش دەگرن، ئەویش ئەمەیە لەگەڵ پرەنسیپی یەکسانیدا نێوانێکی خۆشی نییە. هەڵبەت ئەو کەسانەی چەمکی یەکسانی بە "چەمکێکی لەخۆیدا سیاسی" رژێمە دیموکراسیەکان دەزانن، بە تەواوەتی بەرهەقن (ژۆلین فرۆند) بەڵام دەبێت لەسەر مانای ئەم وشەیە ڕێکەوتن ئەنجام بدرێت. هەروەك پێشتر دیتمان، لە یۆنانی کۆندا بەرابەری سیاسی ڕەنگدەرەوەی هیچ چەشنە بەرابەریەکی سروشتی نیە. بەرابەری لە یۆنانی کۆندا لە چۆنی هاووڵاتی بوونەوە سەرچاوەی گرتووە و هۆیەکە بۆ دابین کردنی ئازادی. تێکڕای ئەو نووسەرانەی یۆنانی کۆن کە ستایشی دیموکراسیان کردووە، لەبەرئەمە نەبووە کە لە دیموکراسیدا چەشنێك رژێمی لەناخەوە یەکسانی خوازیان دیبێت، بەڵکو ئەم بیرمەندانە لە دیموکراسیدا رژێمێکیان دیوە کە تێیدا هەموو کەس دەتوانێت بێتە ناو گۆڕەپانی رکەبەریەوە و لە ئەنجامدا لێهاتوو و هەڵبژاردەی رکەبەرەکان و سەرکەوتوو سەرهەڵبدات. ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماردا ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە "هەموو مرۆڤان، لە بەرابەرەوە بگرە تا نابەرابەر دەخەنە توێی چەشنێك یەکسانیەوە"[٥٠] ڕەخنە دەکات. ئەرەستوو بە راشکاوی دەڵێت ئەم دادگەریە هەم لە خۆگری یەکسانیە و هەم لە خۆگری نایەکسانی. هەروەها دەڵێت: "مرۆڤەکان وا بیردەکەنەوە دادپەروەری بەرابەریە. بەکردەوەش هەروایە، بەڵام نەك بۆ هەموان، دادگەری یەکسانیە بۆ بەرابەرەکان – هاوسانەکان – (واتە هاووڵاتیان). نایەکسان بوونیش راستەو بە کردەوەش هەروایە.

بەڵام نەك بۆ هەموان، بەڵكو تەنیا بۆ تاكە نابەرابەرەكان نایەكسان بوون هەیە (واتە بۆ ناهاووڵاتیان)[٥١]." بە قسەی تۆسیدید، خودی پریكلیسیش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت. یەكسانی پێویستی بەوە هەیە كە خوازیاری یەكسانی، شایستەیی خۆیی بسەلمێنێت و شایستەییش لەناو خەڵكدا بەیەكسان دابەش نەكراوە. هێندێك لە نووسەرە تازەكان بیروبڕوای هاوشێوە دەردەبڕن. فرانچەسكۆنیتی دەڵێت: "هیچ مرۆڤێكی ژیر ناتوانێت بیر لەوە بكاتەوە كە مرۆڤان لەگەڵ یەكتردا بەرابەرن"، و درێژەی پێدەدات: " دیموكراسی نە بە مانای بەرابەری مرۆڤانە و نە بەرابەری سامان و نە بە مانای بەرابەری بارودۆخی خەڵكە. ئازادی، ئەم هەلە بۆ هەموو خاوەن بەهرەیەك دێنێتە پێش كە شایستەیی خۆی بنوێنێت. دیموكراسی لەسەر بنەمای بەرابەری هاووڵاتیان لە بەرامبەر یاسا و بەرابەری لە باری بەدەست هێنانی پۆستە حكومیەكانەوە بنیات نراوە و بتەوێت و نەتەوێت هێندێك نابەرابەری پێكدێنێت كە ئەم نابەرابەریانە لە هەموو كۆمەڵگا وەرچەرخاوەكاندا، مەرجی پەرەسەندن و پێویستی بوونیانە[٥٢]. هەر لەم زەمینەیەدا جۆڤانی سارتۆری دەڵێت ئامانجی دیموكراسی رەخساندنی هەل و دەرفەت نییە بۆ بەرابەربوونی تاكەكان. دیموكراسی ئەركی ئەمەیە، هەلی یەكسان بداتە مرۆڤان تاكوو نابەرابەربن.

راستی ئەمەیە كە هەر بەو جۆرەی دوو وێناكاری لە ئازادی هەیە، دوو وێناكاری لە یەكسانیش هەیە. بەمجۆرە بەڕای ئیزۆكرات[٥٣] جۆرێك بەرابەری هەیە كە "بەشێكی هاوشێوە لە نێوان هەمواندا دابەش دەكات، بەڵام بە تاوانباری دەزانێت". هەروەها جۆرێك بەرابەری هەیە بۆ هەركەس بە گوێرە شایستەییەكەی[٥٤]. ئەم نووسەرە لە جێیەكی تردا دەڵێت: پلە و پایەی بەرابەر بۆ بەهرە نابەرابەرەكان دیاری ناكرێت و لەگەڵ هەركەسدا بەگوێرەی بەهاو بایەخی هەڵسوكەوت دەكرێت و پاداشت دەدرێت"[٥٥]. لە بارەی یەكەمیانەوە، ئەوا كێشەی یەكسانی حسابێكە كە هەمان رێسای ئاسایی ژمارەكانە و لەبارەی دووەمیشیانەوە، كێشەی بەرابەری ئەندازەیە كە چەمكی هاوتەراز بوونی تێدایە. لە روانگەی ئەرستوودا یەكسانی دوو جۆرە. بەرابەری لە باری ژمارەوەو یەكسانی لە باری شایستەییەوە"[٥٦] و نابێت یەكەمیان دووەمیان بخنكێنێ. لە فەلسەفەدا، بەردەوام لێك جوداكردنەوەی نێوان ئەم دوو چەمكە دەبینرێ و هەر بەم هۆیەوەیە كە لە بەرهەمەكانی ژان بۆدنی فەرەنسیدا "رێژەی ژمارە" لە "رێژەی هارمۆنیكی" واتە تەرازی ئەندازەی هاوئاهەنگ جیایە و دژایەتی لەگەڵدا هەیە[٥٧].یەكسانی ئەندازەیی لە پەرەنسیپی ناسراوی "هەركەس بە گوێرەی شایستەبوونی" پەیرەوی دەكات. (فرەدریكی یەكەم، ئیمپراتۆری پرۆس دەیگوت: بۆ هەر كەس بەقەد خۆی". پرەنسیپی بەرابەری ژمارەیی ئەوكاتەی دەبێتە چەشنێك ئامانجی كۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی رەوشێكی هاوسان و هاوتەراز كە تەنیا لە وەها رەوشێكدا دەتوانێت بەڕاستی بجوڵێ و كاریگەر بێت.

خوێنەر زۆر زوو تێگەیشتووە، دیموكراسی لیبراڵی تازە لەبەرئەوەی كە ئایدیۆلۆژیای یەكسانی خواز لە دینی كریستانیەوە سەرچاوەی گرتووە و ئەو دینە هەڵگر و گوێزەرەوەی بووە، پتر وێناكاری ژمارەیی یەكسانیان لە نێوان خەڵكدا بڵاوكردۆتەوە. بەگوێرەی ئەم وێناكاریە گریمانە لەسەرئەمەیە بەرابەری مافەكان لە چەشنێك بەرابەری سروشتیەوە هاتووە و لووتكەی خوازراو ئەمەیە كە بەرەبەرە پێی

بگەین. ناتوانرێت ئەم بەرابەریە "سروشتیە" لە رێی ئەزموونەوە بسەلمێندرێت و ئەگەر سەرپۆشەکەی لەسەر هەڵگرین، دەبینین کە لە راستیدا "پێویستیەکی رەوشتیە"، واتە لە راستیدا جۆرێك بیروباوەڕە[٥٨].. بەڵام بە پێچەوانەی بەرابەری ژمارەیی، بەرابەری ئەندازەیی ریشەی لەناو راستیەکاندا هەیە و ئەو کاتەی دەبێتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ دیموکراسی، دیموکراسی واز لە دژایەتی کردنی چەمکی بەهرە و شایستەیی دێنێت. بەرابەری سیاسی لە پلە و پایەی هاوولاتی بوونەوە سەرچاوە دەگرێت و مەبەست لە بەرابەری "شانس" یان بەرابەری دەرفەتەکان ئەمە نیە وا کار بکرێت مرۆڤەکان بارودۆخی بەرابەر پەیدا بکەن. مەبەست لە بەرابەری "شانس" ئەمەیە کە نابێت نابەرابەری کۆمەڵایەتی ببێتە هۆی ئیمتیازی ئەم کەس بەسەر ئەو کەسدا یان لە قەزاو قەدەرەوە سەرچاوە بگرێت. چونکە ئەمانە (واتە نابەرابەری سیاسی سەرچاوە گرتوو لە نەبوونی پایەی هاوولاتی بوون و نابەرابەری لە شانسس و بەختدا) فاکتۆرگەلێکی لە دەرەوەی بواری تەسەروف و دەسەڵاتی مرۆڤەوەن. بەرابەری سیاسی و بەرابەری شانس لە راستیدا شتێك نین جگە لە چەند ئامراز بۆ گەیشتن بەو رەوشە کۆمەڵایەتیەی کە لانی کەم نزیکتر بێت لە بارودۆخی خوازراو.

بەپێی ئەم بەڵگەو هۆیانە، دەتوانرێت گومان لە هێندێك لەو بروا سەپێندراوانە بکرێت. بە تایبەت ئەم بروایە کە دەڵێت پێویستی دیموکراسی ئەمەیە، هێزی دەوڵەت لاواز بێت و ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، دەبینین دیموکراسی، لاوازی دەوڵەتی کردۆتە جێگرەوەی "دەسەڵاتی رەهای" دەوڵەت. لە مێژووی ئەوروپادا زۆرینەی حکومەتە پادشاییەکان تا دوا رادە لاوازبوون و لە دەوڵەتەکانی رۆژگاری ئێمە کەمتر دەستیان لە هەموو کاروبارەکان وەرداوە. حکومەتە پادشاییەکانی خولەکانی رابردوو چ لە باری سەرچاوەوە و چ لە باری ئامێر و ئامرازەوە لە دەوڵەتە تازەکان لاوازتر بوون. پادشاکان، سەرەڕای ئەوەی هێزیان وەك "ئەمانەتی خواپێداو" گرتبووە دەست، شتێك نەبوون جگە لە خاوەنانی هێزی خواپێداو کە سەرچاوەیەکی پیرۆزی هەبوو و بەراوێژ لەگەڵ راوێژکارانیاندا پادشاییان دەکرد. (نمونەی زەق، پادشایەتی لۆیی چواردەهەمە. لە سەردەمی ئەودا ئەنجوومەنە ئەیالەتیەکانی فەرەنسا ئەم مافەیان هەبوو فەرمانەکانی کۆکردنەوەی سەرانە لە دەفتەری جێبەجێکاریدا تۆمار نەکەن).

لەم بارەوە، تۆکڤیل دەنووسێت: "لەو خولانەی نەجیب زادەکان خاوەن دەسەڵات بوون، واتە لە سەدەکانی بەر لە سەدەی ئێمە، تاکی دەسەڵات بە دەستی زۆر پەیدا دەبوون و دەسەڵاتداری سەردەم، گەلێك بێ توانا بووە. وێناکاریەکی روون لە کۆمەڵگا نەبووە و کەسی دەست ڕۆیشتووی جۆربەجۆر هێزیان بەکاردەهێنا و بە ناو، کاروباری هاوولاتیانیان بەڕێوەدەبرد[٥٩]. دیموکراسیە تازەکان هێزی تاك و کەسەکانیان سنووردار کردووە، بەڵام هێزی خاوەن دەسەڵاتانی کۆمەڵگایان بە بەرفراوانی بەهێزتر کردووە. کلۆد پۆلەن تەنانەت دەگاتە جێگەیەك دەڵێت: "بەرلەوەی بیری دەسەڵاتی نەتەوەیی لەلایەن کەسێکەوە وێنابکرێت، خەڵك تەنانەت لە دنیای خەیاڵیشدا گومانیان نەکردبوو، لەوانەیە هێزی مرۆڤ رەها بکرێت"[٦٠]. ئەم وێناکاریەی کە دیموکراسیە تازەکان هێزە لاوازەکان دەکەنە جێگرەوەی هێزە کامڵە پادشایەتیەکان، راست نیە. بە پێچەوانەوە، ئەمە دیموکراسی بووە کە پرەنسیپی دەسەڵاتی گەلی لە تیوریدا کردۆتە هێزێکی بێ حەدو سنوور. لە فەرەنسا بەر لە

شۆڕشی مەزن "پادشا کەسێك بوو تەنیا پایەیەکی بەرزی هەبوو، واتە لەسەرەوە بوو". ریشەی وشەی سۆڤەرەین[٦١] لە زمانی فەرەنسیدا پەسەندکەری ئەم لافەیە. شازادەی فەرمانڕەوا لە بەرامبەر خەڵکدا هێندێك ئەرکی هەبووە، بەڵام چ لە باری ئامانجەوە و چ لە باری ئامرازی کەڵك لێوەرگیراو بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، خاوەن دەسەڵات نەبووە. تایبەتمەندی سەرەکی دەسەڵاتی گەل پێچەوانەی ئەمەیە. واتە پرەنسیپ ئەمەیە کە هیچ فاکتۆرێك دەسەڵاتی گەل سنووردار ناکات. دیموکراسی بیری "هێزی رەها" فریێ نادات، تەنیا ئەم بیروڕایەی کە هێز روخساری ئیمتیازی کەسێك بێت، قبول ناکات.

هەر بەمجۆرە دیموکراسی "یاسای دەسەڵاتی بەهێزتر" ئینکار ناکات. هەر جۆرە حکومەت ناچارە "بەشی گەورەی" هێز لە جێگەیەکدا جێگیر بکات. دیموکراسیش لەم رێسایە بەدەر نییە. دیموکراسی خوازیاری ئەمەیە کە دەسەڵاتی گەل هێزێکە دەبێت لە بەرامبەریدا سەری رێز دابنەوێنرێت، ئەگەر نا تەماشای بکەین، پرەنسیپی زۆرینەش جۆرە یاسایەکە کە هەق بەلایەنی دەسەڵاتدارتر دەدات. هێز لە دەنگەکانی گەلدایە. دەنگی گەل پتر دەربڕی هێزە تا نوێنگەی راستی. پاسکال دەیگوت، "بۆچی مرۆڤەکان پەیڕەوی زۆرینە دەکەن؟ ئایا بەم هۆیەوەیە کە هەقدارن؟ نا، بەم هۆیەوەیە کە زۆرینە، زۆری پتری هەیە".

لە ١٩٤٢دا ژۆزێڤ شۆمپەتەر، دیموکراسی وەك شێوازێك پێناسە دەکات کە بە گوێرەی ئەو شێوازە دەتوانرێت، دەوڵەتێکی بەهێز بهێنرێتە سەرکار تاکوو بەهێز و دەسەڵاتەوە هەڵسوڕێت[٦٢]. گرینت پازی[٦٣] دەڵێت "ئازادی و یەکسانی بەشی لەت نەکراوی پێناسەکاریە کۆنەکانی دیموکراسی بوون و لە روانگەی شۆمپەتەرەوە بەشی خۆیی پێناسەکاری دیموکراسی نین، ئێستا هەرچەندیش ئەم دوو توخمە واتە ئازادی و یەکسانی ئامانجە شایانی ڕێزبن". لە لایەکی ترەوە، سارتۆری دەنووسێت "دیموکراسی بە هیچ کلۆج رقی لە هێز نیە و لە دیموکراسیدا نهێنی هێزی داپۆشراو و جێگرتوو لە چاوگی (ئۆتۆریتەکەی) دایە". ژۆلین فرۆندیش هەر ئەم بڕوایەی هەیە، بەڵام لە بابەتی بڕیاردانەوە. ئەم لێکۆلەرەوەیەش "دیموکرات بازی" رەت دەکاتەوە کە "راوێژ" و "گفتوگۆ" بە تاکە ڕێگای بەڕێوەبەری وڵات دەزانێت و دەڵێت هیچ کۆمەڵگایەك، تەنانەت کۆمەڵگایەکی دیموکراتیش، ناتوانێت بایەخ نەداتە فرمانی بنەڕەتی "بریارگرتن"ەوە. سروشتی مرۆڤ، سروشتی هەڵبژێرە و بڕیارگرتن لە سروشتی مرۆڤدا لاوەکیە و بڕیارگیری و فرمانی هەڵبژاردن لە باری چەمکەوە، لەگەڵ یەکترا هاوپەیوەستن[٦٤]، لەبەرئەمە پێویستێتی بڕیاردان، بوونی هێزێکە بتوانێت لە کاروچالاکیە بریاردەرەکاندا خۆی بنوێنێت.

دەزانین کە لە رۆمی کۆندا، وشەی "دیکتاتۆری" لە بنەوە لەگەڵ دیکتاتۆری بە مانا ئیمرۆژیەکەیدا جیاوازە. دیکتاتۆر نە تەنیا رەتکەرەوە و بەرهەڵستی لەبەرچاوگرتنی رواڵەتی سیاسی (فۆرم) نیە، بەڵکو بەرگری لێکەریشیەتی. لە رۆمی کۆندا دیکتاتۆریان بۆ ئەرکێکی دیاریکراو و بۆ ماوەیەکی دیار لەسەر کار دادەنا تاکوو لە خولە قەیراناویەکاندا بتوانێت لەگەڵ ئەو گیروگرفتە تایبەتیانەی پەیدا دەبن، بەربەرەکانێ بکات. خودی رۆسۆش لە راستی "بارودۆخی ئاوارتە" بێ خەبەر نەبووە. ڕۆسۆ دەنووسێت "ئەگەر کۆمار بکەوێتە مەترسییەوە، دیکتاتۆری جۆری رۆمی کە لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتیدایە، دەتوانرێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە. لەم دۆخەدا دیکتاتۆری نە تەنیا زیان بە دەسەڵاتی نەتەوەیی ناگەیەنێت بەڵکو تەنیا

ڕێگەی پاراستنیەتی". "ڕزگاری وڵات" لە سەرووی جێبەجێکردنی هێزی یاساکانەوەیە.

هیتلەر لە کتێبی "شەڕی من"[٦٥]دا دەنووسێت: "دەربازکردنی وشترێك لە کونی دەرزیەکەوە ئاسانترە لە دۆزینەوەی کەسایەتیەکی گەورە لە ڕێی هەڵبژاردنەوە". (هەڵبەت ئەم بابەتە نەبووە کۆسپ لەبەردەم هەڵبژێرانی خۆیدا). لەم گوزارشتەدا، لە یەکێك لەو هۆیانەی بەگشتی دژە دیموکراتەکان بەڵگەی لێدەهێننەوە، کەڵکی وەرگرتووە. ئەم لێکدانەوەیە دەگاتە ئەو ئاکامەی کە دیموکراسی بە پێچەوانەی لافی هێندێك دیموکرات، لەگەڵ حکومەتی "بژارەکاندا"[٦٦] دژبەر نییە. بە پێچەوانەوە، دیموکراسی وەك ئامرازێکی دڵنیاکەر پێشکەش کراوە کە دەتوانرێت بە هۆیەوە بژارەکان بدۆزرێنەوە و پۆستە بەرزەکانی وڵاتیان پێ بسپێردرێت. بەڕای ئەرەستوو کاری هەڵبژاردن مادەم کە باشتر، کەسەکان هەڵدەبژێرێت، چۆنایەتیەکی ئەرستۆکراتیانەی[٦٧] هەیە. هەڵبژاردن لە ڕاستیدا جۆرێك باشتر بژاردنە (هەڵبژاردن باشترین) و لە زمانی فەرەنسیدا وشەی کارامە و هەڵبژاردە و چاوگی "هەڵبژاردن" یەك ریشەیان هەیە. کاری دیموکراسی بە گشتی لەسەر ئەمە ڕاوەستاوە کە هەر کات تێبینی کردبێت ئیتر ئیمتیازەکان ئەنجامی مەنتقی شایستەیی تاکەکان نییە، هەوڵی دەدا شایستەیی و لێهاتوویی بکاتە جێگرەوەی ئەو ئیمتیازانە. گریمانەی دیموکراسی ئەمە بوو کە بەهرە و توانست بکاتە جێگرەوەی ڕێکەوت و قەزا (ڕێکەوت لەم ڕووەوە بوو تاك لە بنەماڵەیەکی نەجیب زادەدا لەدایك بووبێت). بەمجۆرە لە باری تیۆرەوە ناتوانرێت دیموکراسی وەك سیستەمێکی نەیاری بژارەکان بیری لێکرێتەوە. دیموکراسی لەگەڵ بژارەکاندا مەبەستی شەڕی نییە. لەگەڵ شێوازی دانان و دیاریکردنیاندا ناتەبایە. هەروەها کامە ڕژێم لە پەیجۆیی پیاوە زانا و بە ئەزموونەکاندا نییە بۆ کارگێڕی دەوڵەت؟ هۆی ئەوەی دیموکراسی گەلێك کەسی شەیدای خۆی کردووە ئەمەیە دیموکراسی بە باشترین ئامراز بۆ ڕێکخستنی ئەو دیاردەیە زانراوە کە دەتوانرێت ناوی "دووەڵی بژارەکانی"[٦٨] لێبنرێت. هەموو ئەو نووسەرانەی لەو بڕوایەدان "چاکەی دیموکراسی لە ڕژێمەکانی تر زۆرترە (وەك مەنهایم و مادارپاگا و ئەوانی تر) لەسەر ئەم بیرە داکۆکی دەکەن کە یەکێك لە پێویستیەکانی دروست هەڵسوڕانی دیموکراسی، بوونی پیاوانی بەڕێوەبەر و بەتەدبیرە.

لە ۱۸۵۳دا تۆکۆیل دەنووسێت: "بەڕای لایەنگرانی دیموکراسی، بابەت ئەمە نیە ڕێگەیەك بدۆزنەوە تاکوو خەڵك خۆیان حوکم بکەن. پرس ئەمەیە چۆن خەڵك ناچار بکەن بەوەی کە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان، شایستەترین پیاوان هەڵبژێرن". لیپ سەت دەڵێت: "زەقترین توخمی دیموکراسی و بەنرخترین فاکتۆری دیموکراسی، پەروەردەکردنی بژارە سیاسیەکانە". بەڕای جۆڤانی سارتۆری، " دیموکراسی ئەو کاتە ڕاست هەڵسووڕاوە کە بژارە و بلیمەت و هەڵبژێردراوەکان کاروبارەکانیان بە ئەستۆوە گرتبێت. بوونی بژارەکان لە دیموکراسیدا نە تەنیا کەم و کورتی ئەم سیستەمە نیە، بەڵکو بە یەکێك لە دیدەوانە بنەڕەتیەکانی لە قەڵەم دەدرێت. کۆمەڵگایەکی دیموکراتی ئەو کاتە بەهێز دەبێت و حوکمڕانەکانی ئەو دەمە وەك حکومەتێکی خەڵك دۆست کارەکەیان بەرەو پێشەوە دەبەن، کە کەمینە لێپرسراو و شایستە بڕواپێکراوەکان، ژیانی خۆیان بۆ ئەم کارە تەرخان کردبێت". سارتۆری لێکدانەوەکەی لەم گۆشە نیگایەوە درێژە پێدەدات و دەڵێت، دەتوانرێت

دیموکراسی وەك حکومەتی هەڵبژێراوی چەند کەس پێناسە بکرێت. لەم جۆرە حکومەتەدا، هێز هی ئەو کەسانەیە لە کێبڕکێی بەرپاکراوی نێوان کەمینەکاندا، بەشداری دەکەن و دەنگەکانی زۆرینە بۆ خۆیان تەرخان دەکەن.

هەموو ئەم تێبینیانە نابنە کۆسپ لە ڕێی ئەمەی کە بەڕواڵەت پرەنسیپی زۆرینە نرخ و بایەخی ڕەهای هەبێت. ئەم بەهاو نرخە لە گرنگێتی و نرخی ژمارەوە سەرچاوەی گرتووە. لێرەدایە کە ئەم پرسیارە دێتە پێش ئایا پرەنسیپی زۆرینە و چەمکی دیموکراسی دوو بێژەی هاوتان؟ وەڵام ئەمەیە کە ئەم خاڵە بە هیچ کلۆج لەبەرچاودا نیە. چەمکی بنچینەیی دیموکراسی ئەمە نیە کە زۆرینە بریاربدات. بنیاتی راستەقینەی شەرعیەت و بەرهەق بوونی دیموکراسی لەمەدایە کە خەڵك، خۆیان فەرمانڕەواکانیان هەڵبژێرن. بە واتایەکی تر، ئەمە خەڵکن دەسەڵاتیان هەیە نە ژمارەی زۆرینە و کەمینە. ڕێسای زۆرینە تەکنیکێکە (چارەسەرێکە). رەنگە وەك دەیان شێوەی تر بێت کە بۆ ناسینی دەنگەکانی خەڵك لەبەردەستدان. لە بنەڕەتدا ناتوانرێت زۆرینەی خەڵك و ئیرادەی خەڵك بەیەك کار لە قەڵەم بدرێت. ئەم دوو بابەتە لە ڕووی گریمانەوە یان لە رووی ئەزموونی زانستیەوە بەیەك دەژمێردرێن. هەر لەبەر ئەمەیە ڕۆسۆ ئەوەندە گرنگی دەداتە تیۆری "ئیرادەی گشتی" خۆی و ژۆرژ بۆردۆ لە پاکانە کردن بۆ ئەم خاڵە. دەنووسێت: چەمکی ژمارە هیچ پەیوەندێکی لەگەڵ بنیاتی حقوقی و سیاسی و چەمکی گەلدا نیە. بیرمەندان بەر لە شۆڕشی فەرەنسا، هەمیشە لە فکری ئەوەدا بوون یەکجۆر چەمکی "ئیرادەی گەل" دابهێنن کە تەنیا یاسای وشك و برینگی خوازراوی زۆرینە نەبێت".

بە بیروڕای نەیارانی دیموکراسی، ئەو قسەیەی دەڵێت ژمارە واتە زۆرینە، هەمان ئیرادەی گەلە فکرێکی زمانیە و ئەو قسەیەش کە دەڵێت زۆرینە بەرهەقە، تەنیا لەبەرئەوەی کە ژمارەیان، ژمارەی زۆرینەیە، قسەیەکی بێ واتایە. بەڵام ئەمجۆرە رەخنەیە کە لە باری ڕواڵەتیەوە پاساودراوە، هەمدیس لە مەبەستی سەرەکی خۆی دوور دەکەوێتەوە، چونکە مەبەست لە پرەنسیپی زۆرینە دەربڕینی "راستیی" نیە. پرەنسیپی زۆرینە تاکە تایبەتیەك هەیبێت ئەمەیە کە ئامرازێکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بریاربدات. دەزانین لە سیاسەتدا، هەڵبژاردنی مرۆڤ تەنیا بە راستی و ناڕاستی واتە دروست و نادروست سنووردار نابێت. لە سیاسەتدا مرۆڤ لە نێوان چەندین کاری لواودا یەکیان هەڵدەبژێرێت. چەمکی زۆرینە پاڵپشت و سەرچاوەی راستیەکی ماتماتیکی نییە. تایبەتمەندی زۆرینە ئەمەیە کە پێمان دەڵێت لە باری سییاسیەوە چ شتێك لە بارە هەتاکوو هەڵیبژێرین. بەرتران دو ژۆڤەنەل بە باشی نیشانی داوە، بەدەگمەن دەتوانرێت وەسفی وەك "راستەقینە" و "درۆینە" لەسەر مەسەلە سیاسیەکان بگونجێنرێت. لەلایەك ئەم پرسانە بە زۆری هێندێك بیروبڕوا گەلاڵە دەکەن کە بە یەکسانی "ڕەوان" بەڵام لەگەڵ یەکتردا یەکسەر ناتەبان. لە لایەکی تریش هێندێك چارەسەر هەن کە بەر لە هەرشت پابەندی ئامانجی مەبەست کراون. ئەم ئامانجە بگۆڕە و پشت بەستوو بەو پێوەر و نرخانەیە کە لە باری عەقڵیەوە ناسەلمێندرێن.

باشترین هۆ لەسەر ئەوەی زۆرینە خاوەنی راستی نییە، هەر ئەو مافەیە کە بۆ کەمینە دایدەنێن. ئەگەر راستی بە تەنیا لە نێوان خێڵی زۆرینەدا پەیدا بوایە، دەبوا کەمینە خۆی لابدایە و لە نێو بچوایە و لەم حاڵەدا زۆرینەی دەنگەکان جێی کەمینەی

دەنگەکانی دەگرتەوە. هەمیشە هەموان ئەم هەڵەیەیان دووبارە کردۆتەوە جا چ راستگرەکان و چیش چەپگرەکان. مەگەر سۆسیالیستەکانی فەرەنسا لە ١٧٩٨ دا نەیاندەگوت کە رکەبەرەکانیان لە باری حقوقیەوە خەتابارن و هەڵەکار، چونکە لە باری سیاسیەوە لە کەمینەدان؟

## ژێر نووسەکان

*1-peter L. Berger, "Lo democrotie dans le monde, in Diologue, 2/1984, 2-6*

ئەم لێکۆڵەرەوەیە (پتر بەرژە) بۆ راکردن لەو کێشمەکێشە دەڵێت: جیهانگیری دیموکراسی لەمەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە سیستەمی دیموکراتیدا، باشتر لە سیستەمە سیاسیەکانی تر، تایبەتمەندی نەتەوەکان دەپارێزرێت. لەلایەکی تر بەرژە دەڵێت کە دیموکراسی لیبراڵ بنیاتەکەی لەسەر وێناکاریەکی کۆمەڵگا دانراوە کە تێیدا، تاك وەك "گیانلەبەرێکی خۆبەرێوەبەر" گەڵاڵە دەکرێت. وا دیارە ئەم لێکۆڵەرەوەیە ئاگای لێنیە کە لە زۆرێك لە سیستەمە کلتووریەکانی جیهانی سێیەمدا، پرسی تاك لە بنەڕەتدا بەمجۆرە گەڵاڵە ناکرێت.

٢-جۆڤانی سارتۆری لەو کتێبەدا لە لاپەڕەکانی پێشوودا دەڵێت: باشترین بەڵگە بۆ پەسەندکردنی دیموکراسی ئەمەیە کە ئەمجۆرە رژێمە ئامادەی وەرگرتنی چاکسازی و گۆڕینە. لەگەڵ ئەمەشدا، تەنیا هەبوونی دەرفەتی گۆڕین ببێ دەبێ لە پێش ئەوەی نەبوونی دەرفەتی گۆڕینەوە نیە. جگە لەمە مانای وشەی "گۆڕین" دوو پاڵۆیە. ئەگەر مەبەستمان ئەمە بێت کە دیموکراسی روو لە کامڵ بوونە، قسەیەکی رسوامان گوتووە (چونکە هەموو سیستەمە سیاسیەکان روو لە کامڵ بوونن). ئەگەر گریمانە ئەمەیە کە دیموکراسی بە گوێرەی جەوهەرەکەی دەتوانێت جێگەکەی بداتە رژێمێکی تر، ئەوا لەم دۆخەدا هۆی باشتر زانینی دیموکراسی لە رژێمێکی تر نەناسراو دەمێنێتەوە. هەروەها ئەم هۆیەی کە دیموکراسی باشترە، چونکە زیاتر ئازادی دەداتە خەڵك، پێویستیەکەی ئەمەیە کە مانای ئەم وشەیە واتە ئازادی پێشتر روون کرابێتەوە، هۆی لە پێشتر بوونی ئازادی لە بەهاکانی تر رابگەیەنرێت. ئەم هۆیەی کە سیستەمی دیموکراتی باشترە چونکە ئیرادەی زۆرترین خەڵك حوکم بەسەر جێگیریەکەیدا دەکات، جگە لەوەی پێویست بە سەلماندنی هەیە، لزومی ئەمەیە کە وەڵامی بدرێتەوە کە بۆچی دەبێت رەزامەندی زۆرینە دابین بکرێت؟

٣-*Georges sorel* (١٩٢٢-١٨٤٨) کۆمەڵناسی فەرەنسی. بەناوبانگترین بەرهەمی "تێڕامان لەبارەی توند و تیژی"یەوەیە.

*4-Edouard Berth*

*5-pataud*

*6-pouget*

*7-pelloutier*

*8-proudhon*

*9-Blanqui*

*10-Bonald*

*11-Joseph de Maistre*

*12-charles Mourras*

*13-carlyle*

*14-spencer*

*15-montalambert*

١٦-ئێمە تەنیا چەند بابەتی دوایی بیر دەخەینەوە:

*Jean haupt, Le proces de la democratie, Decouverte. Lisbone, 1971, Amodee ol Andigne lequivoque democratique"> 1971, Michel Fromentaux, Lillusion democratique, NEL 1975: Jean Madiran: Les deux democraties – NEI 1977.*

هەموو ئەم رەخنەگرانەن و خوازیاری لەبەرچاوگرتنی نەریتن و لە سیفەتی رووکەش بوون و خۆشباوەڕیدا هاوبەشن.

١٧-"زۆرینەی خەڵك - رەشایی بەرین" لە زاراوەکانی مەعاریفی ئیسلامیەوە و لە کتێبە فیقهی و سیاسی و رەوشتیە کۆنەکاندا بە مانای جەماوەری خەڵك هاتووە. رەشایی خەڵك؛ رەشایی شار کە لە دوورەوە دەبینرێ - و.

*18-christian perroux, Laurore, avenir du passé, Table ronde, 1984.*

١٩-جۆڤانی سارتۆری دەنووسێت، "ئەگەر زیادەڕۆیی دیموکراتە کامڵ خوازەکان دانێینە لایەکەوە، تۆمەتەکانی دژ بە دیموکراسی شتێکی لێ نامێنێتەوە، کتێبەکەی سارتۆری کتێبێکی لیبراڵە و بەم وەسفەوە یەکێك لە باشترین و کامڵترین ئەو ریسالانە کە لە بارەی ئەم بابەتەوە لە بیست ساڵ پێش بەم لاوە نووسراوە.

*Giavanni Sartori, theorie de la democratie, p. 43.*

*20-Jean – Marie Le pen*

*21-tocqueville, De la democratie en amerique, Calmann – Levy, Vol, 3, 1888 p. 161*

٢٢-هەمان س.ل ٢٣١.

٢٣-لە ١٧٩٣ گوندیەکانی رۆژئاوای فەرەنسا کە شاپەرست بوون، لە دژی شۆڕشگێڕان هەڵستان و زیانی زۆریان پێگەیشتن -و.

*24-T.L Tamon, Claude polina*

٢٥-تەماشای وتاری من بکەن لە ژێر ناوی:

*"Un totalitarisme peut en cocher un autre". In Elements, 40, ete 1983, 21-27.*

*26-T.L Talmon, Les origins de la democratie Totalitaire, Calmann – Levy. 1966>*

*27-Jacqueline de Romilly, problem es de la democratie grecque, op. cit, p 19.*

*28-Taine, origins de la france cantemporaine -1875.*

*29-Max nordan*

*30-Andre Tardieu, Le souverain Captif, flammarion 1936.*

*31-Rene Guenon, La crise du monde, callimard 1946.*

*32-Bertrand de Jouvenel, De la souverainete medicis, 1955, - p> 349.*

*33-protasoras, X.*

٣٤-*Jacques Maritain*: فەیلەسووف و حەکیمی ئیلاهی فەرەنسەوی کە چەند ساڵی پێش کۆچی دوایی کرد. و.

*35-La democratie, op. cit, vol. 1, p. 134.*

*36-Aristote politique, III.*

*37-Raymond polin, Le liberalisme, espoir ou peril, Table Ronde, 1984. pp. 106-108.*

*38-charles Mourras, Enquete sur la monarchie, Nouvelle Libraire nationale, 1909. p. 137.*

٣٩-وەیمار (*Weimar*) ناوی شارێکە لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیادا. بەپێی ئەو دەستوورەی لە ١٩١٩ لەوەیماردا ئامادەکرا، ئەڵمانیا کرا بە کۆمار تا ئەوەی لە ١٩٣٣دا نازیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست و دەستووری ١٩١٩ لابرا. ئەو گوزارشتە ئەڵمانیەی لە مادەی یەکەمی دەستووری وەیمار کە لە دەقی فەرەنسی ئەم کتێبەوە گوێزراوەتەوە بەمجۆرەی خوارەوەیە:

*die staatszewalt zeht vam volke aus..*

*40-francesco Nitti. Op. Cit. Vol. 1, p. 58.*

٤١-ڕوون کردنەوەی جەخت لەسەرکراو هی نووسەرە فەرەنسیەکەیە کە دەڵێت بە ئەڵمانی بە خەڵك دەڵێن *volle* و بە ئیتاڵی *popolo*ی پێدەڵێن، بەڵام زمانی ئینگلیزی وشەیەکی بۆ ئەم چەمکە نییە. واتە وشەی *people* بە واتەی "کەس و تاکەکان و مرۆڤەکان"ە و دیاری ناکرێت. هەر لەبەر ئەمە، ناتوانرێت بەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا پێکهاتەی وەك "ئیرادەی گەل" و "گیانی گەلی" و "شێوازی بیری گەلی" و هتد، دروست بکرێت -و.

42-Georzes burdeau, La democratie. Pp. 24-25

43-Rene Capitant, Democraite et participation politique. Bordas. 1972. p. 33.

44-Entreprise

45-R. Capitant, ibid, p 34

٤٦-تۆکۆیل لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا، ئەو چۆنایەتیە سەرەرۆیانەی کە پێشتر دەیانخستە ئەستۆی دیموکراسیەوە، دایناوە بەحسابی سۆسیالیزم کە لەو کاتەدا کەم کەمە دادەرێژرا.

47-claude nicolet, lidee republicaine en france, Gallimard, 1981. p. 357.

48-R. Carre de malberz. Contribution a la theorie zenerale de l Etat, ed. Du CNRS, 1962 Vol. 1, p. 492.

49-etat legal – Etat de droit.

50-platon, Republique. 558 c.

51-Aristote, politique, III, 1180 a, II sp.

52-F. Mitti, op. cit. vol, 1, p. 39

٥٣-ئیزوکرات ناوی وتاردەرێکی خەڵکی ئەسینایە کە لە ٤٣٦ بەر لە زایینی مەسیحدا لەدایک بووە و لە ٣٣٨دا کۆچی دوایی کردووە. ئەو هەموو خەڵکی یۆنانی هاندەدا بۆ یەکێتی تا لە بەرامبەر سوپای فارسەکاندا خۆیان راگرن. و-

54-Areopazitique. 21-22.

55-Nicocles, 14.

56-Aristote, politique, V, I, 1301 a, 25 sq.

57-Jean Bodin, Les six liveres de la Republique VI. 6.

٥٨-دیارە تیۆری دیموکراسی تازە هێشتا وانەی پێویستی لە ئامۆژگاریەکانی ئەم دواییەی زانستە ژیانیەکان و ئەو رەتکاریەی دژی یەکسانی "سروشتی" مرۆڤەکاندا نووسراوە، وەرگرتووە. لەم زەمینەدا دەتوانرێت کتێب سوودمەندی ژۆلین شوورنی بخوێندرێتەوە کە خۆفی سیاسەتمەداران لە بەرامبەر پرسی داری ژیاندا سەرزەنشت دەکات و بانگی سۆسیالیستەکان دەکات کە سەرنجی زانستی ئۆژنیك (چاککردنی نژاد) بدەن:

Julien chererny, haro sur la democratie, mame 1973. “des incompatibilities du democratique et du zeneteque”. Chap. III. Pp. 119-152 eugenisme et socialisme, chap. IV, pp. 153-197.

59-tocqeville, op. cit, vol 3, p. 549

60-claude polin de la signification et des consequences du dozme de la souverainete populaire, in la lezitimite, janvier – mars 1981.

٦١-*souverain* لە فەرەنسا لە لاتینی *superus* وە دێت. بە مانای بەرز، بڵند. ماناکەی تری پادشا و باڵادەستە. -و-

62-joseph Schumpeter, capitalisme, et democratie payot, 1951.

63-geraint parry.

64-julien freund, oue veut dire; prendre une decision?, in nouvelle ecole, 41, automne 1984-50.

65-mein kampt.

66-ehlte.

67-politique, IV, 1300 b.4.

68-“circulation des elites”.

## سەرچاوە

کتێبی تأمل درمبانی دموکراسی،

نووسینی: ئالن دوبنوا

# تیۆرەکانی دیموکراسی

***Theries of democracy***
***-A Critical Introduction-***
***Frank Cunningham***
***Routledge – London 2002***
***P. 248***

**لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی**

نووسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "فرانك کۆنینگهام" مامۆستای فەلسەفە و تیۆرەی سیاسییە لە زانکۆی تۆرنتۆ، پێشتریش چەند کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە، لەوانە: "تیۆرەی دیموکراسی و سۆسیالیزم – ۱۹۸۷"، "جیهانی ڕاستەقینەی دیموکراسیەتی پاڵاوتەکراو – ۱۹۹٤"، لەم کتێبەشیدا نووسەر باسی تیۆرەی دیموکراسیمان بۆ دەکات؛ هەر لە سەردەمە دێرینەکانەوە تاوەکو ئێستا.

نووسەر بەرلەوەی بچێتە لای ژان ژاك ڕۆسۆ لە سەدەی هەژدەیەمدا؛ قسە لەسەر چەمکی دیموکراسی دەکات لای ئەرستۆ و، پاشانیش لە هەمان چەمك ئەدوێت؛ چ لای تۆکڤیل و چ لای شۆپیتەر لە سەردەمی تازەماندا. کتێبەکە لە پێشەکییەك و یانزە بەش پێکدێ، بەشی یەکەمی لەسەر کێشەکانی دیموکراسییە، بەشی دووەمی لەسەر دیموکراسیی لیبراڵ و بەتایبەتیش پەیوەندیی دیموکراسیی لیبراڵ بە سەرمایەدارییەوە. بەڵام لە بەشی چوارەمدا؛ لە دیموکراسی لیبراڵ و ئەو کێشانە ئەدوێت کە بە زەرورەت دەبێتە مایەی وروژاندنیان: بۆ نموونە وەکو چەوساندنەوەی کەمینە. بەشی پێنجەمیش لەسەر پلورالیزمی کلاسیکی و چۆنێتیی نوێنەرایەتی گەلە لەلایەن حیزبە سیاسییە جۆربەجۆرەکانەوە.

لە بەشی شەشەمدا نووسەر بە قووڵی لە مەسەلەی دیموکراسی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە. بەڵام لە بەشی حەوتەمدا باس لە دیموکراسی بەشداریکردن دەکات. لە بەشی هەشتەمیشدا بە فراوانی چەمکی دیموکراسی پراگماتی ڕووندەکاتەوە و ئەم پرسیارە دەکات: نرخی دیموکراسی چییە؟

ئینجا لە بەشی نۆیەمدا لە بارەی مەسەلەی دیموکراسیی ڕاوێژکارییەوە ئەدوێت. لە بەشی دەیەمدا چەمکی دیموکراسی ڕادیکاڵی ڕوون دەکاتەوە و لە دوابەشیشدا کە بەشی یانزەیەمە؛

ئەم مەسەلە گرنگە دەخاتە ڕوو: چۆنێتیی پراکتیزەکردنی تیۆرەکانی دیموکراسی؛ بۆ نموونە لە ڕێی بەجیهانیبوونەوە.

تێبینی دەکەین کە نووسەر زۆر هەڵوەستە لەسەر ژان ژاك ڕۆسۆ دەکات بەو سیفەتەی گەورەترین تیۆریستی دیموکراسییە لە چاخە نوێیەکاندا. هەر خاوەنی کتێبی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" بوو کە ڕێگای لەبەردەم شۆڕشی فەرەنسایی و سەروەریی گەل و حوکمی یاسا و دەنگدانی گشتیدا خۆش کرد.

گومان لەوەشدا نییە کە ڕۆسۆ سوودی لە بیرمەندە سیاسەتمەدارەکانی پێش خۆی بینیوە، بەتایبەتیش لە نووسینەکانی ماکیاڤێللی و مۆنتسکیۆ. بەڵام هەر بلیمەتییەکەی ڕۆسۆ خۆی لەم داهێنانە گەورەیە بەرپرسیارە، واتە: دیموکراسیی نوێنەرایەتی و حوکمی گەل.

وەکو ئەزانین ڕۆسۆ لە گەڕەکەکانی خوارەوەی شاری جنێڤ لەدایك بووە، واتە لە گەڕەکە هەژار و میللییەکاندا. بەڵام ئەو بە درێژایی ژیانی هەژارەکانی خۆشویستووە و کەیفی بە دەوڵەمەندەکان و ئەو ئەرستۆکراتانە نەهاتووە کە بەرلەوەی ڕۆسۆ بەناوبانگ بێت؛ بە چاوی قێز و ڕقەوە سەیریان کردووە.

تەنانەت کاتێ بەزەییان پیا دەهاتەوە؛ ڕۆسۆ ئەم بەزەییەی بەلاوە وەك زللەیەك بوو کە لە دەموچاوی بدرێ.

گەورەیی ڕۆسۆ لە چیدایە؟ داهێنانی گەورەی ڕۆسۆ لەم کتێبە مەزنەدا لەچیدایە، واتە: پەیمانی کۆمەڵایەتی؟ ئەو گەورەییە لە بۆچوونی تازەی ئەودایە بۆ مەسەلەی ئازادی و مەسەلەی یەکسانی، پاشانیش بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ مەسەلەی ئیرادەی گشتی. ڕۆسۆ بەر لە هەموو شتێك ئەو مەسەلە سەرەکییەی خستەڕوو کە هەموو حوکمێکی سەرزەوی دەگرێتەوە: مەسەلەی ڕەوایەتی. پرسیاری سەرەکی لێرەدا ئەمەیە: کەی حوکم ڕەوایەتیی ئەبێت و کەی نایبێت؟

ڕۆسۆ وایدەبینێت کە حوکمی تیۆکراتیی کۆن ڕەوانە نەبووە؛ لەبەرئەوەی لە سەرەوە بەسەر گەلدا سەپێنراوە. هەروەها ئەڵێت کە ئەو حوکمەی بە تەنها پشتئەستووره بە هێزی عەسکەری ڕەوا نییە. تاقە حوکمی ڕەوایە بەڕای ئەو، ئەو حوکمەیە کە لەسەر بناغەی پەیمانی کۆمەڵایەتی دائەمەزرێت. ئەمەش واتە هەر کەسێك لەناو کۆمەڵگادا بڕیار ئەدات سەر بە کۆمەڵ بێت و بە بڕیارەکانییەوە پەیوەست بێت، بەوپەڕی سەربەستییەوە ئەم بڕیارەش ئەدات. بەمجۆرە هەموو کەسێك لەناو کۆمەڵگایەکی ئازاددا؛ ئازاد دەبێت، لەبەرئەوەی ئەو یاسایانەی کە کۆمەڵ دایاندەنێت ئەنجامی دەنگدانی گەلن. بەمجۆرە هەر هاووڵاتییەك لێی بەهرەمەندە و لە دارشتنیاندا بەشدارە، ئەو بە تەنها پەیڕەوی لە ویژدانی خۆی و ئەو یاسا گشتیانە دەکات کە کۆمەڵگا دایاندەنێت؛ ئەو یاسایانەی کە گەل دەنگیان لەسەر ئەدات. بەمشێوەیە هاووڵاتی لەیەك کاتدا دەبێتە خزمەتگوزاری هەمووان و هەروەها هی خۆیشی، ئەمەش واتە پەیمانی کۆمەڵایەتی.

تۆ لە هەموو شتێکدا ئازادیت، جگە لە ملکەچبوونت بۆ ئیرادەی گشتی کە بەرەنجامی ئیرادەی تاکەکەسەکانە لەناو کۆمەڵگادا. کاتێکیش تۆ مل بۆ ئەو ئیرادەیە و بۆ ئەو یاسایانە کەچ ئەکەیت؛ وەك ئەوە وایە مل بۆ خودی خۆت کەچ بکەیت؛ لەبەرئەوەی تۆ خۆت لە دەنگداندا لەسەر ئەم یاسایانە بەشداریت کردووە.

"تۆکڤیل"یش، کە نووسەر زۆر لەسەری رادەوەستێت بیرمەندێکی فەرەنسییە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا ژیاوەو بە نووسینی ئەم کتێبە بەناوبانگە: دیموکراسی لە ئەمریکادا، تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بوو کە بەرەو "جیهانی نوێ" سەفەری کرد و لەوێ لە نزیکەوە چاودێریی

مەسەلەكانی كرد و ئەم ئەنجامەی بەدەستهێنا: لە كۆمەڵگای ئەمریكیدا یەكسانی لە هەر كۆمەڵگایەكی تری دونیا زیاترە، لانی كەم لەو سەردەمەدا: واتە سالآنی (١٨٣٥-١٨٤٠)، ئەم بیرمەندە سیاسەتمەدارە گەورەیە وایدەبینێت كە ڕیشەی خواستی یەكسانی لە خواستی ئازادی گەلێ قووڵترە لە ناو ناخی ئادەمیزاددا. بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ برسیی بوو ناتوانێ بیر لە هیچی تر بكاتەوە، بەمجۆرە تۆ ئەتوانیت لەسەر لەدەستدانی ئازادی سەبر بكەیت، بەڵام ناتوانیت لەسەر برسێتی سەبر بكەیت، هەر بۆیە هەژار ڕقی لە دەوڵەمەندە و دەیەوێ بگاتە ئاستی ئەو، یان دەوڵەمەند لە بەشەكەی خۆی بداتێ. بەمجۆرە گەر جیاوازی لە ساماندا زیاد لە پێویست بوو لە كۆمەڵگادا؛ ئەوكات خەڵك یاخی دەبن و شۆڕش بەرپا ئەكەن، لەبەرئەوەی دەیانەوێ نان بخۆن. ئەمەش مانای ئەوە نییە كە ئازادی بەلای مرۆڤەوە گرنگ نییە، بەڵام پێداویستی لە پێشتر هەن لە ژیاندا و عەدالەتیش بەردەوام لەو پێداویستییانەیە. بەڵام تۆكڤێل بڕوای وایە كە یەكسانی چەكێكی دوو دەمە. ئەگەر وای لە خەڵك كرد هەموو دەوڵەمەند و بەهێز و بەرێزبن، ئەوا یەكسانییەكی پۆزەتیڤە. بەڵام هەندێ جار ئەم یەكسانییە وا لە لاواز و هەژارەكان ئەكات دەوڵەمەندەكان بخەنە ڕیزی خۆیانەوە، بەمجۆرە هەموو دەبن بە هەژار و ئاستێكی نزمیان ئەبێت و، ئەمەش شتێكی نەگەتیڤە.

تۆكڤیل وایدەبینێت كە یەكسانیی كۆمەڵایەتی بە دڵنیاییەوە ڕێ بۆ یەكسانی سیاسی خۆشدەكات، بەڵام دەتوانین دوو جۆر لە سیستمی سیاسی بهێنینە بەرچاومان:/ یەكەمیان سەروەریی هەموو تاكەكانی گەلە. دووەمیشیان دەسەڵاتی ڕەهای تاقەكەسێكە بەسەر هەموو تاكەكەسەكانی كۆمەڵگادا. ئەمەش چ هەڵبژاردنێكی ترسناكە، ئەمریكیەكان بەر لە خەڵكانی دی ئەمەیان تاقیكردۆتەوە، بەڵام ئەوان بەڕادەی پێویست زیرەك و ڕەند و بیر ڕۆشن بوون و هەر بۆیە هەڵبژاردنی دووەم واتە دیكتاتۆریەتیان ڕەتكردەوەو پەنایان بردە بەر سەروەریی گەل و چارەسەری دیموكراسییانە.

دیموكراسی لە كۆمەڵگای ئەمریكیدا تەواو ڕەگاژۆ بوو. وای لێهات كۆمەڵگا خۆی حوكمی خۆی ئەكات و دان بە هیچ دەسەڵاتێكی دەرەكیدا نانێت. هەروەها گەل لە داڕشتنی یاساكاندا بەشدارە و ئەمەش لە ڕێی هەڵبژاردنی یاسادانەران یان ئەو نوێنەرانەوە ئەنجام ئەدرێ كە نوێنەرایەتیی گەل ئەكەن. هەر خۆیشیان لە ڕێی دەنگدانی گشتییەوە ئەندامانی دەسەڵاتی جێبەجێكردن هەڵدەبژێرن، بۆیە ئەتوانین بڵێین كە گەلی ئەمریكا خۆی حوكمی خۆی دەكات. ئەمەش پێناسەی دەقاودەقی دیموكراسییە. لە جیهانی سیاسیی ئەمریكادا گەل باڵادەستە؛ با وەك چۆن لەگەردووندا خوا باڵادەستە.

لە ڕاستیدا، لە ڕوانگەی تۆكڤیلەوە حوكمی دیموكراتیك حوكمێكی ڕەهایە، بەڵام نە حوكمی تاقە كەسێكی دیكتاتۆرە و نە حوكمی هەموو تاكەكانی گەلە، بەڵكو حوكمی زۆرینەی گەلە. چونكە هەڵبژاردنی ئازاد بەزەرورەت زۆرینە و كەمینەی لێ دەكەوێتەوە. پێویستە كەمینەش بە حوكمی زۆرینە قایل بێت لەبەرئەوەی ئیرادەی گەل وای ویستووە. هەر بۆیە پاڵێوراوی شكستخواردوو لە هەڵبژاردندا ناتوانێ گومان لە ڕەوایەتیی پاڵێوراوی سەركەوتوو بكات؛ چونكە بەوە وەكو ئەوە وایە گومان لە ئیرادەی گەلیش بكات، ئەوكاتیش هەموو ڕاستگۆییەك لەدەست ئەدات، هەر لەبەر ئەمەشە كە پاڵێوراوی شكستخواردوو یەكسەر بروسكەی پیرۆزبایی بۆ پاڵێوراوی سەركەوتوو دەنێرێت.

## سەرچاوە

بیان الكتب – العدد ٢٣٤، الأثنین ٢٨ اكتوبر ٢٠٠٢.

## دوا کۆچی ڕۆماننووسی گەورە عەبدولرەحمان مونیف

سەردەم

ڕۆژی ٢٠٠٤/١/٢٥ ڕۆماننووسی ناوداری عەرەب (عەبدولرەحمان مونیف) لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا لە دیمەشق دوا ماڵئاوایی لە خۆشەویستان و نووسین کرد. مونیف ساڵی ١٩٢٣ لە عەمانی پایتەختی ئوردون لە باوکێکی سعودی و دایکێکی عێراقی لەدایك بووە. هەر لەو شارە دواناوەندی خوێندوەو ساڵی ١٩٥٢ لە بەغدا کۆلێژی حقووقی تەواوکردوە.

ساڵی ١٩٥٥ لە زانکۆی قاهیرە درێژەی بە خوێندن داوەو ساڵی ١٩٥٨ بۆ خوێندن چۆتە بەلگراد و ١٩٦١ دکتۆرای لە زانستی ئابووری – نەوت تەواو کردوە.

مونیف ڕۆمانی عەرەبی لە قۆناغێکی تاڕادەیەك دەق بەستوو بە کێشە کۆمەڵایەتیەکانەوە کە زیاتر لای نووسەرانی میسرەوە سەری هەڵدابوو گوێزرایەوە بۆ ناو بزاوتی سیاسی و قەیرانی دەسەڵاتی عەرەبی لە بەرهەم نەهێنانی هیچ میتۆدێکی فیکریی ڕەسەن کە لەسەر بناغەی ئازادی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی و کێشەکانی تری ئەم سەردەمەی مرۆڤ دامەزرابێت. بەم پەیامە دەنگی نوێ خوازانەی خۆی هەڵبڕی و لەو پاشکۆیەتیە دەرچوو کە بە میراتی مابووەوە. ئەم هەوڵی تازەخوازیە لە یەکەم ڕۆمانیەوە (درەختەکان و تیرۆری مەرزوق) ١٩٧٣ دەست پێدەکات و سەردەکێشێتە ناو هەموو کارە داهێنانەکانی تریەوە. وەك (چیرۆکی خۆشەویستی مەجوسیەك) ١٩٧٤ و (خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ١٩٧٥) و (کۆتاییەکان) و (کێبڕکێی مەسافە دوورەکان) و (ئێستا.. لێرە) یان (خۆرهەڵاتی ناوەڕاستێکی تر) و (دنیایەکی بێ نەخشە) کە لەگەڵ جەبرا ئیبراهیم جەبرادا نوسیویانە و (شارەکانی خوێ) و پاشانیش پێنجینە ڕۆمانەکەی تری.

مونیف بێجگە لە ڕۆمان هەندێك کتێبی تری لەبارەی سیاسەت و ئابووری و ڕەخنەوە نووسیوە کە گرنگەکەیان (نووسەر و تاراوگە)یە.

مونیف بێجگە لەوەی نووسەرێکی بەهرەمەند و داهێنەر بوو، کەسایەتیەکی ڕووناکبیریی دیاری عەرەب بوو کە لە گەلێك بۆنەی بێزاری دەربڕین و هەڵشاخان بە ڕووی ڕژێمە عەرەبیەکاندا ناوی لەگەڵ ناوە درەوشاوەکانی تری دنیای ئەدەب و روناکبیریدا دەردەکەوت و هەرگیز بەوە قایل نەبوو ببێتە دەسکەلای سیاسەت و پەنایەکی ئارام و بێ سەرئێشە لە سایەی یەکێك لەو ڕژێمانەدا بۆ خۆی هەڵبژێرێت. ئەو وەك کارە ئەدەبیەکانی هەر بە جوامێری و سەربەخۆیی ژیا.

## زانست و سادەیی

کریشنا مۆرتی

لە فارسییەوە: شەیدا سەڵاح

ئێوە لە تەمەنی نەوجەوانیدا بژێون بۆ ئەوەی هەموو شتێك بزانن. دەتانەوێ بزانن ئەم

دنیایە چییە؟ ئەم زەوییە بەرفراوانە، ئەو خۆرە درەخشانە، ئەو مانگە رووناکە، ئەو ئەستێرە درەوشاوانە چین؟ مرۆڤەکان بۆچی هاتوونەتە ئەم دنیایە؟

بەڵام لەگەڵ گەورەبوونماندا، زانستمان تەنها وەکو کۆکردنەوەی زانیارییەکانی لێدێت، بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەستێکی تێدابێ. دەبینە کۆمەڵێك پسپۆڕ کە سەبارەت بە بابەتەکان شتی زۆر دەزانین و لە ئەنجامدا زۆر کەم لەو شتانە دەترسین کە لە دەوروبەرماندان و چیتر بایەخێك بە گەدای سەرشەقامەکان و ئەو پیاوە دەوڵەمەندە نادەین کە بە ئۆتۆمبیلەکەی تێدەپەڕێت.

هەرکات بمانەوی بزانین کە بۆچی لەم دنیایە تاکەکەسی فەقیر و دەوڵەمەند بوونی هەیە، دەتوانین وەڵامێکی بۆ بدۆزینەوە. ئێمە هەموو شتێکی دنیای بوون راڤە دەکەین و لەوە دەچێت بەو وەڵامانە قایل و دڵخۆش دەبین و ئەگەر زۆر وردبین بین، تێدەگەین ئایینەکانیش هەر ئەم کارە دەکەن: شیکردنەوە و وەڵامەکان دڵخۆشمان دەکەن و وا دەزانین کە بە دوای ئەو شیکردنەوانە زانستمان دەستکەوتوە.

ئایا مەبەست لە فێربوون تەنها ئەمەیە؟ ئایا ئێمە بۆیە فێردەبین بۆئەوەی لە دیاردەکان تێبگەین؟ یان ئەمەی کە تەنها بە دوای ئەو مانا و ئەنجامانەداین کە بە گومانی خۆمان خەیاڵمانی پێ ئارامبکەین و نەمانەوێ زیاتر لەوە بەدوایاندا بچین. دەشێ گەورەکانمان هەموو شتێکیان بۆ روونکردبێتینەوە، بەڵام ئەو کارە مەیل و ئارەزوومانی کووشتووە.

هەرکە گەورەتر دەبین زیانیش بەرەبەر ئاڵۆزتر و دژوارتر دەبێ. دنیا ئەوەندە زانستی جۆراوجۆر و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانابوونی زۆری تێدایە، کە وەختێ دەیانبینین وا دەزانین بە شیکردنەوە و راڤەکردن توانیومانە گرێی ئەو ئاڵۆزیانە شل بکەینەوە.

مرۆڤێك دەمرێت و ئێمە پاساوی بۆ دەهێنینەوە و لە ئەنجامدا ئەو پاساودانە هەستی رەنج و ئازارمان ئارامدەکاتەوە و سڕی دەکات.

دەشێ لە تەمەنی لاویدا دژ بە شەڕ هەستینەوە بەڵام کە گەورە دەبین پاساوێکی بۆ دەهێنینەوە و زەین و خەیاڵمان سڕ دەبێ.

ئەو شتەی لە تەمەنی گەنجیدا زۆر گرنگە ئەمەیە کە تەنها بە شیکردنەوە و راڤەکردن رازی نەبین، بەڵکو لەمە تێبگەین کە چۆن دەتوانین هووشیاربین و لە ئەنجامدا حەقیقەتەکان بدۆزینەوە و ئەگەر ئازاد نەبین هووشیاریش نابین. دەڵێن ئازادی تەنها لە کاتێکدا دەستەبەر دەبێ کە پیر و ئاقڵ و زانا بین. بەڵام پێویستە تا وەختی کە گەنجین ئەو ئازادییەمان هەبێ، نەك ئەو ئازادییەی کە هەر کارێ دڵمان ویستی بیکەین، بەڵکو پێویستە لە پێناوی دەرککردنی قووڵی غەریزە و خواست و ئەنگیزەکانمان ناتوانن لە ترس رزگارمان بکەن. هەموومان لە مردن و ترس لە مردن بە ئاگاین. بەڵام بە شیکردنەوەی مەرگ، مردن دەناسرێت و لە هەستی ترس لە مردن رزگاری دەستەبەر دەبێت؟

چەندێك زیاتر گەورە دەبین زۆر گرنگە کە بتوانین بە سادەیی بیربکەینەوە، سادەیی چییە؟ بە چ کەسێك دەڵێن سادە؟ ئایا ئەو کەسەی لە سووچەوە دانیشتووە و بەشێکی کەم قایل دەبێت، سادەیە؟ وا بیر ناکەنەوە کە سادەیی لەوە زۆر جیاوازترە؟ واتە سادەیی ناوەکی و دەرەکی.

ئێمە زۆر ئاڵۆزین. ئێمە خواست و ئارەزووی زۆرمان هەیە. بۆ نموونە ئێوە هیوادارن لە

ئەزموونەکانتاندا سەرکەوتووبن و کارێکی باشتان دەستبکەوێت. ئێوە هەندێ نموونەی دڵخوازتان هەیە کە دەتانەوێ خۆتان بە سیفەتی پەسەندکراوەکان و بەشێك لەوانە بزانن.

زەین گەلێك خواستی زۆری هەیەو لەم حاڵەتەدا ئایا دەکرێ سادەبن؟ ئایا گرنگ نییە کە لە حەقیقەتی کارەکە تێبگەن؟

زەینی ئاڵۆز ناتوانێ لە حەقیقەتی کارەکان تێبگات. ناتوانێ تێبگات کە چ شتێ حەقیقییە و ئەمە گرفتەکانمانە. ئێمە هەر لە منداڵییەوە وا پەروەردە دەکەن کە خۆمان لەگەڵ شتەکاندا بگونجێنین و، ئیدی نازانین چۆن خۆمان لە ئاڵۆزییە ناوەکی و دەرەکییەکان جیابکەینەوە و سادەیی وەدەست بهێنین. بەڵام تەنها زەینێکی زۆر سادە و هزرێکی راستەوخۆ دەتوانێ دەرك بە حەقیقەت بکات. لەگەڵ تێپەڕینی زەمەندا شتی زیاتر و زیاتر فێر دەبین، بەڵام زەینمان هیچ وەخت سادەبوونی دەستناکەوێ و تەنها زەینێك دەتوانێ داهێنەر بێ کە بە سادەیی بیر بکاتەوە. وەختێ سەبارەت بە دیمەنی درەختێك شت دەنووسن، چ ئەنگیزەییەك واتان لێدەکات لەسەر ئەو پەیکەرە شت بنووسن؟ ئایا تەنها بە نووسین و راڤەکردنی گەڵا و چڵەکان قایل دەبین؟ یان ئەمەی کە دارەکە هەستێکی لەناوماندا بێدار کردووەتەوە بۆیە دەربارەی دەنووسین؟ هەرکات دارەکە هەستێکی لەناوماندا وروژاندبێت و ئێمە بەپێی ئەو هەستە لەسەری بنووسین، ئەم هەستە چەندێکیش ئاڵۆز بێ دەستکەوتی سادەییەکی گەورەیە. لە تەمەنی گەنجیدا زۆر باشە ئەگەر زەیینمان زۆر سادەو بە دوور لە لەوتاوورییەکان بپارێزین و ئەمەش لە یادنەکەین کە پێویستە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەو زانیارییانە وەدەست بهێنین کە دەیخوازین.

**سەرچاوە**

کتێبی (بۆ گەنجان).

## تابلۆیەکی نوێی ڤان کوخ لە یادی ١٥٠ ساڵەی لەدایك بوونیدا

**<u>لە عەرەبییەوە: ساکار رەووف</u>**



واچاوەڕوان دەکرێت تابلۆیەکی هونەرمەندی هۆڵەندی فنسنت ڤان کوخ کە وێنای کۆمەڵە جوتیارێك لە کاتی کاکردندا لە مەزرایەکدا دەکات، سێ ملیۆن یۆرۆ بە دەست بهێنێت لە زیادکردنێکدا کە لە فەرەنسا بەڕێوەدەچێ. خاوەنی تابلۆکە دوانزە ساڵ لەمەوبەر لە بازاڕێکی شتومەکی بەکارهێنراودا بەرامبەر ١٥٠٠ یورو ئەم تابلۆیەی کڕیوە. ڕێکخەرانی زیادکردنەکە لە شاری بورتی بچووك لە باشوری خۆرئاوای فەرەنسا خۆیان ئامادەکردووە بۆ پێشوازی کردن لە لێشاوێك لە ئامادەبوان. رێکخەران خەیوەتێکیان بۆ ئەم کارە دابین کردووە کە توانای گرتنەخۆی ٣٠٠ کەسی هەیە کە بێگومان ژمارەی بەشداربوان زیاتر دەبێت لە ژمارەی کورسیەکان کە ٢٥٠ کورسیە. زیادکردنەکە لەسەر چوار شاشەی تەلەفزیۆن پەخش دەکرێت و دە خەتی تەلەفۆنی زیادەش لەگەڵ کۆمەڵێك وەرگێڕ بۆ وەرگرتنی داواکاریەکانی دەرەوە، تەرخان دەکرێت. (ئێریك لوبلیە) بەڕێوەبەری زیادکردنەکە ڕایگەیاند کە زیادکردنەکە بە ملیونێك بۆ ملیۆن

و نیو یوریو ١,٢ تا ١,٨ ملیۆن دۆلار دەست پێدەکات، کە ڕەنگە نرخەکە بگاتە دوو ئەوەندەی ئەم ژمارەیە.

یادی ١٥٠ ساڵەی لەدایك بوونی ڤان کوخ کە ڕێکەوتی ئەمساڵ دەکات بووە هۆی زیاتر بایەخدانی خەڵکی بە کارەکانی. ژیانی هونەرمەندی هۆڵەندی پڕ بووە لە گێروگرفت وە بەهۆی پەشێویەکی دەروونییەوە بەشێك لە گوێچکەی خۆی دەبڕێ، کە ئەمەش جێگای گاڵتەپێکردنی ڕەخنەگران بووە کاتێ هونەرمەند لە ژیاندا بوو، بەڵام کارەکانی لە پاش مردنی ژمارەی پێوانەیی لە زیادکردنەکاندا بەدەست دێنن. ئەو تابلۆیەی کۆمەڵە جووتیارێك وێنادەکات لە کاتی کارکردنیان لە ژێر ئاسمانێکی پڕ هەوردا، سەد ساڵ بە وونبویی مایەوە تا ئەو کاتەی کەسێکی ووردبین تابلۆکەی لە بازاڕێکی شتومەکی بەکارهێنراودا نزیك شاری پاریس بەرچاوکەوت و ئیمزای (فنسنت)ی لە سوچێکی تابلۆکەدا بینی.

ووتوێژ سەبارەت بەوەی تابلۆکە ئەسڵیە یان نا دروست بوو. لوبلیە ڕایگەیاند کە تا ئێستا مۆزەخانەی ڤان کوخ لە ئەمستردام ئەوە رەت دەکاتەوە کە تابلۆکە ئەسڵی بێت، وەلی شارەزایانی تر دەڵێن تابلۆکە ئەسڵیە.

کارگەیەکی زانستی ئیتالی رایگەیاند ڕەنگە زەیتییەکانی لە تابلۆکەدا بەکارهێنراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدە و ڕەنگەکانیش هەمان ئەو ڕەنگانەن کە ڤان کوخ لە کارەکانی تریدا بەکاری هێناوە و ووتیشی ئیمزاکە بەلای کەمیەوە هی سەدەیەك لەمەوبەرە. تاقیکردنەوەیەکی تریش دەریخست کە بۆیەی زەیتی سەر ڕووی تابلۆکە هەمان ئەو بۆیەیە کە ڤان کوخ بۆ وێنەکردنی گوڵ و کێڵگە بەکاری دەهێنا. (بنوا لاندیە)ی شارەزا لە کارەکانی ڤان کوخدا دەڵێ کە ئەو دڵنیایە تابلۆکە ئەسڵیە. لاندیە لوبیە رایگەیاند ئەم تابلۆیە لە ساڵی ١٨٨٣ لە هۆڵەندە نەخشێنراوە و پاش ئەو سەرژمێرییەی کە دوای خۆکوشتنەکەی لە ساڵی ١٨٩٠ بۆ کارەکانی کراوە، ژمارە ٢٧٦ی پێبەخشراوە. پاشان ئەو تابلۆیە لە ساڵی ١٨٩٤ وون بووە تا ئەو کاتەی لە بازاڕێکی شمەکی بەکارهێنراودا دۆزراوەتەوە.

**سەرچاوە**

لە ئەنتەرنێتەوە

*.www. Alarabonlin.com*

## ئەلیکسەندەر پوشکین

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**



*Pushkin A Biography*
*T.J.Binyon*
*Harper Collins – London, 2002*
*P. 731*

ڕەخنەگری ئەمریکایی "ت. ج. بینیون" لەم کتێبە قەوارە گەورەیەیدا، ژیاننامەیەکی نوێی شاعیری مەزنی ڕوسیا "ئەلیکسەندەر پوشکین" دەخاتە بەردەست.

وەکو ئاشکرایە "پوشکین" ساڵی ١٧٩٩ لە شاری مۆسکۆ هاتۆتە دنیاوە و لە تەمەنی منداڵیدا بەشێوەیەکی فەرەنسیانە

پەروەردە کراوە.. بەزۆری سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەدەبی فەرەنسایی بووە، ئەمەش وایکردووە کە هاوڕێکانی قوتابخانەی بە کوڕە (فەرەنسی)یەکە بانگی بکەن! زۆر هۆگری ئەدەبی سەدەی هەژدە بوو، بەتایبەت کتێبەکانی "ڤۆلتێر".

ساڵی ١٨١٦ کاتێك خوێندنی ئامادەیی تەواوکرد، بوو بە فەرمانبەر لە وەزارەتی دەرەوەی ڕوسیا و ئیتر لەو سەردەمەوە تێکەڵ بە ژیانی ئەدەبی و شانۆیی شاری مۆسکۆ بوو.. "پۆشکین" هەر بە تەنها شاعیر نەبوو، بەڵکو لە هەمان کاتدا درامانوس و ڕۆماننوسیش بوو. ڕێبازی کلاسیکی ئەوروپی سەرچاوەی بەرهەمە ئەدەبیەکانی بوو، بەڵام دواتر بەسەر قوتابخانەی ڕۆمانتیکیدا کرایەوە، تا بوو بە یەکەمین شاعیری ڕۆمانتیکی ڕوسیا.

لە شیعرەکانیدا باسی لە چەندین مەسەلە کردووە و توانی لە یەك کاتدا ئەدەبی ڕوسی لە تەقلیدیەت و پاشکۆیایەتی ئەدەبی بیانی قوتار بکات.

نوسەری ئەم کتێبە پێیوایە ئەوە "پۆشکین" بوو کە ڕێگای لەبەردەم هێنانە ئارای ئەدەبێکی نیشتمانی و خۆماڵی ڕوسیدا کردەوە، بەڵام ئەدەبێك کە هەڵگری ڕەهەندێکی گەردونگەرایی و یۆنیڤێرساڵی بێت. ئەمەش مانای وایە کە ئەو بە دامەزرێنەری ئەدەبی ڕوسی دەدرێتە قەڵەم. هەر لەبەر ئەم هۆیەش گەورە ئەدیبانی ڕوسیا ساڵ لە دوای ساڵ بەوپەڕی ڕێزەوە یادی ئەو دەکەنەوە.. لەم بارەیەوە "دیستۆیەڤسکی" وتارێکی بەناوبانگی لەسەر ڕۆڵی گرنگی ئەو پێشکەش کردووە.

لە بواری شیعری لیرکیدا، دەکرێت بڵێین "پۆشکین" توانیویەتی خۆی لەو کۆت و بەندە کلاسیکیانە ڕزگار بکات کە لە سەرەتادا پێی نوسیون.. بەم کارەشی توانی جوانترین شیعرەکانی خۆی بنوسێت، ئەو شیعرانەی ستایشی خۆشەویستی و سۆزداری و فەردانیەت دەکەن و ئاوێتەن بە بەها ئینسانی و گەردونیەکان. لە پاڵ ئەم شیعرانەشیدا شیعری سیاسی و تەنانەت شیعری هەجوشی نوسیوە. هاوکات کۆمەڵێك شیعری میتافیزیکی زۆر قوڵ و ترسناکی نوسیوە کە باس لە ژیان و مردن و نهێنی بوون دەکات.

دەکرێت بڵێین ئاشنایەتیەکی باشی لەگەڵ شیعری فارسی و عەرەبیدا هەبووە و لە نوسینی شیعر و بەرهەمە ئەدەبیەکانی تریدا سودی لێ بینیون. هەروەها ئاگاداری کلتوری یۆنانی و ڕۆمانی و ئەڵبەتە ئەدەبی ئەوروپایش بووە. فراوانی جیهانبینی "پوشکین" و خەسڵەتی یۆنیڤێرسالیانەی ئەدەبی ئەو، لێرە سەرچاوە دەگرێت.

ئەمەش کارێکە کە زیاتر و زۆرتر سەرسامان دەکات و ئەدەبی ئەومان لا سەنگینتر دەکات.

"پوشکین" تەنها سی و هەشت ساڵێك ژیا و لە شمشێربازیەکدا لەسەر خانمێکی جوان و قەشەنگ گیانی لەدەستدا!

بەڵام ئاخۆ ئەمە مردنێك نییە کە شایستەی شاعیرێکی ڕاستەقینە و ڕۆمانتیکی وەکو "ئەلیکسەندەر پوشکین" بێت؟!

## سەرچاوە

پاشکۆی (بیان الکتب)، ژمارە (٢٣٣) بەرواری ٢٠٠٢/١٠/٢١.

## ڕۆمانی "عەتر" چیرۆکی بکوژێك

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد**



کاتێ ڕۆمانی "عەتر"ی باتریك زوسکیند لە ساڵی ١٩٨٥دا کەوتە بازاڕەوە، خوێنەران وایاندەزانی ئەمە ڕۆمانێکی کلاسیکیی نووسەرێکی سەدەی هەژدە یان سەدەی نۆزدەیە، لەبەرئەوەی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە کەشوهەوای سەدەی هەژدەهەمی فەرەنسەدا ڕوودەدەن، ئەو کاتەی فەرەنسە لە نێو ترس و برسێتی و هەژارییەکی بێئاماندا دەژیا و بە دوای سارێژکردنی برینەکانی ئازادی و بەدوای دەرمانێك بۆ ئازارەکانی دەگەڕا، لەو هەلومەرجە بێئامانەدا کەسێکی بلیمەت دەرکەوت، بەڵام کەسێکی کورتە باڵا و چڵکن و ڕوخسار ناشیرین.

ئەم چەشنە وەسفە لە ڕۆمانە کلاسیکییەکاندا پتر باوە، سەرجەمی ڕووداوەکانیش لە فەرەنسەدا ڕوودەدەن و نووسەری ڕۆمانەکەش زۆر بە چاکی شارەزای ئەو وڵاتەیە چونکە ئەم ڕۆماننووسە سەر بە کولتوری فرانکفۆنییە و لە نێوان پاریس و میونیخدا ژیانی بەسەر بردووە، جا بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی ڕۆمانی "عەتر" لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا قەتیس بکات پەنای بردۆتە بەر ژمارەیەك سەرچاوەی مێژوویی و هەروەها سەردانی کێڵگەکانی گوڵ و گوڵزاری لە ناوچەی "گراس"دا کردووە و لە ڕووی زانستیشەوە شارەزایی لە پێکهاتەی عەترەکان پەیداکردووە بەجۆرێ خوێنەر پێی وا دەبێ ڕەنگە بتوانێت، بە پێی ڕێنماییەکانی ناو ڕۆمانەکە، بۆ خۆی جۆرە عەترێکی تایبەتی دروست بکات. ڕۆمانی "عەتر" بۆ پتر لە بیست زمان وەرگێردراوە لەوانە زمانی عەرەبی.

پاتریك زوسکیند لە ٢٦ی مارسی ساڵی ١٩٤٩ لە شاری ئیمباخی ئەڵمانی لە کەناری دەریاچەی شتارنبۆرگ لەدایك بووە، باوکی ڕۆژنامەنووس بووە و ئەمەش کاریگەریی لەسەر پاتریك هەبووە کە لە تەمەنێکی زوودا مەیلی نووسینی هەبێت، لە دوای تەواوکردنی ناوەندی لە بەشی مێژوو لە زانکۆی میونیخ وەرگیراوەو لە ساڵی ١٩٧٤دا تەواوی کردووە، دواتر دەستی کردووە بە نووسینی سیناریۆی سینەمایی، پاتریك تەنها لە ساڵی ١٩٨١دا وەکو نووسەرێك ناوبانگی دەرکرد لە میانی بڵاوکردنەوەی شانۆنامەی "کونتراباس ژەن" کە شانۆنامەیەکی درامییە و لە زۆربەی شانۆنامەکانی ئەڵمانیا و وڵاتانی دیکەی ئەوروپادا نمایش کراوە. لە ساڵی ١٩٨٥دا ڕۆمانی "عەتر"ی بڵاوکردەوە و ئیدی زۆر بەخێرایی ناوی بڵاوبۆوەو وەکو ڕۆماننووسێك و وەکو نووسەری زنجیرەی تەلەفیزیۆنی ناسرا، لە ساڵی ١٩٨٧یشدا پاداشتی گۆتنبێرگی وەرگرت.

ڕۆمانی "عەتر – چیرۆکی بکوژێك" بە دیمەنێکی دراماتیکی سەرنجڕاکێش دەست پێدەکات کە لە یەکێ لە گەڕەکە میللییەکانی پاریسدا بۆنێکی ناخۆش بڵاودەبێتەوە و لەوێدا ژنێکی ماسی فرۆش منداڵێکی دەبێ ڕوخسار و بۆنی ئەو منداڵە تێکەڵ بە بۆنی گۆشت و ماسییەکانی ئەو شوێنە دەبێت، ئەمە لە ڕۆژی ١٧ی یولیۆی ساڵی

١٧٣٨دا و لە یەکێ لە گەرمترین ڕۆژەکانی ساڵدا ڕوویدا. لە دوای منداڵبوون ژنەکە بە دەستی کەسێك کوژرا لەبەرئەوەی کۆرپەکەی لە ژێر عەرەبانەی ماسییەکاندا فڕێدا. بەمجۆرە ئەم منداڵە "جان پاتیست گرنوی" بەبێ دایك مایەوە کە لە بنەڕەتدا باوکی نەناسراو بوو، لە خانەی هەتیواندا بەخێوکراو کەسێکی ناشیرین و کورتە باڵای لێدەرچوو بەڵام بەهرەیەکی گەورە تیادا چەکەرەی کرد چونکە لوتێکی عەجایبی هەبوو و بۆنی هەموو شتێکی دەکرد و هەر بە لووت و بە بۆنکردن کەسەکانی دەناسییەوە و سیفاتە ئەخلاقییەکانی خەڵکیی دەستنیشان دەکرد. لووتی گرنوی ڕێنیشاندەرێکی گرنگی ئەو بوو کە بەرەو جیهانێکی فراوانی برد و ڕۆژانە سەدان هەزار بۆنی دەپشکنی و لەیەکدیی جودا دەکردنەوەو هەر بە بۆن دەیزانی فلان کەس پیاوێکی باشە و ئەویدیکە کەسێکی دڕندە یان نیازخراپە و ئەم نەمرە و ئەو نەخۆشە و ئەم بۆنە پیاو ماقوڵانەیە و ئەو بۆنەی دی ژنانەیە و لێرەوە بۆی دەرکەوت کە چاکە چەشناو چەشنە هەروەکو خراپەش جۆر و پلەی جیاوازی هەیە.

لە سەرەتادا گرنوی لە دەباخانەی پێستی ئاژەڵاندا لەلای مستەر گریمالدا کاری دەکرد، دەباخانەکە شوێنێکی پیس و بۆنێکی خنکێنەری هەبوو و گرنوی لەوێدا بۆی دەرکەوت بۆنە ناخۆشەکان پلەی جۆراوجۆریان هەیە، بە تایبەتی ئەو کاتەی پێستەکەیان دادەماڵی و بۆگەنێکی زۆر ناخۆش لووتی گرنوی پڕ دەکرد. گرنوی لە ڕێکەوتێکدا مستەر بالدینی ناسی کە یەکێکە لە پیاوە هەرە ناودارەکانی جیهانی عەتر لە پاریس، بالدینی بایەخ و گرنگیی لووتی ئەو کوڕە ناشیرین و کورتە باڵایەی دەزانی، ئیدی زەوتی دەکات و لەلای خۆی کاری پێدەکات تا عەتری جۆراوجۆری پێ دروست بکات و پێشکەشی پاشا و میرەکانی ئەورووپای بکات، بەهۆی گرنوی بالدینی بوو بە گرنگترین دروستکەری عەتر لە دنیادا، بەڵام ئەو گەنجینە بەنرخەی (واتە گرنوی) بە نهێنی هێشتەوە و نەیدەهێشت هیچ کەسێ گرنوی لە کارگە بچووکەکەیدا ببینێ و ئاگاداری بلیمەتییەکەی بێت، ڕۆژێکیان گرنوی دوچاری نەخۆشییەکی کوشندەبوو و لە مردن نزیك بووەوە، بالدینی ترسی لێ نیشت و بەپەلە وەرەقە و قەڵەمێکی هێنا تا گرنوی نهێنیی هەندێ لە پێکهاتەی عەترەکانی بۆ بنووسێت، بە تایبەتی عەتری "ئەوین و ژیان" و "ئێوارەی پاریس" و "شەوی عاشقان"، بەڵام گرنوی داواکەی بالدینی ڕەتکردەوە و بڕیاریدا بۆ یەکجاری پاریس جێبهێڵێ و بە پێ بەرەو شاری گراس بچێت کە بە گوڵ و عەتری جۆراوجۆر ناسراوە.

گرنوی لەو گەشتەدا ژیانێکی سەرەتایی دەژیا و گۆشتی کاڵی دەخوارد و هەر بە بۆن ڕێگاکانی دەناسییەوە و درکی بەوە کردبوو کە ژیان بۆنێکە بەرەو ئامانجێکی گەورەی دەبات، ئامانجی گەورەی ئەم کوڕیژگەیە بریتی بوو لەوەی ببێت بە خاوەنی بۆنی شتەکان بەتایبەتی ئەو شتانەی خۆشی دەوێن، هەر لە سەرەتاشەوە دوای بۆنی کچێك کەوتبوو لە کەناری ڕووباری سین و لەوێدا کچەکەی دۆزییەوە و دەستی خستە بینەقاقای و خنکاندی و پاشان دەستی کرد بە بۆنکردنی کچە مردووەکە تا بە تەواوی مەست بوو، ئەو بۆنەی بۆ هەتایە لە یادەوەریدا خەزن کرد، ئەوەتا

ئێستاش دوای ئەوەی گەیشتە مونبیلییە خۆی بۆ تاوانێکی تر ئامادە دەکات و دەیەوێ کچێکی تر بکوژێت و پاشان قژی ببڕێت و جلەکانی ببات و بۆنی قژ و جلەکانی بکات، قوربانییەکی تری دەستی گرنوی کچێکی ئێجگار جوان بوو لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو و کچی پیاوێکی دارتاش بوو، بەمجۆرە لە نێوانی چەند ڕۆژ جارێکدا کچێك دەکوژرا و ترسێکی گەورە سەرانسەری شاری گرتەوە بێئەوەی هیچ کەسێ بزانێ بکوژەکە کێیە چونکە گرنوی هەندێ عەتری تێکەڵ دەکرد و کاتێ بە بازاڕدا تێدەپەڕی سۆزی خەڵکیی ڕادەکێشا و هەندێ عەتری دی خۆشەویستی و لێبوردەییان دەوروژاند و هەندێجاریش عەتری وەهای لە خۆی دەدا کە بڕوایی و متمانەی ئەویان لەلای خەڵکی زیاتر دەکرد.

ئەنتوان ریچی ڕاوێژکار لە شاری گراس تێدەگات کە ئەم مەترسییە دەشێت کچە تاقانە هەرە جوانەکەی - لورا-ش بگرێتەوە بۆیە لەگەڵ کچەکەیدا بۆ شوێنێکی دووری دەرەوەی شار دەڕۆن، بەڵام گرنوی توانی بە بۆن شوێنیان بکەوێت و بیاندۆزێتەوە و پاشان عەتری چاکە و دڵنیایی لە خۆی دەدا و دواتر دەتوانێ کچەکە بکوژێت و قژی ببڕێت و جلەکانی ببات و تێر تێر بۆنیان بکات.

کاتێکیش پۆلیس گرنویان دەستگیر کرد، لە ماڵەکەیدا قژ و جلوبەرگی بیست و چوار کچی هەرزەکاریان دۆزییەوە کە گرنوی کوشتبوونی و ئەو شتانەی لە ژوورێکی پیس و پەڕپوتدا هەڵگرتبوو و بەردەوام بۆنی دەکردن. هۆی ئاشکرابوونەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پرسیاری کردبوو ئاخۆ ئەنتوان ریچی و کچەکەی بەکام ڕێگادا ڕۆیشتوون، بەمجۆرە پۆلیس چاودێرییان خستە سەری و بە بەڵگەوە تاوانەکانی ئەویان ئاشکرا کرد.

### سەرچاوە

لە ئینتەرنێتەوە، بیان الکتب، ژمارە (٢٣٧).